کەریمی حسامی

# لە بیرەوەرییەکانم

بەرگی شەشەم

ستۆکهۆڵم - ۱۹۹۳

لە بیرەوەرییەکانم

چاپی یەکەم

پێداچنین و مۆنتاژ: ناسری ئیبراهیمی

سوێد-١٩٩٣

# پێش‌بار

بۆ چی ئەم چەند لاپەڕە پێشەکیەی بەرگی شەشی بیرەوەریەکانم ناو ناوە پێش‌بار؟

بە بۆچوونی خۆم ئەم بەشەی بیرەوەریەکانم بارێکی قورس‌و گرانن لەسەر لاپەڕەکانی مێژووی بزووتنەوەی رزگاریخوازی کورد لەم بەشە کوردستانەدا کە کەوتۆتە بەر دەسەلاتی حکومەتی فارس‌و بە کوردستانی ئێران ناسراوە. بارێکی قورس‌و گرانیشن کەوتوونە سەر شانی میللەتەکەمان لەم بەشەی نیشتماندا. باسی کارەساتی گەلێک دڵتەزێن‌و خەفەتبارن وەک: شەڕی نەغەدە، کوشتاری خەڵکی قارنێ‌و قەلاتان‌و سۆفیان‌و کولیچ‌و ئیندرقاش‌و کورەخانەی ساروقامیش‌و قەرەگۆل‌و حەلب‌و کۆزیک و ئیعدامی بە کۆمەڵی لاوانی مەهابادو گەلێک کارەساتی‌تر کە کەوتوونە نێو ئەم بەشەو دەکەونە نێو بەشی حەوتەمی بیرەوەریەکانیشم. باسی رووداوی گرنگی سیاسی‌و دەست نیشان کردنی گەلێک بەسەر هاتی دوای راپەڕینی گەلانی ئێران‌و هاتنە سەر کاری رژێمی کۆنەپەرست‌و چنگ بەخوێنی مەلایان. کەواتە‌و بارێکی قورس‌و گرانیشە لەسەر شانی نووسەر کە قەڵەمەکەی لە رێگای راست‌و نووسینەوەی بابەتیی رووداوەکان لاتەدار چۆنی دیتوەو چۆن بەشداری کردووە ئاوای بێنێتە سەر کاغەزو بۆ خوێنەری ئێستاو بۆ وەچەی دوارۆژ تۆماریان بکا.

بە قەولی نووسەری بەناوبانگی تورک (کە هێندێ کەس بە کوردی دەزانن) یاشار کەمال: «نووسینی بیرەوەری ئەدەب نیە. گێڕانەوەی رووداو بەسەر هاتە». راست دەکا نووسینی بیرەوەری هیچ شتێکی

داهێنان‌و خولْقانی ئەدەبی تێدا نیە. باسی هێندێ بەسەر هاتە لە جیاتی ئەوەی بە زمان بۆ خەڵکی بگێڕیەوە، دەیهێنیە سەر کاغەزو خەڵک دەیخوێنێتەوە لە مێژوش‌دا تۆمار دەکرێ.

لەکاتی نووسینەوەی ئەم بەشەی بیرەوەریەکانم‌دا تووشی نوسراوەیەکی سیاسەتمەداری ئێرانی (دوکتور عەلی ئەمینی) هاتم کە لەسەرەتای دەست‌پێکی نووسینی بیرەوەریەکانی‌دا دەنووسێ: «ئەو کەسەی بیرەوەریەکانی دەنووسێ، دەبێ وڵامی ئەم پرسیارانە بداتەوە: (من کێم؟ لە کوێوە هاتومە دنیا؟ چ ڕووداوێکم دیوە؟ لەچەندو لە چ ڕووداوێک‌دا بەشداریم کردووە؟ ئەو ڕووداوانەم چۆن دیون؟ چۆن بەشداریم تێدا کردوون؟ بۆچی بەشداریم کردووە؟)» واتە نووسەری بیرەوەری‌و سەربردەی شەخسی باسی ئەم ڕووداوانە دەکا کە خۆی بەشداریان بووەو ژیانی خۆی دەگێڕێتەوە. من پێم وایە لەبەرگی یەکەمی بیرەوەریەکانمەوە تا ئێستا ئەم ڕێبازەم گرتۆتە پێش، بەڵام ئێستاش هێندێ کەسی خوێندەواری کورد لای وایە نووسەری بیرەوەری نابێ باسی خۆی بکاو سەربردەو شێوە بۆچوون‌و چەندو چۆنی بەشداری خۆی بنووسێتەوە. گۆیا ئەوە (خۆهەڵکێشان‌و یا بەزەق نیشاندانی دەوری خۆیەتی)!!

مەبەست لە نووسینی ئەم پێشبارە دوو شت بوو:

یەکەم- ئەم بەشەی بیرەوەریەکانم قۆناخێکی گەلێک پڕلە ڕووداو کارەساتی خەباتی گەلەکەمان نیشان دەدا. لەم قۆناخەدا، یا ڕوون‌تر بڵێم لە مەودای ڕووداوەکانی دوای شۆڕشی گەلانی ئێران لە کوردستان‌و لە نێو حیزبی دیموکراتی کوردستاندا زۆر کەسی‌تر بەشداریان کردووە، فیداکاریان کردووە، ئازایەتیان نواندوە. دیارە کەسانی خوێڕی و ڕەزیل‌و خۆبەدەستەوە دەریش هەبوون. زۆر کەسیش هەر بۆ بازرگانی خۆیان خزاندبوە نێو بزوتنەوەو دەستی خۆشیان وەشاندوە. هەزاران لاوی فیداکار لە ڕێگای ئازادی‌دا گیانی خۆیان بەخت کردوە. هەزاران خاوو خێزان ماڵوێران‌و

ئاوارەو دەربەدەر بوون. شەری سێمانگە دەستی زۆر کەسی بەزاخا کرد. زۆر کەس دوای شەری سێمانگە خۆیان خزاندە نێو ریزی حیزبی دیمۆکرات بەو هیوایە سبەی دەبنە فەرمانبەرو کاربەدەستی گەورەی حکومەتی خودموختاری کوردستان.

ئەگەر ئەو کەسانەی بەشداری ئەم قۆناخەی خەباتی کوردستانی ئێراتیان کردوە، هەر کەس بە گوێرەی تواناو بەنۆرەی خۆی بیرەوەری‌و دیتنی بەسەرهاتەکان بنووسێتەوە، گەنجینەیەکی پر بایەخ‌و بەنرخ کۆدەبێتەوەو کەلێنێکی گەورە لە مێژووی خەباتی خوێناوی میللەتەکەمان پر دەکاتەوە. من تەنیا باسی ئەو شتانەم کردووە کە پێوەندیان بەخۆمەوە هەبووەو بەشداریان بووم. رەنگە زۆر شتم لە بیر نەمابێ، یا تاریخ‌و رۆژی رووداوەکان پاش‌و پێش کەوتبن، یا کەم وکوری لە چاپکردنی بەڵگەکاندا هەبێ. ئەوەش دەگەرێتەوە سەر دووری سەنەدو بەڵگەکان کە لە وڵات بەجێماون‌و بەداخەوە دەستم پێیان رانەگەیشتوە. ئەوندە هەیە هەرچی باسم کردووە، ئەوەندەی هێندێ نووسراوەو بیرو هۆشی خۆم یاریدەیان دابێ بەراستی‌و بە بێ بۆچوون‌و مەبەستی تایبەتی هێناومنە سەر کاغەزو وا لەبەر دەستی خوێندەوارانی کورد دایە. خۆ ئەگەر دۆستەو برادەری بەشدارانی بزوتنەوەی ئەو قۆناخە هەڵەو کەم و کوریەکانم بۆ راست کەنەوە؟ ئەوە بەرگی حەوتی بیرەوەریەکانمی پێدەوڵەمەند دەبێ‌و سوپاسیان دەکەم.

دووەم- بە پێویستم زانی بە ناچاری وەڵامی هێندێ ئەو برادەرانە بدەمەوە کە بە نامەو نووسراوە یا لە ئاخافتندا یا لە وردە حیکایەتی پاش ملەدا رایان گەیاندووەو دەڵێن: دوادبارە دوای شەهید بوونی دوکتور قاسملو بیرەوەریەکانت کە بەشێکی فرە گرنگن لە مێژووی خەباتی حیزبی دیمۆکراتو بزوتنەوەی رزگاریخوازی کوردو بە تایبەت بۆ بەرەی تازە پێگەیشتووی نەتەوەکمان‌و وەچەی داهاتووش کەڵکیان هەیە، کەم‌و

کوریی‌یان دێتە ناوو ناتەوێ هەموو شت بنووسی».

ئەو برادەرانە سەرەرای ئەوەی کە لە پێشەکی بەرگی پێنجەمدا رونم کردۆتەوە، بەر لەوەش بیرەوەریەکانم بخوێننەوە بەڵام دیسان «سەبارەت بە دڵسۆزی بۆ بیرەوەریەکانی منو بەرژەوەندی بزوتنەوەی کورد» رەخنە دەگرن کە بۆچی باسی دوکتور قاسملو ناکەم. لەوەش بێ‌تام‌تر گۆیا بۆچی لە وتاری خۆمدا چاپکراو لە رۆژنامەی سەردەمی نوێ، دوکتور قاسملو-م بە زاناو سیاسەتمەدارو هەڵکەوتووی میللەتی کورد ناساندوە! وەک خودا نەخواستە درۆم کردبێ یا کارێکی ناحەز یا وانەبێ.

من لام وایە ئەم کەسانە بەراستی و بە قوڵی نەچوونە نێو ناو ناخنو نیوەرۆکو رەوەندی مێژوویی‌و گشتی جوڵانەوەی رزگاریخوازی کورد. تەنیا شتی شەخسی‌و بەرژەوەندی تایبەتی‌و قینی دڵشکاندنو وردە ناتەواری دەکەنە نمونەی تێکۆشانو بزوتنەوە. بێ ئەوەی هەموو لایەنو دەوروبەرو هەڵو مەرجی بزوتنەوە هەڵسەنگێننو کردەوەو سیاسەتی هەموو ئەو کەسو دەستەو تاقمانەی نێو بزوتنەوەی کوردستانی ئێران لە سەرەدو بێژنگی ویژدانو ئینساف بدەن کردوویانەتە بنێشتە خۆشکەو هەموو کاسەو گۆزەی کەمو کوریی‌و سەرنەکەوتنی جوڵانەوە دەسەری دوکتور قاسملو دا دەشکێنن. بەداخەوە خەنجەر لە تەرمی شەهیدێک دەدەن کە بە دەستی دوژمنانی سەرەکی میللەتی کوردو بە فیتی کۆنەپەرستترین . رژێمی سەردەم شەهید کراوە. لە سیاسەتدا تێکەڵ کردنی غەرەزو قینی شەخسی لەگەڵ بەرژەوەندی گشتی بزوتنەوە، دەردێکی گرانو خەتایەکی نەبەخشراوە کە بەداخەوە یەکێک لە کاراکتێرو رەوشتەکانی جێگای رەخنەی دوکتور قاسملوی شەهیدیش هەر ئەوە بوو. برادەرانی کە ئێستا ئەم رەوشتەیان گرتۆتە پێش، وادیارە لەماوەی هاوکاری لەگەڵ دوکتور قاسملودا، هەر ئەوەندەی لێ‌فێربوون .

من ئەگەر لە وتارو لە بۆچوونی خۆمدا زۆر کەمتر لە پێویست باسی

زانایی‌و کەسایەتی سیاسی دوکتور قاسملوم کردوە، هەر لە نووسینی خۆشمدا هێندێ ڕەوشت‌و شێوە بۆچوون‌و خەسڵەتی دیکتاتۆری شەهیدی ناوبراوم وەپاش نەداوە. سەرەڕای هەمووی ئەوانە یەکجار بەداخ‌و کەسەریش بووم کە شەخسیەتێکی ناوا زاناو سیاسەتمەداری کورد وا بە فیرۆیی بە دەستی دوژمنانی کورد شەهید دەبێ‌و خەسارێکی لە ڕادەبەدەرو لە قەرەبوو نەهاتوو، وەبزووتنەوەی ڕزگاریخوازی کورد دەکەوێ.

من لە بیرەوەریەکانمدا باسی مەسەلەی شەخسی‌و ڕەوشت‌و کاراکتێری تایبەتی ئەفراد ناکەم. بەڵام ئەوەی پێوەندی بە کاروباری سیاسیەوە هەبێ‌و لکا بێ بە بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی‌و بە تێکۆشانی حیزبی دیموکرات، مەگەر لە بیرم چووبێ دەنا هیچ شتێکم پاش گوێ نەداوەو بەسەریدا تێناپەڕم. خوێنەرانی بەڕێزی کوردو بەرەی دوا ڕۆژی میللەتەکەمان لێی دەکۆڵنەوەو شی دەکەنەوەو قەزاوەتی لەسەر دەکەن.

کەریمی حیسامی

# گەرانەوە بۆ سۆفیا

لە بەرگی پینجی بیرەوەریەکانم بە دریژی باسی ئەو بریارە نارەوایەم کرد کە پینج کەس لە ئەندامانی کومیتەی ناوەندی لە بارەی هەلپەسیرانم بۆ ماوەی سالیک دایانبوو. دووای ئەم بریارە رۆژی ١٩٧٨/١١/٢٨ لە بەغدا سواری فرۆکە بووم و هاتمەوە سوفیا. کاک بهاالدین نوری ئەودەم لە سوفیا بوو. رۆژی ٧٨/١٢/٢ هاتە لام. باسی وەزعی عیراق و تیکۆشانی حیزبی دیمۆکراتمان کرد. من باسی بریاری کۆمیتەی ناوەندیم بۆ گیراوە. ئەو لەسەر ئەم باوەرە بوو کە نابێ بۆ بریاری نابەجێ و چەوت پیاو مل راکیشێ.

رۆژی٧٨/١٢/٣ کاک سەلاح بدرالدین هاتە سوفیا. دوای هیندی باس و گفتگۆ، کاک سەلاح پیشنیاری کرد کە حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئیران و حیزبی کاک سەلاح و برادەرانی کوردستانی تورکیا (د.د.قەدە) کە حیزبی کریکارانی کوردستانی تورکیایان پیک هیناوە بەرەیەک دابمەزرینن. لە وەلامدا گوتم: فکرێکی خراپ نیە. هاوکاری نیوان حیزبە کوردستانیەکان کارێکی پیرۆز و پیویستە. بەلام کارێکی هاسان نیە. سێ حیزبی کوردی، هەر یەکە لە ولاتیک و بە پرۆگرامیکی تایبەتی خۆیانەوە بەرە پیک بینن، پیویستی بە بیرکردنەوە و ئامادە کردنی هەلو مەرج هەیە. بە تایبەت مەسەلەیەکی ئاوا دەبێ لەگەل کومیتەی ناوەندی ح.د.ک.ا. باس بکرێ. پیویستە لە پیشدا نوینەری

ئەو حیزبانە پێکەوە دانیشن لە سیاسەت‌و بۆچوونی یەکتر تێبگەن‌و پێوەندی سەرەتایی دامەزرێنن. نازانم قسەکانی من چەندە بە دڵی کاک سەلاح بوون، بەڵام ڕۆژی ٧٨/١٢/٦ سەفەری کرد.

ڕۆژی ٧٨/١٢/٨ بە بۆنەی ئازادی غەنی بلوریانەوە تێلگرافێکم نارد بۆ مەهاباد. لەم سەرو بەندەدا کاک عەزیز محەممەد هاتە سوفیا. شەوی ٧٨/١٢/١٦ لە هۆتێل ریلا تا نیوەشەو لە خزمەتی دابووم. گەلێکمان باسی وەزعی ئێران‌و عیراق کرد. من لەسەر ئەو باوەڕە بووم کە بەبێ ڕاوەستان بگەڕێمەوە بۆ ئێران. کاک عەزیز وای پێ باش بوو کە پەلە نەکەم، بحەسێمەوە، چاوەڕوان بم تا کاک حەمەدەمینی سیراجی خەبەرم بۆ دەنێرێ.

ڕۆژی ٧٨/١٢/٢٠ بە نیازی کڕینی ماشێن چوومە بەرلین. لە فڕۆکەخانەی سوفیا بە پاسپۆرتی یەمەنی دیموکراتی دەرچوو بووم. بەڵام کۆنە پاسپۆرتێکی ساختەی ئێرانیشم هەبوو کە پێی دەچوومە بەرلینی ڕۆژئاوا. ئەو دەم پاسپۆرتی ئێرانی زەمانی(ڕەحمەتیەکەی) پێویستی بە ڤیزا نەبوو. لە فڕۆکەخانەی بەرلین پاسپۆرتی ئێرانیم نیشان‌دا. پاش ڕاگرتنێکی زۆرو دەستاو دەست کردن‌و وەبەر ماشێن‌دان، گوتیان پاسپۆرتەکەت تەواو نیە، مۆری هاتنە دەری سوفیای پێوە نیە. هەرچەندی من گوتم نە لێم حالی بوون‌و نە گوێ‌یان دامێ. بردیانمە ژوورێک‌و دەرگایان لەسەر پێوەدام.

کتێبی برژنێف بەناوی(زەوی بچوک) تازە چاپ کرابوو. پێم بوو دەمخوێندەوە. نیوەڕۆکی کتێبەکە شاکاری هونەری بەرگری‌و قارەمانەتی بوو. سرنجی ڕاکێشام‌و وێستم بیکەم بە کوردی. هەر لەو ژوورە دەفتەرو قەلەمم دەست دایەو دەستم کرد بە وەرگێڕان. پتر لە سەعاتێک لەوێ دابووم کەس نەهات. ناچار هاتمە دەرو کردم بە هەرا. گوتم یەکێک بێ زمانی روسی بزانێ. پۆلیسێکی گەنجی مندالکارەیان بانگ کرد، دەتگوت

بە زۆری رووسی پێ دەڵێن. هەر چۆنێک بوو تێمگەیاند کە ئەفسەری پۆلیسی فرۆکەخانەم گەرەکە. کابرا رۆیشت و دوای نیوسەعات لەگەڵ ئەفسەرێک گەرایەوە. گوتم بۆچی منتان راگرتوە؟ گوتی: تۆ لە سوڤیاوە هاتووی، پاسپۆرتەکەت مۆری هاتنە دەری پێوە نیە، بێجگە لەوە پاسپورتەکەت ساختەیەو تەواو نیە.

گوتم: راستە من بە پاسپۆرتێکی دیکە لە فرۆکەخانەی سوڤیاوە سوار بووم. ئەو پاسپورتەش ساختەیە. من ئەندامی حیزبێکی کوردیم کە لە ئێراندا دژی حکومەتی شا خەبات دەکا. بە مانی خۆمی دەزانم کە بۆ کارو باری تێکۆشانی سیاسی لە هەموو دەرەتانێک کەلک وەربگرم. من دەچمە رۆژئاوا ترانزیتم پاسپۆرتی ئێرانی بۆ ئەو بەر ویزای ناوێ. جگە لەوە ئێستا لە ئێران دژی رژێمی شا خەباتی گشتی دەست پێکراوە، ئێوە لێرە لە سەر پاسپورتی ساختەی ئێرانی من رادەگرن. پاشان پاسپورتەکەی بەمەنیم هێنا دەرو گوتم: ئەوەیان ساختە نیە. بەڵام ئەوانە هیچیان ناوی خۆم نین. ناوی راستەقینەی من فلان کەسە.

هەر تک پاسپورتی لێوەرگرتم‌و رۆیشت. زۆری پێنەچوو گەرایەوە، بانگی کردم لە ژوورێک پاسپورتەکانی ویندامەوە. شەو چوومە برلینی رۆژئاواو میوانی وسینی شیلازەر بووم.

کۆمەڵەی خوێندکارانی کورد لقی برلینی رۆژئاوا، رۆژی ٧٨/١٢/٢٢ سیمیناریکی پێک هێنابوو، داوایان لێکردم کە بەشداری بکەم. برادەرێکی کوردی سوریە بە ناوی مستەفا کەمال عەلی بەدرێژی لە سەر مێژووی پێکهاتنی کۆمەڵەی خوێندکاران‌و کونگرەکانی‌و گۆرانی رێبازو ناکۆکی‌و هەڵەو لەت بوونی کۆمەڵە قسەی کردو گوتی: «کوردەکانی عیراق کۆمەڵەی خوێندکارانیان دەوڵەت کردوەو شوێنەواری کوردستانی‌یان پێوە نەهێشتوە. کردوویانە بە حیزب، سەردەمێک لە کۆمەڵەدا کەس نەیدەوێرا دژی رژێمی شای ئێران قسە بکات. جەماعەتی

پارتی بیون بە پارێزەری رژێمی شا لە کۆمەڵەدا » پاشان لە نێوان یەک دوو کوردی عیراقی‌و سوری‌و تورکی‌و ئێرانی بوو بە دمە تەقەو پەلاماردانی پارتی‌و یەکێتی نیشتمانی. سیمینارەکە بوو بە باسی بارزانی‌و جەلالی. بەرێوەبەرانی سیمینار بۆ هێدی کردنەوەی باسەکە داوایان لەمن کرد کە وەدەنگ بێم. لەسەر دەوری خوێندکاران لە دەرەوەی وڵات‌و گرنگی یەکێتی‌و کوردستانی بوونی کۆمەڵەی خوێندکارانی کوردو خۆنەبەستنەوە بە سیاسەتی حیزبەکانەوە قسەم کرد. بەگەرمی لە وتارەکەم پێشوازی کراو کێشەو هەرایەکەش دامرکایەوە. رۆژی دوایی بە یارمەتی حوسێنی شپلازەر ماشێنێکی فولکس واگن-م کری‌و رۆژی ٧٨/١٢/٢٩ بەرەو سۆفیا کەوتمە رێ. شەوێک لە ئوتریش مامەوە، رۆژی دوایی لە چیاکانی ئوتریش رێگام هەتڵە کردو پاش سورانەوەیەکی زۆر شەو گەیشتمە زاگرێب لە یوگسلاڤیا.

رۆژی ٧٨/١٢/٣١ سەعاتی حەوتی ئێوارێ گەیشتمەوە سوفیا. شەوی سەری ساڵی تازە بوو لە ماڵێ دەزگایەکی باش سازکرابوو. پرسیاری کاک حەسەنی قزلجیم کرد کە بۆچی دیار نیە. گوتیان قەرار بووە لەگەڵ فارسەکانی جیرانی شەو پێکەوە بن. تەلیفۆنم بۆکرد لە ماڵێ بوو. گورج سوار بوومو چووم، بە تاقی تەنێ لە ژورەکەی خۆی دانیشتبوو. کە چاوی بەمن کەوت گەشکە بوو گوتی: «دەوەرەوە پیاو ئەم بلۆکەی ئێمە گیان لەبەری تیدا نەماوە». جا کاک حەسەن بێ‌و لە کاتی ئاوادا وەقسە بێ. ماڵی فارسەکانی جیرانی کە هاوکارو هاو ئەندامی حیزبیشی بوون لێک کۆببوونەوەو کاک حەسەن بە تەنیا مابۆوە. هەستاین چووینە ماڵی ئێمەو ساڵی ١٩٧٨مان  بە قسەی خۆشی کاک حەسەن‌و باسی رۆژگار بەرێ کرد.

١٩٧٩/١/١٩ برادەرێکی حیزبی کۆمۆنیستی عیراق هاتە سوڤیا باسی باروودۆخی شپرزەی حیزبی کۆمۆنیست‌و ئاکاری فاشیستیانەی

حکومەتی بەعسی کرد. رۆژی ٧٩/١/٣٠ چاوم بە جێگری بەرپرسی پەیوەندیەکانی دەرەوەی حیزبی کۆمۆنیستی بولغارستان کەوت. داوام لێکرد کە رێگا بدەن مامۆستا هێمن بۆ مانگێک بۆ موعالیجەو حەسانەوە بێتە سوفیاو میوانی ئەوان بێ. کابرا وەک پیاوان قبوڵی کرد. گوتی: بۆ مانگی یونی لە رێگای یەکیتی نووسەرانەوە بانگی دەکەین بێتە ئێرە. بەداخەوە نەیتوانی ئەو سەفەرە بکاو بۆچەرمەسەری و بەرەو روو بوونی هەڵوێستی نائینسانانەی هاڤالاتی نیوەڕێگا گەڕایەوە بۆ ولات. ١٩٧٩/٢/٤ خوێندکارە کوردەکانی دانیشتوی شاری بلۆڤدیف داوەتیان کردم کە بۆ باسێک لە سەر وەزعی کوردستان و ئێران بچمە لایان. شەو و رۆژێکی گەلێک دۆستانەو خۆشمان رابوارد.

# سەفەر بۆ ئەڵمان

ڕۆژی ٧٩/٢/٧ کاک سەلاح بەدرالدین تێلگرافێکی بۆ ناردم کە گێرنەبم بچمە برلین. پێم سەیر بوو، نە ئادرسی هەبوو نە تەلیفون کە بزانم چی دەوری و بۆچی بچم؟ ئاخرەکەی بڕیارمدا ڕۆژی ٧٩/٢/١٠. چوومە برلین و کاک سەلاحم دیتەوە. گوتی: نوێنەرێکی فەتح (ڕێکخراوی ڕزگاریخوازی فەلەستین) لێرەیە دەیەوێ چاوی پێت بکەوێ. هەروەها برادەرێکی حیزبی کرێکاری کوردستانی تورکیاش (د.د.قەدە) لێرەیە دەیەوێ یەکتر ببینن. چوومە برلینی ڕۆژهەلات چاوم بە (ئەبو هشام) کەوت کە بە ناوی ڕێکخراوی فەتح قسەی دەکرد. پێشنیاری کرد کە لە نێوان حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران و ڕێکخراوی ڕزگاریخوازی فەلەستین هاوکاری دابمەزرێت. گوتی: ئێمە دەتوانین کادری پارتیزانیتان بۆ پەروەردە بکەین. لە وڵامدا گوتم: بەمزوانە دەگەڕێمەوە بۆ وڵات و پێشنیاری ئێوە لەگەڵ کومیتەی ناوەندی باس دەکەم. تەلیفون و ئادرسی منی وەرگرت و تەلیفونی خۆی لە بێروت دامێ.

پاشان برادەری د.د.قەدە-م بە ناوی شێخ موس چاو پێکەوت. لەسەر وەزعی کوردستان و شێوەی هاوکاری باسمان کرد. ناوبراو گوتی: لە دیاربەکر و ئەستەنبوڵ گۆڤاری ئێمە بەناوی (دەنگی لاوانی دیموکراتی شۆڕشگێر) دەردەچێ. بەڵێنیدا بۆم بنێرێ، بەلام ئێستاش چاوم پێ نەکەوت. کاک سەلاح پێشنیاری کرد کە لە بێروت با گۆڤارێکی مانگانە

بە زمانی عەرەبی دەر بکەین وتارەکانی بۆ باسی مەسەلەی کورد بە گشتی تەرخان بکرێ. پێشنیارێکی باش بوو، بەڵام من لەسەر سەفەر بووم بۆ ئێران. دەبوایە بریاری ئاخری بۆ پەسەند کردنی ئەم پێشنیارە لە لایەن کومیتەی ناوەندیەوە بدرێ.

وەک لە بیرم بێ کاک (رۆژ)، کوری کاک نوری‌شاویسی رەحمەتی لەم هوتیلە دەژیا کە من لێی میوان بووم. رۆژێک (رۆژ) گوتی: (باوکم خەبەری زانیوە کە تۆ لێرەی، دەیەوی بە تەلیفون قسەت لەگەڵ بکا. وەعدەی دانابوو کە بچمە ژوورەکەی ئەو لەگەڵ باوکی بدوێم. ئەو دەم کاک نوری لە لەندەن بوو، پاش سلاو‌و چاک‌و چۆنی گوتی: «داوامان ئەوەیە چاومان پێت بکەوی. بەتایبەت کاک مەسعود گەلێک موشتاقە بدبینێ. رۆژی لێک نیزیک بوونەوەیە». پێم گوت: من ئێستا لەسەر سەفەرم، جگە لەوە بۆماوەی سالێک لە ئەندامەتی کومیتەی ناوەندی هەلپەسێراوم. چاو پێکەوتنی من هیچ فایدەی نیە. دەبوایە هەر ئاواش ولامی بدەمەوە. چونکو ئێمە لە کومیتەی ناوەندی بریارمان دابوو کە هەتا حیزبە کوردیەکانی عیراقی بە راشکاوی رەخنە لە رابردووی خۆیان نەگرن لەگەلیان دانەنیشین. هەرچەندە دوکتور قاسملو دەمێک بوو ئەو بریارەی شکاندبوو. چاوی بە مام جەلال کەوتبوو، لەگەڵ دوکتور مەحمود هاوکاری دەست پێ‌کردبوو، تەنانەت هاتبۆوە کە لەگەڵ حکومەتی عیراق ئاشتیان کاتەوە. کاک نوری شاویس لەسەر یەکتر دیتن سور بوو، گوتی: ئەگەر گەرایەوە بۆ سوفیا کاک مەسعود قسەت لەگەڵ دەکا.

رۆژی ٧٩/٢/٢٠ گەرامەوە بۆ سوفیاو بریارمدا کە چاوەروانی خەبەری کاک حەمەدەمین نەبم‌و بگەرێمەوە بۆ ئێران. رۆژی ٧٩/٢/٢١ کاک مەلا حەسەنی رەستگارو کاک مەلا رەسوی پێشنماز لە پاریسەوە هاتنە سوفیاو دەچونەوە بەغدا. لەگەڵ ئەوان قەرامان دانا کە لەبەغداوە تێلگرافم بۆ بنێرن‌و خەبەرم بدەنێ بچمەوە عیراق‌و پێکەوە بچینەوە ئێران.

بەلأم وادیار بوو ئەوان خەبەری تالاتی سەربازخانەی مەهابادیان زانیبوو، وێرا نەگەیشبوون خەبەر بدەنە من گەرابوونەوە. حەقیش وابوو چونکە جاریوا وەدوا کەوتن قازانج نیە.

لە ئێران راپەرینی خەلک سەرکەوتبوو. لە رێگای رادیۆو ئاژانسە خەبەریەکانەوە تا رادەیەک ئاگام لە وەزعی ئێران هەبوو. دەمزانی کە ح.د.ک.ا بە تەواوی لە شۆرشی گەلانی ئێران پشتیوانی دەکا. نامەیەکم بۆ رۆژنامەکانی لوبنان ناردو پشتیوانی جولانەوەی کوردم لە شۆرشی ئێران راگەیاند. رۆژنامەی«السفیر»ی لوبنانی رۆژی ١٩٧٩/٢/٢٥ دەقی نامەکەی منی بلأو کردبۆوە. دیار بوو کاک سەلاح بدرالدین نووسراوەکەی منی کردبوو بە عەرەبی دابووی بە رۆژنامەکان. بێجگە لە ناوەکەم (جێگری سکرتێرو ئەندامی دەفتەری سیاسی)یشی لیٚزیاد کردبوو، لە کاتێکا ئەوردەم من هەلپەسێرابووم.

رۆژی ١٩٧٩/٢/٢٢ کاک مەسعود بارزانی تەلیفونی کردو گوتی: «لەبەر دیتنی تۆ هاتومە قبرس. سەبارەت بە پاسپۆرتەکەم کە نامەری مۆری ولاتانی سوسیالیستی پێوە بێ دەنا دەهاتمە بولغارستان. زۆر پێویستە یەکتر ببینینو پێکەوە بدوێنو لێک تێبگەین».

گوتم: تکایە دوو رۆژیتر تەلیفونم لیٚبکەوە عەرزت دەکەم داخوا دەتوانم بێم؟ یان نا. چونکە دەبوایە ڤیزای چونە دەرو گەرانەوە وەربگرم، نەمدەزانی بە سانایی وەگیرم دەکەوی یان نا.

رۆژی ٧٩/٢/٢٣ کاک مەسعود تەلیفونی کردەوەو بە جیددی داوای کرد بچمە قبرس. پێم گوت سبەی لە فرۆکەخانە چاوەروانم بن. رۆژی ٧٩/٢/٢٤ سواری فرۆکە بوومو لە فرۆکەخانەی «لارینکا» کاک عارف تەیفورو برادەرێکیتر چاوەروانم بوون. سەعات ١٢ گەیشتمە نیکۆسیا. چوینە ئەم هۆتێلە کە کاک مەسعودی لیٚدابەزیبوو. بێجگە لەوەندەی کە بە نان خواردنەوە خەریک بووین، ئەویتر تا سەعات سیٚو نیوی شەو

لەگەڵ کاک مەسعود دوو بە دوو بە درێژی قسەوباسمان بوو. کاک مەسعود باسی رابردووی خزیانی کردو هاتە سەر زیندوو کردنەوەی پارتی بە ناوی (قیادەی موقەت). پاشان گوتی: «لەمەودای خەباتدا ئێمە توشی هەڵەی زۆر بووین. بەڵام ئەوە بەو مانایە نیە کە خەلکی‌تر هیچ هەڵەیان نەکردوەو دەیانەوی تەواوی کاسەو گۆزە لەسەری ئێمەدا بشکێنن. خەلکی‌تریش هەڵەی بووە، ئێمە ناتوانین چونکە هەڵەمان بوە، لە ساحەی خەبات دوور کەوینەوە. ئێمە ئامادەین واز لە ناکۆکی رابردوو بێنین، لەگەڵ جەلال‌و حیزبی کۆمونیستیش هاوکاری تازە دەست پێ‌بکەینەوە».

من مەسەلەی ناردنی نامەی بالوێزخانەی سۆڤیەتی-م بۆ گێراوە کە چەند رۆژ پێش پەیمانی ئەلجەزایر بە هۆی مەلا عەولای حەیاکی‌دا بۆم ناردبوون‌و کاک ئیدریس گوتبووی: «ئەگەر کارمان پێیان هەبوو وەلامیان دەدەینەوە». گوتم ئێوە وەها کەوتبوونە ژێر تەئسیری شای ئێران کەسی دیکەتان حیساب نەدەکرد. کاک مەسعود گوتی: «ئاگام لە نامەیەکی وا نیە. دوو جار دووپاتی کردەوە کە ئاگاداری مەسەلەیەکی ئاوا نەبووە». پاشان گوتی:«ئێمە ئێستە بریارمان داوە کە لەگەڵ هیچ یەک لەو حکومەتانەی بەسەر کوردستاندا حاکمن، پێوەندی و تێکەلیمان نەبێ». گوتم کاک مەسعود ئەم بریارە زۆر گرنگە. تا ئێستا کورد هەر لەوەدا تێدا چووە کە پاڵی وەدوژمنی کورد داوە. ئیجازە بدە ئەم قسەیەت یادداشت بکەم. گوتی:«کاک کەریم یادداشتی بکە ئەمە بریاری ئێمەیە». دەقی قسەکانی کاک مەسعود کە لە دەفتەری یادداشتەکانمدا تۆمار کراون ئاوایە:«لەگەڵ ئیعادەی رێکخراو بریارمان دا کە مەسەلەی کورد لە عیراق رەبط نەکرێ بە هیچ دەولەتێک کە کوردی تێدایە. خۆمان لە ولاتانی سوسیالیستی نیزیک کەینەوە، بە هیچ جور تخون ولاتە ئیمپریالیستەکان نەکەوین، هەوڵ بدەین بۆ نێو هێزە دیموکراتیەکانی

جیهان بگەڕێنینەوە. ئەگەر بە یارمەتی تورکیاو ئێران‌و سوریاو ئیمپریالیزم سەربەخۆی کوردستان بدرێ ناماندەوێت».

من ئەوەندەم لە قسەکانی ئەو یادداشت کردو بەجێگای هیواشم دەزانی. بەڵام بەداخەوە دوارۆژ لە ئاست ح.د.ک.ا. هەڵوێستیان پێچەوانەی ئەوی نیشاندا.

پاشان کاک مەسعود گوتی: «با منیش گلەیێکی بکەم. بیستومە کە قاسملور غەنی بلوریان‌و شیخ عیزالدین داوایان کردوە کە بارزانی‌و کوردە عیراقیەکان لە ئێران دەر بکرێن. ئەم کارە لە ئێوە بەدوور بوو». گوتم: من ئێستا دوورم بەڵام بروا ناکەم برادەرانی ئێمە ئەو کارەیان کردبێ. ئێمە رەخنەمان لە سیاسەتی ئێوە هەبووە، بەڵام قەت دژی کوردو بزوتنەوەی کوردایەتی نەجولاینەوە. ئێستا بروا ناکەم دوکتور قاسملو شتی وا بکات. پاشان کاک مەسعود گوتی: «رەنگە بچیە لوبنان ئەگەر چاوت بە فەلەستینیەکان کەوت، پێم خۆشە لە بارەی ئێمەوە قسەیان لەگەڵ بکەی. ئێستا لە سیاسەت‌و هەڵوێستی ئێمە ئاگادار بووی، ئێمە بۆهاوکاری ئەوان ئامادەین». قسەکانی کاک مەسعود جێگای هومید بوون، هەر بۆیەش لەگەڕانەوەمدا بۆ ئێران بە تەواوی لایەنگری دۆستایەتی‌و یەکێتی حیزبی دیموکرات‌و پارتی بووم. کاک مەسعود ئادریس‌و تەلیفونی کەرەجی دامێ گوتی: «ئەگەر بگەڕییەوە بۆ تاران تکایە تەلیفۆنم لێ‌بکە». من لە قبریس بووم لەگەڵ کاک مەسعود وەدەر کەوتبووین چاومان بە رۆژنامەی «السفیر»ی لوبنانی کەوت کە لە ژمارەی (١٧٤٣- ١٩٧٩/٢/٢٥) دەقی نووسراوەی منی بە عەرەبی لە ژێر ئەم ناوو نیشانەدا چاپ کردبوو کەوا وەرگیراوەکەی لێرەدا بڵاو دەکەمەوە:

«حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران پشتگری لە حکوٓمەتی شۆرشگیری ئێران دەکا بە رێبەرایەتی خومەینی‌و هیواری بە وەدەست

هێنانی مافی نەتەوایەتی گەلی کورد هەیە. لە بیروت بەیاننامەیەک لەلایەن حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران بە ئیمزای کەریمی حیسامی جێگری سکرتێری گشتی حیزب بلاو کراوەتەوە کە ئەوەی هەواڵدەرەکانی هەندەران لە سەر وەزعی کوردستانی ئێران بلاوی دەکەنەوە مەحکومی دەکاو پشتگری لە حکومەتی شۆرش لە ئێران رادەگەینێ. لە بەیاننامەکەدا گوتراوە: «هێندێ رادیۆو هەواڵدەری بێگانە دەنگو باسێک لەبارەی وەزعی کوردستانی ئێران بلاو دەکەنەوە کە نەک هەر راست نیە بەڵکو شێواندنی تەواوی بارو دۆخی راستەقینەیەو تەقەلایە لە لایەن پروپاگاندەی رۆژئاواوە بۆ تێکدانی یەکێتی گەلانی ئێران‌و شاردنەوەی راستەقینەیەکە ناکرێ لەبیر بچێتەوە. ئەویش ئەوەیە کە رژێمی شاو هێزە کۆنەپەرستەکان ماوەی ٣٥سال گەلی کوردو حیزبی دیموکراتیان چەوساندۆتەوەو سەرکوت کردوە. حیزبی ئێمە یەک لەو حیزبانەیە کە لە سەرەتاوە روخانی رژێمی پاشایەتی بەستراتیژی خۆی داناوەو لەبەرنامەی حیزبدا هاتوە:(حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران خەبات دەکا بۆ روخاندنی رژێمی دیکتاتۆری شاو دامەزراندنی حکومەتێکی نیشتمانی‌و دیموکراتی‌و ئازادو دژ بە ئیمپریالیزم) حیزی ئێمە جارێکی‌تر پشتیوانی خۆی لە هەنگاوە پێشکەوتوەکانی حکومەتی شۆرش بە رابەرایەتی خومەینی رادەگەینی‌و هەموو تەقەلایەکی تێکدەرانەی ئیمپرالیزم‌و کۆنە پەرستی بۆ تێکدانی هاوکاری نێوان گەلانی ئێران مەحکوم دەکا، هەر وەک بە درێژایی خەباتی دوورو درێژ ئەم پلو پایەی مەحکومی کردووە. گەلی کورد لە ئێران کە چەوساوەی دەستی رژێمی شا بووە نەک هەر ئامادە نیە ببێتە قوربانی ئاژاوەو پلانی ئیمپریالیزم، بەڵکو وەک بەشێکی کاریگەری خەباتی گشتی گەلانی ئێران‌و هێزێکی تەکاندەری پاک کردنەوەی دەزگای ساواک‌و کۆنەپەرستی لە سەرانسەری ولاتدا دەمێنێتەوە. ح.د.ک.ا دوای ئەو سەرکەوتنە مەزنەی کە لە سایەی

یەکیتی گەلانی ئێرانەوە وەدەست هاتوە هیواداره لە رژێمی کۆماری ئیسلامیدا گەلی کورد بە مافی نەتەوایەتی خۆی بگات. چونکە لەسەر ئەو باوەڕەیە کە دابین کردنی ئەو مافە دەبێتە هۆی یەکیتی گەلانی ئێران‌و بناغەیەکی بتەو بۆ پاراستنی رژێمی کۆماری‌و کۆسپی سەر رێگای پەلە قاژەی ئیمپریالیزم‌و کۆنە پەرستی. لەبەر ئەوە ئێمە جارێکی دیکەش هەموو تەقەلایەکی دژی حکومەتی ئێستا مەحکوم دەکەین‌و پشتیوانی خۆمان لە ئیمام خومەینی رادەگەیەنین».

رۆژی ٧٩/٢/٢٦ گەرامەوە بۆ سۆڤیا شەو تەلیفونم کرد بۆ تاران‌و لەگەڵ کاک سمایلی ئاهەنگەری ژنبرام قسەم کرد. پاش بیست ساڵ بۆ هەوەڵین جار خێزانم لەگەڵ برای گوێیان لە یەکتر دەبوو. رۆژی هەوەڵی مانگی مارسی ١٩٧٩ ئەبو هشمام لە بیروتەوە لە لایەن رێکخراوی رزگاریخوازی فەلەستینەوە تەلیفونی کردو گوتی: «لە لایەن رێکخراوی فەتحەوە بە رەسمی داوەت کراوی کە بێیە بیروت. چاوت بە ئەبو عمار دەکەوی لەوانەیە سەبارەت بە مەسەلەی کورد نامەش بۆ خومەینی بنووسی. بە نوێنەری خۆمان لە سۆڤیا گوتراوە پێوەندیت لەگەڵ بگری‌و رۆژی هاتنت بە ئێمە رابگەیێنی». رۆژی دوایش کاک سەلاح بدرالدین تەلیفونی کرد گوتی: «لێرە رێکخراوی فەتح چاوەروانتە هەتا زوو بێی درەنگە». ئێتر نەدەکرا راوەستم. بە تایبەت کاک حەمەدەمینی سیراجی خەبەری بۆ ناردم کە گیر نەبم بگەڕێمەوە. لە سۆڤیا لەگەڵ کاک بهاالدین نوری چارمان پێک کەوت. پێم‌گوت: مەسەلەیەکی ئاوایە، من دەچمە بیروت‌و لەویشەوە دەگەڕێمەوە بۆ ئێران.

گوتی: «کورە هەلێکی باشە. ئێمە دەمێکە خەریکین بچینەوە ئێران‌و لەوێشەوە بچینەوە کوردستانی خۆمان، بۆمان دەست نادا. کەوا بوو بەناوی دەستەی نوێنەرایەتی حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران ئێمەش لەگەڵ خۆت بەرەو بانگەبێنەوە ئێران. دەرفەتی ئاوا قەت هەڵناکەوێ‌و

نابێ لە کیسی بدەین». فکرێکی باش بوو، ئەوەندە خزمەتەم لەدەست دەهات نەک هەر نەدەبوایە بیخەمە پشت گوێ، بەڵکو بە شانازیەوە دەبوایە ئەنجامی بدەم. هەر ئاواشم کرد. گوتم: زۆر باشە. نوێنەری ڕێکخراوی فەتح لە سۆڤیا تەلیفونی کرد گوتی: کەنگێ دەڕۆی تا خەبەر بدەم بە بیروت پێشوازیتان بکەن. گوتم: ئێمە پێنج کەسین، ڕۆژی ١١ی مانگ دەگەینە بیروت.

# بەرەو بێروت‌و ئێران

رۆژی ١٩٧٩/٣/١١ لەگەڵ ئەبو سەلام‌و کاک رەفیق سابیرو مەلا عەلی‌و برادەرێکی دیکەی ئەوان لە سۆفیاوە بێ‌پاسپۆرت سواری فرۆکە بووین بەرەو بیروت. فرۆکە لە ئەستەنبول ٤٥ دەقیقە راوەستا هاتینە خوار لە فری‌شۆپی فرۆکەخانە نازانم چم کڕیبوو چووم پارەکەی بدەم. کیژێکی جوانکیلە لەسەر سندووق بوو. منیش هەروا بە کوردی گوتم: پارەکەی چەندە. کیژەکە قوت بوو. پاشان گوتی: «تە کرمانجی!»

ـ ئەری کرمانجم. تەش کرمانجی؟

ـ ئا... ئەزیش کرمانجم... تەزانی مەلا مستەفا مردیە.... دەستی کرد بە گریان...

من نەمزانیبوو. خەبەرێکی کوت‌و پڕ خورپەم لە دڵی هات زۆر نارەحەت بووم. لەبەر بێ‌خەبەری خۆم‌و هەست‌و سۆزی ئەو کیژە تاوێک مات بووم. پاشان پرسیم کەنگێ؟

ـ بە کوڵی گریانەوە گوتی: پێنج رۆژە.

لە فرۆکەخانەی بیروت ئەبو هشام‌و کاک سەلاح بدرالدین چاوە روان بوون. نامەیان بۆ پۆلیسی فرۆکەخانە هێنابوو. سواریان کردین‌و چووینە بیروت. رۆژی دوایە رۆژنامەکانی بیروت سەفەری دەستەی نوێنەرایەتی حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێرانیان بۆ لوبنان بڵاو کردبۆوە. شەو گۆڤاری «النهار الدولی» وتو وێژێکی دوور درێژی لەگەڵ ساز کردم.

رۆژنامەی کەیهانی تارانیش دەقی وتو ویژەکەی بە رەسمەوە بلاو کردبۆوە. بەداخەوە دەقی وتو ویژەکە بە دەستەوە نیە کە بلاو بکرێتەوە.
رۆژی دوایی بە گوێرەی بەرنامەیەکی بۆیان دانابوم چاوم بە ئەبو ئەیاد (سەلاح خلف) کەوت. لەسەر بارو دۆخی ئێران‌و مەسەلەی کورد بە درێژی قسەمان کرد. ئێوارێ بردیانم بۆلای ئەبو جیهاد (خلیل وەزیر) بە گوێرەی بریار دەبوایە چاوم بە یاسر عەرەفات بکەوێ. شەوی ٧٩/٣/١٣ سەعات ١١ی شەو سواری ماشینێکیان کردم پاش سورانەوەیەکی زۆر بە کۆچەو کۆلانی بیروت‌دا بردیانم بۆ خانویەکی پر لە چەکدارو گەمارۆدراو لە ژورێک دایان‌نام‌و قاوەیان هێنا. زۆری پێ‌نەچوو یاسر عەرەفات وەژور کەوت. بە روخۆشی بۆەی لەسەر لێو لە ئامێزی گرتم‌و زۆر بە گەرمی بەخێرهاتنی کردم. دانیشتو لەسەر وەزعی کوردستان، خاک‌و خەڵک‌و ئاوو هەوا، پێوەندی نێوان بەشەکانی کوردستان‌و حیزبە کوردیەکان دەستی کرد بە پرسیاران. پاشانی گوتی:«ئێوە لە کوردستانی ئێران سێ ئەوەندەی ئێمەن. لە فەلەستینیش کورد هەن لە قەدیمەوە نیشتەجێ بوون‌و ئێستاش هەر خۆ بە کورد دەزانن. پاشان گوتی: لە سەفەری خۆم بۆ تاران لەگەڵ خومەینی باسی کوردەکانم کردوەو پێم گوتوە ئەگەر دەتەوێ پشتت قایم بێ لەگەڵ کوردەکان رێک کەوە. من ئامادەم بۆ بەریوانی بێمە ئێران‌و بێمە کوردستانیش. چەند رۆژی‌تر دەستەیەکی نوێنەرایەتی ئێمە دەچێتە تاران من نامە بۆ خومەینی دەنووسم. تۆ دەتوانی لە تاران چاوت بە نوێنەری ئێمە بکەوێ».
من لەگەڵ سوپاس لە هەڵویستی ئەبو عمار گوتم: ئێمە بۆ سەفەری تاران نە پاسپۆرتمان هەیەو نە ویزا.
گوتی:«پێنج پاسپۆرتیان بدەنێ. نامەش دەنووسم کە ڤیزاتان بدەنێ. لەگەڵ حکومەتی ئێران وامان داناوە کە تەنیا بە نامەی من ڤیزای ئێران بدەن. پاشان گوتی: بلیتی فرۆکەشیان بۆتاران بۆ بکرن».

من کلێنتەیەکی مەرەزی سووری زۆر جوانم هەبوو کاتی خۆی سەید عبدالقادری کوڕی حاجی سید عەولا ئەفەندی بە دیاری بۆی ناردبووم. کلێنتەکەم پێشکێش کردو گوتم: ئەوە دیاریەکی بچوکی کوردی‌یە. هەستا لەسەری ناو چووە بەر تاوێنەو گوتی: «عظیم هذا مال مقاتلین» واتە: ئەوە ئی پێشمەرگانە.

گوتم: ئەوە ئی ئەفسەری پێشمەرگانە. تۆش وەک ئەفسەرێک لێت دەوەشێتەوە. پاشان باسی مام جەلالی کرد ڕەسمێکی مام جەلالی هێنا دەرێ گوتی تازە بۆی ناردووم. من قسەکانی کاک مەسعود بارزانیم لەگەڵ باسکرد.. لە ولأمدا گوتی: «ئەگەر ئەوان دژی ئیسرائیل‌و ئیمپریالیزمی ئەمریکا بەیانێک دەر بکەن، ئێمە ئامادەین پێوەندیان لەگەڵ بگرین‌و هاوکاریان بکەین».

شەو درەنگ ماڵ ئاوایم لێ‌کردو گەرامەوە. پێویستە ئەوەش بلێم لەو چاو پێکەوتنانەدا کاک سەلاح بدرالدینم هەر لەگەڵ بوو. لە لەنگ‌و لۆری زمانی عەرەبیش یاریدەی دەدام.

لە رۆژەکانی دوایی‌دا چاوم کەوت بە نایف حەواتمە، جۆرج حەبەش، وەلید جوتبلات، برایم قەلیلات‌و کاک عیسمەت جاوید ئەندامی دەفتەری سیاسی حیزبی کومونیستی لوبنان. لەگەڵ هەموان و ەزعی ئێران‌و کوردستان‌ ‌و حیزبی دیموکراتم باس کرد. رۆژی ١٩٧٩/٣/١٧ پاسپۆرت‌و ڤیزای ئێران‌و بلیتی فرۆکە بۆ هەموومان ئامادە بوو. رۆژی ٣/١٨ لە بیروتەوە بەرەو تاران کەوتینە رێ. دەبوایە رۆژێک لە یونان بمێنینەوە فرۆکە بگۆرین. پاش ئەوەی لە فرۆکە هاتینە خوار، بردیانین بۆ هوتیل(کنگ پلاس)و لە سەر حیسابی شیرکەتی فرۆکەوانی شەو لەوێ ماینەوە. دوای نیوەرۆ بۆ تەماشای هێندێ شوێنی مێژوویی یونان چوینە نێو شار. زۆر حەیفە مرۆڤ رێی دە یونان بکەوێ‌و لە ئاتێن نەچێتە تەماشای ئەو هەموو شوێنەوارە مێژووییەو سەیری ئەو هەموو پەیکەرو

کارە هونەریانە نەکات. ئێمەش لە نێو شار دەگەراین‌و تەماشای دوکان‌و فروشگا جوانەکانمان دەکرد. کاک رەفیق سابیر گوتی: «ئەم دوکانانە چەندە پرو جوان‌و رێک‌و پێکن. بەلاّم حەیفە بەدەست چینی کرێکارەوە نین». گوتم: هاورێ راست دەکەی. جا ئێستا ئەوانە بکەونە دەست چینی کرێکار، بەتاڵ بکرێن، هیچیان تێدا وەگیر نەکەوێ خەڵک لە پشت دوکانەکان بۆ کرینی شت‌و مەک بە سەف راوەستن‌و وەدەستیان نەکەوێ.

ـ ئای.. هاورێ چۆن شتی وا دەڵێی... کردمان بە گاڵتەو پێکەنین.

شەو لە ئاتینەوە تەلیفونم کرد بۆ کاک جەلیلی گادانی‌و پێم گوت کە سبەی لە یونانەوە دەگەمە تاران. رۆژی ١٩٧٩/٣/١٩ لە ئاتێن سواری فرۆکە بووین‌و پاش چەند سەعات لە تاران دابەزین. لەبەر ئەوەی پاسپۆرتی فەلەستینیمان هەبوو، لە فرۆکەخانەی تاران بێ پرسیارو پشکنین هاتینە دەر. کاک جەلیلی گادانی لەگەڵ زۆر لە براکوردەکانی دانیشتوی تاران لە فرۆکەخانە چاوەروانمان بوون. دوای چاک‌و خۆشی‌و بەخێر هێنان‌و پێک شاد بوونەوە چووینە ماڵ کاک جەلیل‌و نەورۆزی ساڵی ١٣٥٨-مان لە ماڵی کاک جەلیل‌و لە میوانداریەکی شازی کوردانەدا بردە سەر. رۆژی دوایی ئەبو سەلام‌و برادەرانی چوون بۆ هوتیل شەرافەت. خزمیکی خێزانم لەو هوتیلە بوو ئەسپاردم کە خزمەتیان بکا.

رۆژی هەوەڵی بووتم لە ماڵی کاک جەلیل ئەوەی پتر سرنجی راکێشام ئاخافتن‌و قسە کردنی کاک جەلیلی گادانی بوو بە تەلیفون. بەراستی سەرم سور مابوو. نەمدەزانی ئەو برادەرە چۆن بە کارەکانی‌ترو بە خواردن‌و خەو رادەگەیشت. تا ئێستا نەمدیبوو کەسێک بە تەلیفون ئەوەندە وەختی خۆی بە چاک‌و خۆشی‌و بە ئەحوالپرسی زایە بکا. زۆرم دیبوو کە عەرەبەکان پتر لە دەجار «شلونک ، بعد شلون‌و شلون ئەحوال» دووپات دەکەنەوە. بەلاّم دیسان هەر نەدەگەیشتنە کاک جەلیل. هەتا خوداو راستان لە سوید کاک ئەهەد گەردەوانیم دیت کە دەستی کاک

جەلیلی لە پشتەوە بەستبوو.
لە تاران زۆر لە ناسیارو نەناسیاوی کورد دەهاتنە لام و بە دیداریان شاد دەبووم. ڕۆژی دوایی کە گەیشتمە تاران کاک فەتاحی قادری برای کاک هەباسی ماسوێ کە لە بەرگی یەک و دووی بیرەوەرییەکانمدا باسی جوامێری و پیاوەتی ئەو هاتوە هاتە لام. پاش چاک و خۆشی و باسی وڵات سویچی ماشینەکەی لە پێش من دانا و گوتی: «تاران زۆر قەلەبالغە، تاکسی و ئوتوبوس کەم دەست دەکەوێ، تۆش چونە دەرو هاتوچۆت دەبێ. ماشینەکەی من لە ئیختیارت دابێ تا دەچیەوە مەهاباد و ئەگەر ویستت بینێرەوە دەنا با لە خزمەتت بێ». لەگەڵ سوپاس بۆ هەستی ئەو برادەرە ماشینەکەم بردەوە مەهابادیش و نەغەدەو شنۆو ماوەیەکی زۆر لەلام بوو تا چوومەوە تاران.
پاش یەک دوو ڕۆژ ئەبو سەلام گوتی: دەمەوی سەرێکی دەفتەری حیزبی تودە بدەم. شارەزا نیم، پێم خۆشە ئەگەر لەگەڵم بێی. چووینە دەفتەری حیزبی تودە. عەمویی لەوێ بوو، باسی وەزعی وڵات کراو هاتینە سەر باسی کوردستان و حیزبی دیموکرات. عەمویی گوتی: «ئێمە حیزبی دیموکراتی کوردستان بە حیزبێکی دیموکراتی میللی پێشکەوتوخواز دەزانین و بە هاوسەنگەری خۆمانی دەناسین. بە هەموو تواناوە پشتیوانی لێ دەکەین». ئەو قسانە ئەو دەم بۆ یەکیتی خەبات جێگای هومێد بوون. بەڵام پاشان دەرکەوت هەر قسە بوو. یا ئەو دەم بە تەواوی بۆ خنکاندنی خۆیان پەتیان نەدابوە دەست خومەینی.
کاک سمایلی ئاهنگەری ژنبرام هاتبوە تاران و پاش ٢٠ ساڵ بە دیداری یەکتر شاد بووین. ڕۆژی ٢ی خاکەلێوە ١٩٧٩/٣/٢٣ لەگەڵ کاک جەلیلی گادانی و چەند برادەری مەهابادی و ئەبو سەلام و هاوڕێکانی بە سواری چەند ماشینی تایبەتی بەرەو مەهاباد کەوتینە ڕێ. شەو وەرەنگ گەیشتینە بیجار. تفەنگچی نێوشار رایان گرتین. پاش پرسیارو لێک

شارەزا بوون بردیانین بۆ هوتێلێکو شەو لەوێ ماینەوە. بەیانی زوو بەرەو سەقز کەوتینە رێ. ئەو دەم لە سنە شەڕ دەست پێکرابوو. لە نیزیک دیواندەرە ماشینێک راوەستابوو، کابرایەکی میزەر بەسەر دەستی هەڵێناو خەبەری شەڕی سنەی پرسی. کابرا لە میزەری سپی وەمەلایان دەچوو، لە ریشو پەشمی سۆفی بوو، لە بۆشناخیو چاکەتو پاتۆلی لە کورە ئاغایانی دەکرد. لێمان پرسی چکارەی بۆ کوێ دەچی؟ گوتی: نانو خواردەمەنی بۆ پێشمەرگەکانی سنە دەبەم شارەزاش نیم. ئیتر ئێمە بەجێمان هێشتو نەمانزانی داخوا گەیوەتە سنە یان گەراوەتەوە.

بەیانی تاو هەلاتێ گەیشتینە سەقزو چووینە مالی کاک عەزیزی ماملێ. ئەو دەم کاک عەزیز لەوێ خەریکی کاری پارێزەری بوو. کاک سەلیمی باباﻥزادەو مستەفاخانی شیخ ئاغایی لەگەڵ چەند برادەری‌تر بۆ بەخێر هێنانەوەمان لە بۆکانەوە هاتبوونە سەقز. پاش نانو چا خواردن لە مالی کاک عەزیزی ماملێ چووینە دەفتەری حیزبی دیموکرات. دیتم مامە قالەی دەباغی ئەوا لە کومیتەی حیزبی هەلدەسورێ. دوای ٣٥ سال مامە قالەم دیتەوە کە لە بەرگی یەکەمدا باسی قادری دەباغیم کردوە کە چووبوو برادەرانی کومیتەی حیزبی ئاگادار بکا کۆ بینەوە رۆیشتبوو هەتا ئەو دەم چاوم پێ‌نەکەوتەوە. برادەرانی کومیتەی حیزبی گوتیان: ئەندامو لایەنگرو لاوەکانمان ئاگادار کردوە ئێستا کۆ بوونەوەو چاوەروانن بچیە نێویان. ناچار دەگەڵ برادەران چوومە کۆبوونەوەی برادەران. لەسەر بارو دۆخی تازەی ولات، ئەرکی ئەندامانی حیزبو پێوەندی لەگەڵ کۆمەلانی خەلک بە درێژی قسەم کرد. دانیشتنێکی خۆشو برایانە. دوای وێنە گرتنو حەسانەوە کەوتینە رێو لە بۆکان چوینە رێکخراوی حیزب. برادەرانی ئەندامی کومیتەی بۆکان زۆریان ئەو کەسانە بوون کە یەکترمان دەناسیو کاتی خۆی پێکەوە کارمان کردبوو. شادیو هەستێکی شۆرشگێرانە لەم چاو پێکەوتنانەدا مەوجی دەدا. لە بۆکانەوە هێندێ لە

برادەران رەگەڵمان کەوتن بەرەو مەهاباد. گەلێک لە دۆستو برادەرو ئەندامانی حیزبی هاتبوونە سێڕای میاندواو. لەوێ ماشینەکان راوەستانو بەخێر هاتنو ئامێزو ماچ دەست پێکرا. دوای چاکو خۆشیو ئەحوالپرسیو وێنەگرتن سوا بووین بۆ مەهاباد. زۆر لە خزمو دۆستو برادەرانی قەدیمی هاتبوونە دەروازەی شار. ئەندامانی کومیتەی ناوەندی بێجگە لە مەلا سمایلی حاجی هیچیان نەهاتبوون. هەرچەند کاک جەلیل خەبەری دابوو. بەڵام لە جیاتی هاتن دوکتور قاسملو بە کاک حەمەدەمینی سیراجی گوتبوو: «کاک کەریم بۆ هاتۆتەوە خۆ ماوەی هەڵپەساردنی تەواو نەبوو»

حەمەدەمین گوتبووی: «کارێکی زۆر باشی کردوە من خەبەرم داوەتێ گیر نەبێ بگەرێتەوە، دەبوایە زوتریش بێتەوە». بە کورتی پاش ٢٠ ساڵو ٩٥ رۆژ گەیشتمەوە نیشتمانی خۆشەویستو داخو دەردی دوور ولاتیم لە بیر بردەوە. دیارە مرۆڤ هەمیشە لە باری بۆچوونو بریارو هەڵویستەوە بە قەولی برایانی هەولێری تەواو نیە. دەنا حەق وابوو بەر لە هەموو شت راست بچمە سەر ئارامگای پێشەواو زیارەتی بکەم دوایە بچمە دەفتەری حیزب. بەڵام بەداخەوە ئەوەم نەکردو یەکسەر چوومە دەفتەری حیزب. ئێتر ئاسیاو نەئاسیاو حیزبی و غەیرە حیزبی بۆ بەخێر هێنانەوەم روویان کردە دەفتەرو جێگا نەدەبوو. زۆر کەسم نەدەناسیەوە بەلام هەستم بەو شانازیە دەکرد کە خەلک بە خزمەتکاری گەلم دەزانێ. دوای نیوەرۆ چووینە ماڵی کاک جەلیلی گادانی. تازە دانیشتبووین لە نێو شاری بوو بە تەقەو دەسڕێژ. پاش پرسیاران گوتیان خەبەر هاتوە کە سنە گیراوە. هێندێ کەسی چەگدارو بێمەسئولیەت لە خۆشیان تەقەیان دەست پێ کردوە. لەکاتێکا نە سنە گیرا بوو نە هیچ خەبەر هەبوو. بۆم دەرکەوت کە لە نێو شاردا کەس بە کەس نیەو ولاتی بێ نەزمو دسیپلینە.

لە ماڵی کاک جەلیل لە ئێوارەوە تا دوای نیوەشەو بێ‌پسانەوە دەستە دەستە دۆستو ناسیارو خەڵکی‌تر دەهاتن‌و بەدیداریان شاد دەبووم. زەحمەت‌و میواندارى ئەو شەوەی ماڵی کاک جەلیلی قەت لەبیر ناچێتەوە. من راست ئەو رۆژە گەیشتمەوە مەهاباد کە حیزبی دیموکرات‌و کۆمەڵەو شیخ عیزالدین کۆبوونەوە کە لەسەر بەشداری لە رفراندۆم‌دا وتو وێژ بکەن. کومیتەی ناوەندی پێشتر لەسەر ئەو باوەڕە بوو کە لە رفراندۆمدا بەشداری بکا. بەڵام ویستبوویان لەگەڵ مامۆستاو کۆمەڵەش باسی بکەن‌و هەموو پێکەوە لەسەر بڕیارێک ساغ بنەوە. دیار بوو لە کۆبوونەوەدا نەیانتوانیبوو بک‌نە یەک. بەڵام جەنابی مامۆستا شیخ عزالدین لە ژێر تەئسیرو فەرمانی کۆمەڵەدا بە بێ پرس‌و ئاگاداری حیزبی دیموکرات نووسراوەیەکی بڵاو کردبۆوەو بەشداری لە ریفراندۆمدا تەحریم کردبوو. بەیاننامەی مەلا شیخ عزالدین ئەوەندە کوت‌و پڕو بێ‌لێکدانەوە بوو کومیتەی ناوەندی حیزبی دیموکراتی زۆرکردبوو. لە لایەک پێشتر لایان وابوو کە لە ریفراندۆمدا بەشداری بکەن. لە لایەکی‌تر بەو مەبەستە کە نەیاندەویست لە کوردستان دووبەرەکی‌و ناکۆکی ساز بێ لە بەرانبەر ئەم هەنگاوەی جەنابی مەلادا دەستیان بەردانەوەو بڕیاریان‌دا دەستەیەکی نوێنەرایەتی بنێرنە تاران تا چاوی بە خومەینی بکەوێ‌و پاشان بڕیاری ئاخری بدەن. لە کاتێکا بەیاننامەی مامۆستا شیخ عزالدین لە لایەک یەکەم هەنگاوی نانەوەی ناکۆکی بوو لە کوردستان‌و یەکەم هەنگاویش بوو لە لایەکی‌تر بۆ پساندنی هەموو هەودایەکی رێککەوتن لەگەڵ خومەینی.

# ماڵی وسێن مەراغەیی

پاش ئەوەی کە تا دوای نیوەشەو دۆست و برادەران بۆ پێنوە هاتن ماڵی کاک جەلیلیان توشی ماندوویوونو زەحمەت کردبوو، وسێن ئاغای ئەحمەدی ناسراو بە (وسێن مەراغەیی) هەستاو گوتی: «دەبێ بچینە ماڵی ئێمە». هەرچەندی کاک جەلیلو براکانی هەوڵیان دا کە فەرقی نیەو ئێرەش هەر ماڵی خۆیەتی، وسێن ئاغا پێی چەقاندو جانتاو چەمەدانی هەلگرتنو چووینە ماڵی وسێن مەراغەیی. کاتێک پێش ٢٠ساڵ وسێن ئاغام بەجێهێشتبوو، تاقەمنداڵێکی هەبوو لە خانوی کرێدا دەژیا. ئێستا کچێکو دوو کوری زیاد کردبوونو سەرەرای زینداتیو کوێرەوەری ماڵێکی گەورەو چەند ژووری فەرشکراو و خاوێنی پێکەوە نابوو.

ماڵی وسێن ئاغا ئێتر نەک هەر بوو بە ماڵو شوێنی حەسانەوەم بەڵکو ببوو بە بنکەیەکی ئاوەدانی سیاسیش. شەوو رۆژ بێپسانەوە لە شارو لە گوندو لە شارەکانیتری کوردستانەوە دۆستو برادەر پێمەوە دەهاتنو باسو بازاری سیاسەتیش هەمیشە گەرم بوو. سەماوەری ماڵی وسێن ئاغاش قەت هەڵنەدەگیراو بۆخۆیو کورەکانی لە خزمەتی ئەم خەڵکەدا بوون. رۆژ بە رۆژ روو خۆشترو میهرەبانتر بوون. من ماوەی ساڵێک هەموو زەحمەتو ژیانم لەسەر ماڵە وسێن ئاغا بوو. لەو ماوەیەدا ژوورێکی بۆ من فەرش کردبوو. کورەکانی و بۆخۆی خزمەتی میوانو دۆست و برادەریان دەکرد. زۆرجار زینەبە خاتونی خێزانی دەیگوت: «کاک کەریم

بەقوربانت بم ئەوە بۆ میوانداری ناکەی، بۆ ئەو دۆست و برادەرانەت داوەت ناکەی، ئەدی ئێرە ماڵی خۆت نیە؟». ڕاستیشی دەکرد من بێجگە لە ماڵی وسێن ئاغای هیچ جێگاو ماڵو حالی دیکەم نەبوو. برادەرانی‌تر کە لە ئاوارەیی گەڕابوونەوە لە ماوەی یەک دوو مانگدا شوکر هەموویان ببوونە خاوەنی خانوو ماڵو ژیانی تێرو تەسەڵ. منیش لەسەر مالان لە خزمەتی خەڵکدا بووم. با لەگەڵ سوپاسی بێ‌پایان بۆ هێندێ لە دۆست‌و برادەرانی قەدیمی کە بەداخەوە ناکرێ ناویان بێنم کە پارەی نەغدیان لە پاکەتدا بۆ دەهێنام، لەگەڵ سوپاس بۆ خانمێکی کۆنە ناسیارم کە لەباری پارەو لیباس‌و فەرش‌و نوێنیش لێم خافل نەبوو ئەو باسە کۆتایی پێ‌بێنم. چونکە ئەگەر هەموو کتیبەکە لەسەر جوامێری‌و خزمەتگوزاری ماڵی وسێن ئاغاو پیاوەتی هێندی لەو دۆست‌و برادەرانە بنووسم، هێشتا هەر کەمەو ناتوانم حەقی خۆیان بدەمێ.

ڕۆژی ٦ی خاکەلێوە لەگەڵ دوو سێ برادەری کۆنی حیزبی چوومە گوندی دارەلەک سەرخۆشی قادری سۆفی همزە کە کوری کوژرابوو. کاک قادر یەکێک لە ئەندامانی هەرە تێکۆشەری حیزب بوو کە لە بەرگی یەکەمدا باسم کردوە. بەر لەهەموو شت دەبوایە ئەو کارە بکەم چونکە داب‌و رەسمی کوردەواریم قەت وەلا نەناوە. دووەم لە نێو ئەندامانی ڕێبەرایەتی حیزبدا تاقە کەس بووم کە ئەندامانی کۆنی حیزبیم دەناسی‌و کارم لەگەڵ کردبوون‌و پێویست بوو بەسەریان کەمەوە.

ئەو دەم لە دانیشتنەکاندا بەداخەوە پتر باس هەر باسی تالانی سەربازخانەو راوو رووت‌و تفەنگ دزین‌و لەبەر یەک هەلتەکاندنی ماشێنە ئەرتەشیەکان‌و تالان کردنی ئەنبارەکانی سەربازخانە بوو. لە نێو ئەم باس‌و خواسانەدا زۆر لە دۆست‌و برادەران دەیانگوت: «چاک بوو لە کاتی تالان‌و برۆی سەربازخانەدا لێرە نەبووی، دەنا ئێستا تۆش دەکەوتیە سەر زارو زمانان». ڕاستە لەوێ نەبووم، بەلام خولا هەڵناگرێ بێ بەشیش

نەبووم. چونکە کاک مەلارەسولی پێشنماز شەوێکیان پێمەوە هات و تفەنگێکی ژیٖسیٖی جوانی بۆ هێنا بووم. برایەکی خۆشەویست و دۆستی ئازیزم کاک عزمەر ئەویش تفەنگێکی کلاشنیکۆفی بە دیاری دابوومێ. لەو تفەنگانە یەکیان دراوە بە هێزی پێشەواو یەکیشم فرۆشت بۆ خەرجی سەفەری ئورووپا سالی ١٩٨٢.

# سەفەری دەستەی نوێنەرایەتی حیزب بۆ تاران.

ڕۆژی ١٩٧٩/٣/٢٨ دەستەی نوێنەرایەتی ح.د.ک.ا. بە سەرۆکایەتی سکرتێری حیزب بۆ چاوپێکەوتنی خومەینی چووە تاران. بێجگە لە غەنی بلوریانو حەمەدەمینی سیراجیو دوکتور قاسملو ئەوانیتر هیچیان ئەندامی ڕێبەرایەتی حیزب نەبوون. پاش ئەوەی چاویان بە خومەینی دەکەویو بۆیان نایەتە پەدایە، بێئەوەی بێنەوە لە کومیتەی ناوەندیدا مەسەلەکە باس بکەن، ڕایان گەیاند کە لە ڕێفراندۆمدا بەشداری ناکەن. یانی هەوەڵین بەردی بناخەی ناکۆکیان لەگەڵ کۆماری ئیسلامی دانا.

پاش ئەوەی چەند ڕۆژێک لە میوانان سەرم سوک بوو بۆ سەردانی خوشکم چوومە سندووسی. شەو درەنگ سێچوار ماشێن برادەرانی نەغەدە لە گوندی داشدۆرگە پەیدا بوون. گوتیان هاتووین کە بەیانی بێیە نەغەدە. خەڵک هەموو ئاگادار کراوەو بەیانی زوو عالەمێکی زۆر دێ بۆ سێڕای محەمەدیار.ئەوان شەو گەڕانەوە، بەیانی کاک مستەفای ئاغا مەجیدو کاک سەعید کوێستانیو هەشت نۆ کەسیتر لەسەر چاخواردنەوە گەیشتنە دورگە. لە سێڕای محەمەدیار پتر لە پەنجا ماشێن قەرەپەباخو کورد لە نەغەدەوە هاتبوونو ڕاوەستابوون. کە گەیشتبنە ڕێ دابەزیم و لەسەر ماشێنێک بە وتارێکی گەرم بەخێرهاتنی خەلکم کرد. ئالقە گوڵێکیان هێنابوو کردیانە ملم، بەرەو نەغەدە کەوتینە ڕێ.

زۆری مابوو بگەینە دەفتەری حیزب لەبەر قەڵەباڵغیو زۆری خەڵک‌ئیتر ڕێگای ماشێن نەبوو. دابەزینو بە پێ‌یان چووینە دەفتەری حیزبی دیموکرات. کۆبوونەوەی خەڵک لە پێش دەفتەری حیزب لە ڕادە بەدەربوو. برادەرانی‌دەفتەر پێشنیاریان کرد کە وتارێک بدەم با خەڵک بلاوەی بکا. کە هاتمە دەر ئالقە گوڵێکی دیکەیان هیناو کردیانە ملم. بەشی زۆری وتارەکەم بۆ پێویستی یەکێتی کوردو تورک لە سندوس تەرخان کرد. زۆر بە گەرمی پێشوازی لە قسەکانم کرا. پاش وتارو حەسانەوە، چوینە ماڵە کاک ئەحمەدی خەزوورم. کاک ئەحمەدی پیرمەندی نەک هەر خەزوورم بوو بەڵکو دۆست‌و براو هاوکاری قەدیمو تێکۆشەرێکی ناسراوی رێگای ئازادیو دژ بە خرافاتو کۆنە پەرەستی بوو. نانو چێشتێکی هەراوی کوردانە بۆ سەد کەس ساز کرابوو. نیزیکەی شیست حەفتا کەس لەسەر سفرە لێک کۆببوونەوەو یەک لەو رۆژانەی جێگای شانازی من بوو. دەستە دەستە خەڵک بۆ بەخێرهاتن دەهاتو دەرۆی. لە گوندەکانی دەورو بەری نەغەدە برادەران دەهاتن. لە ورمی‌وە هەر ئەو رۆژە جەنابی مەلا ساڵحی ئیمامی مزگەوتی سوننیانو کاک یوسفی کورد نیژادی نیشتمانپەروەر بۆ بەخێرهێنانم تەشریفیان هێنابوو نەغەدە.

# سەفەر بۆ تاران

دووسێ رۆژ لە نەغەدە گیر بووم برادەرانی حیزبی لە شارو لە گوندو لە ناوچەی شنۆیە دەهاتن‌و لەسەر وەزعی خەبات‌و ریبازی حیزب باسیان دەکرد. لە نەغەدە دوای راپەرینی خەلک لە جیاتی هەنگاو نان بۆ یەکیتی کوردو قەرەپەپاخ بناخەی دووبەرەکی‌و ئاژاوەنانەوە دارژابوو. دوو کومیتەی جیاوازی کوردو عەجەم لە شاردا پێک هاتبوو. لە نێو کوردو عەجەم کەسانی هەلْشەو گیرەشێوێن دەستیان هەبوو. دوکتور قاسملو هێنابووی رەحمانی حاجی ئەحمەدی بە بێ ئەوەی رۆژێک رابردووی سیاسی‌و تێکۆشانی حیزبی‌و خەباتی هەبێ کردبووی بە بەرپرسی رێکخراوی حیزب لە نەغەدە. ئەوانەی زیندان‌و دورر خستنەوەو شەقی ژاندارم‌و ساواکیان لەسەر خەبات‌و تێکۆشان وێکەوتبو دەبوایە گوێ راگری بەرپرسی داسەپاوی دوکتور قاسملو بن. میلاکو معیار بۆ دوکتور قاسملو گوێ لە مستی‌و نۆکەر سفەتی بوو، نەک رابردووی تێکۆشان‌و خەبات. یان کاک سەلیمی بابانزادەی کردبوو بە بەرپرسی رێکخراوی حیزبی لە بۆکان کە رۆژێک نەیزانیبوو حیزبایەتی چی‌یەو خەبات‌و تێکۆشان یانی چی. نی کاک سەلیمی هەر چۆنێک بێ بیانویەکی بۆ دادەتاشرێ. چونکە مالەکەی ئەو ببوە مزلی دوکتور قاسملو واتە دەفتەری حیزب‌و مەکۆی کۆبوونەوەو هاتووچۆو قەلەبالغی لە رادەبەدەر. زەحمەت‌و خەرج‌و خواردنی ئەو هەموو عالەمەش لەسەر مالی ئەو بوو. جادەبوایە

لەبەرامبەر ئەو هەموو فیداکاریی‌و زەرەری ماددی‌دا سەرەڕەتیکیشی لە حیزبی دیموکرات‌دا بەدەستەوە بیّ. لە شوێنی دیکەش هەروا، کەریم حەداد کرابوو بە فەرماندەی هێز هەر لەبەر ئەوەی چەند ساڵ رای کردوەو لە قەلادزیّ ژیاوەو... هتد.

پاش ئەوەی لە نەغەدە هاتمەوە مەهاباد ئەمجار زۆر لە ئەندامانی کۆنی حیزبی لەگەڵ چەند مامۆستاو رووناکبیر کە پێشتر دەیانناسیم دەهاتن‌و دەیانپرسی: «بۆچی تۆ لەگەڵ دەستەی نوێنەرایەتی حیزب نەچوویە تاران؟». پێم دەگوتن من ئیستا هەلپەسێراوم. پرسیارەکەیان وورده بوو بە پێشنیار بۆ پێکهێنانی رێکخراوێکی تازەو پچران لە حیزبی دیموکرات. من لە هەموو ماوەی تێکۆشانم‌دا دژی دەستەبەندی‌و جیابوونەوە بووم. رەنگە لە کاتی دیاریکراودا هەلویستێکی باش‌و بە قازانج نەبوویێ، بەلام لەت بوونم بە قازانجی بزوتنەوەی رزگاریخوازی کورد نەزانیوە. بەو برادەرانەم دەگوت: دەبیّ پشوتان لەسەر خۆ بیّ، بێگومان ئەو بریارە هەلدەوەشێتەوە. ئیستا زۆر لەو برادەرانە وەپێشتریش گەلەیی دەکەن‌و بە خەتابارم دەزانن کە بۆچی لە پێکهێنانی رێکخراوێکی جیاواز لە حیزبی دیموکرات خۆم بواردوە.

پاش چەند رۆژ لەگەڵ یەک دوو برادەر سوار بووین‌و ماشینی کاک فەتاحی قادریان بردەوە تاران. ئەودەم دەستەی نوێنەرایەتی حیزبی دیموکرات لە تاران بوو. چاویان بە خومەینی کەوتبوو بە نارازی گەرابوونەوە. شەو لە ماڵی ئەحمەدی قاسملو کۆ بیوونەوە ئیستاش نازانم چۆن بوو منیش ئەو شەوە لەو کۆبوونەوەیەدا بووم. باسی ئەوە دەکرا کە لە رفراندۆم‌دا بەشداری نەکەن. من گوتم: با حیزبی ئیمە نەکەویتە ژێر تەئسیری بەیاننامەی مەلا شێخ عزالدین. باشترە لە رفراندۆم‌دا بەشداری بکەین‌و خەباتی خۆشمان درێژە پیّ بدەین. فایدەی نەبوو سیّ برادەری بەرپرسی حیزبی بیّ بریاری کومیتەی ناوەندی بریاریان دابوو، هەنگاوی

قولکردنی ناکۆکیان لەگەڵ کۆماری ئیسلامی هەڵێنابۆوە. ناچار بە تەنیا لەگەڵ مامە غەنی دووام‌و گوتم:وام پێ مەسڵەحەتە ئێمە لە رفراندۆمدا بەشداری بکەین. چونکە ئێمە بەشداری بکەین یا نەکەین خرمەینی لەو رفراندۆمەدا سەر دەکەوێ. مامە غەنی لە وڵامدا گوتی: «لەبەر ئەوەی مەلا شیخ عزالدین رفراندۆمی تەحریم کردوە ئەگەر ئێمە بەشداری بکەین لە کوردستان دوو بەرەکی پەیدا دەبێ». ئیتر مامە غەنی نەیدەزانی مەلا شیخ عزالدین بەو بەیاننامەیە رێگای دووبەرەکی خۆش کردوە، یا پێیان کردوە. ناچار نامەیەکی درێژم بۆ دەفتەری سیاسی نووسی‌و قازانج و زیانی بەشدار بوون‌و نەبوون لە رفراندۆمدا شی کردەوە. نامەکەمدا بە کاک حەمەدەمینی سیراجی. بەداخەوە روو نووسی نامەکەم لێرەدا بەدەستەوە نیە کە بڵاوی بکەمەوە.

لە تاران لەسەر قەراری پێشوو تەلیفۆنم کرد بۆ کاک مەسعود بارزانی. گوتی: «ئێستا ماشین دەنێرم دەبێ بێیە ئێرە»، زۆری پێ‌نەچوو دیسان کاک عارف تەیفور هات، سوار بووم چوومە کەرەج. لە ماڵی کاک مەسعود فراوینمان خوارد، کاک مەسعود گوتی: «ئێستا ئیدریس دێت. تکام ئەوەیە هەڵوێستێکی برایانەت هەبێ». من قسەکانی کاک ئیدریسم لە سەر خۆم بۆ کاک مەسعود گیرابۆوە، بۆیە تکای کرد کە بە چاوی‌دا نەدەمەوە. کاک ئیدریس هات بەخێرهاتنێکی گەرم‌و دەستمان کرد بە باسی وڵات‌و پاشان گوتیان: «پێمان خۆشە چاومان بە دوکتور قاسملو بە غەنی بلوریان بکەوێ» پێشنیاریان کرد لە تاران لەگەڵیان باس بکەم‌و وڵامیشیان لێ بگیرمەوە. زۆری پێ نەچوو مامۆستا هەژاری رەحمەتی هات چاک‌و خۆشیەکی گەرمان کرد پاشان عبدالوهاب ئوتروشی و رەشید سەندی‌و یەک دوو کەسی دیکەش پەیدا بوون. قاوەیان هێنا، عبدوالوهاب ئوتروشی هەڵی دایەو گوتی: «ئەری کاک کەریم ئێوە بۆ وا دەکەن، بۆ دژی ئێمە دەبزونەوە؟».

گوتم: ئێمە چمان کردووە؟ پێم‌وا نیە ئێمە دژی جوڵانەوەی کورد کار بکەین.

گوتی: «ئەوە نیە بەیانی هەشت مادەییتان دەرکردووە کە ئێمە لە ئێران وەدەر نێن»

گوتم: کاک عبدالوهاب، حیزبی دیموکرات شتی‌وای نەکردوە، تاوانی خەلک مەدەنە پاڵ حیزبی دیموکرات. پاشان تۆ هەر نابێ باسی هیچ بکەی. چونکە تۆ ئەندامی کومیتەی ناوەندی حیزبی دیموکراتت کوشتوە، حەوت کەس لە برادەرانی ئێمەت داوەتەوە بە رژێمی شاو تا دوێنی لە بەندیخانە دابوون. ئێستاش هاتووی لێرە دەتەوی خۆت بە پاک نیشان بدەی‌و حیزبی دیموکرات خەتابار بکەی.

مامۆستا هەژار وەدەنگ هات‌و گوتی: «لام وایە ئێستا وەختی ئەو قسانە نیە. کاک کەریمیش با تورە نەبێ با باسی شتی‌تر بکەین». ئیتر مەجلیسەکە مات بوو. پاشان کاک ئیدریس گوتی:

- محەمەد سدیق زانیویە تۆ هاتویە ئێرە. پێم‌خۆشە چاوت پێ بکەوی.

- هیچ مانیعم نیە ئەگەر دەتانەوی قەی ناکا. ئیتر هەستاین لەگەڵ کاک ئیدریس‌و کاک مەسعودو مامۆستا هەژار چوینە ماڵی شیخ محەمەد سدیق. تا سەر پیلکانەکان هاتە دەرو زۆر بە گەرمی بەخێر هاتنی کردم. دانیشتین قاوەیان هێناو لەبارەی یەکیتی‌و هاوکاری هەموو حیزبە کوردیەکان قسەی کرد. دوای ماوەیەک ماڵ‌ئاواییم کردو گەرامەوە بۆ تاران. لە تاران پێشنیاری ئەوانم لەگەڵ دوکتور قاسملو باسکرد. گوتی: «زۆرمان پێ‌خۆشە بیانبینین. خەبەریان بدەیە تەشریفیان بێت».

من تەلیفۆنم کرد بۆ کاک مەسعودو کات‌و شوێنی دیاریکراوم پێ‌راگەیاند. ئیتر کارم پی‌یان نەما. ئەوان هاتبوون لەگەڵ دوکتور قاسملوو مامە غەنی یەکتریان دیبوو. دەستەی نوێنەرایەتی حیزبی دیموکرات چەند رۆژ لە تاران لەسەر ئەوە گیر بوو تا دوکتور قاسملو

پاسپۆرت وەرگرێ‌و گۆیا بۆچارەی‌کەوتنی یاسر عەرەفات بچیتە بێروت. بەلام ناوی دە لیستەی ئەو کەسانەدا بوو کە حەقیان نەبوو لە ئێران وەدەر کەون. پاسپورتیان نەدایەو گەرانەوە بۆ مەهاباد.

# گەرانەوە بۆ مەهاباد

دوای ئەوەی چەند رۆژ لە تاران میوانی کاک جەلالی پاکزاد دۆست و برادەری قەدیمیم بووم، گەرامەوە بۆ مەهاباد. کاک کەریم ئەحمەدیش هاتبووە تاران و دەهاتەوە کوردستان. پێکەوە سواری قەتار بووین تا مەراغە. لەوێ تاکسیەکی دەربەستم گرت و هاتینەوە مەهاباد ماڵی وسێن مەراغەیی خۆمان.

یەک دوو جار لەگەڵ دوکتور قاسملو باسی ئەوەم کرد بۆ ئەوەی بە چالاکی لەکارو باری حیزبیدا بەشداری بکەم، با کومیتەی ناوەندی کۆ بێتەوەو لەسەر ئەم بریارە نارەوایە لە بارەی هەڵپەسێرانم بریار بدا. دوکتور لە لایەک بەمنی دەگوت: «ئەوە نیە تۆ لە هەموو کارێکی حیزبیدا بەشداری». لە لایەکیتر بۆ ئەوەی لە بریارەکانی کومیتەی ناوەندیدا بەشدار نەبم ملی رانەدەکێشا. پێویستە ئەوەش بڵێم دوای گەرانەوەم لە ئوروپا لە راپۆرتێکی دوورو درێژدا چۆنیەتی سەفەری خۆم و هاتنی بیروت و وتووێژ لەگەڵ رۆژنامەکانی لوبنانی و دیتنی یاسر عەرەفات و رێکخراوەکانی دیکەی لوبنانیم بۆ کومیتەی ناوەندی نووسی. لە نامەکەدا ئەوەشم بیرخستەوە کە رەنگە ئەم چالاکیانەی من لەباری تەشکیلاتیەوە رەخنەیان لەسەر بێ، بەڵام لەباری سیاسیەوە بەقازانجی حیزب و جولانەوەی ئێستای کوردستان بوو. لە کومیتەی ناوەندیدا

کارەکانی من پەسند کرابوون. مامە غەنی بەمنی گوت: «هەنگاوی گەورەت هاویشتون وەختی ئەوە نیە داخوا چ کارێکی تەشکیلاتی رەخنەی لەسەرەو چ کارێکیش بە قازانجی حیزبە». بەڵام دوکتور قاسملو لە چەند جێگا بەتایبەت لای کۆمەڵێک لە مامۆستایانی مەدرەسە کە باسی منیان هێنابوە گۆڕێ، گوتبووی: «بە بێ پرس ئەو کارانەی کردووە». ئیتر نەیگوتبوو کە بریاری کومیتەی ناوەندی لەسەر ئەو کارانەی من چۆن بووە و کارەکانم پەسند کراون.

من بەراستی ئیتر زۆرم گوی نەدەدایە ئەو بریارە. لەگەڵ ئەندامانی حیزبیو کادرەکانی لادێ کە پتر بۆ پرسو را دەهاتنە لای من ئەوەی بە باشم زانیبایە بەرێوەم دەبرد. ئێوارەیەک لەبارەگای حیزبی کۆبوونەوەیەکی کادرەکانی لادێ پێک هاتبوو کە باسی پێک هێنانی یەکێتی جوتیاران بکات. کاک حەمەدەمینی سیراجی کۆبوونەوەی بەرێوە دەبرد. پاش باسێکی زۆر داوایان لە من کرد کە لەسەر ئەو مەسەلەیە بیرو رای خۆم دەربیرم. سەلیمی بابانزادە وەدەنگ هاتو گوتی: «نازانم کاک کەریم بە چ ناوێک لێرەیە. خۆ ئەو ئێستا هەڵپەسێراوە». ئیتر هێندێک لە هاورێیانی قەدیمی حیزبی لێی وەدەنگ هاتن. حەمەدەمین شەشە کە یەکێک لەو ئەندامانی قەدیمو تێکۆشەری ناوچەی شاماتو شارویران بوو لێی راست بۆوەو پێی گوت: «خوێری تۆ چکارەی لێرە دەبێ باش بزانن ئێمە کاک کەریم بە مەسئول دەزانین.جنێوی پێدا. کاک حەمەدەمین کۆبوونەوەکەی نارام کردوە. کاتێک کۆبوونەوە تەواو بوو. حەمەدەمین شەشەو دوو برادەری دیکە دەیانەویست وەدوای سەلیم بکەونو لێی بدەن. بە هەزار حال رامگرتنو هێدیم کردنەوە. دوکتور قاسملو کە ئەو باسەیزانیبوە، لام وایە حیسابێکی هاتە دەستو ئەمجارە راستەو خۆ کاری حیزبی پێدەسپاردم بێ ئەوەی بریارەکە هەڵوەشێنێتەوە. بێجگە لە ئەندامانو کادرەکانی لادێ کە ناسیاری کۆن بوونو رابردووی

تێکۆشانیان لەگەڵ من هەموو لاوانی مەهابادیش کە ئەوەدەم بە ناوی یەکیتی لاوانی کوردستان کاریان دەکرد سەمپاتی و لوتفێکی تایبەتیان لە ئاست من نیشان دەدا. پێم وایە ئەو دۆستایەتی و لوتفەی لاوانی مەهاباد لەوە سەرچاوەی دەگرت کە منیان بەچەپ دەزانی. رەنگە لەژێر هێندێ تەبلیغاتی پروپۆچ و بەدرۆدا بە تودەیشیان زانیبم. چونکە دەرکەوت زۆربەی ئەو لاوانە تودەیی بوون و پاشان لەگەڵ دەستەی حەوت‌کەسی رۆیشتن. یەکیتی لاوان داوای کرد کە لە کۆبوونەوەیەکی گشتیدا لەسەر ئەرکی لاوان قسە بکەم. کۆبوونەوەیەکی یەکجار گەورەیان لە خانوی لاوان (خانەی جەوانان) پێک هێنا. یەک لەو کۆبوونەوە گەورانە بوو کە لە هەموو شارەکانی کوردستانەوە لاوان هاتبوون. لەسەر ئەرکی لاوان لە هەلو مەرجی رۆژدا بەدرێژی قسەم کرد. وتارەکەم پاشان بەدەستکارییەکەوە بە ناوی (لە دەوری رێکخراوی لاوانی حیزبی دیموکرات کۆبینەوە) وەک نامیلکەیەک چاپکراو بە قازانجی رێکخراوی لاوان فرۆشراو بلاو کرایەوە. پاش تەواو بوونی وتارەکەم کەوتمە بەر پرسیاران. زۆربەی ئەو کەسانەی پرسیاریان دەکرد دیاربوو یا کۆمەلە بوون یا چریکی چەپ و یا لایەنگری یەکیتی نیشتمانی بوون. چونکە زیاتر باسەکە لەسەر قیادەی موقەت بوو. زۆر بە راشکاوی دیفاعم لە بارزانی و لە قیادەی موقەت کرد. بەیاننامەی هەشت مادەیم مەحکوم کرد. بە درێژی روونم کردەوە کە رۆژی ئەوەیە هێزەکانی کورد لێک نیزیک بنەوە. قیادەی موقەت هێزێکی گەورەی کوردە ئێمە نابێ بێلین ئەو هێزە پاڵ وەدوژمنانی کورد بدا. لەو کۆبوونەوەیەدا شتێکی‌تر سرنجی راکێشام. هێندی لە لاوەکان دەیانگوت: لە زۆر وشەکانی‌تۆ حالی نابین. من هەولم دەدا بەکوردی پەتی قسە بکەم. ئەوانیش پتر وشەی فارسیان بەگوێ ئاشنا بوو. قسەی کاک حەسەنی قزلجی رەحمەتیم وەبیر هاتەوە کە دەیگوت: «ئەو شۆرشەی ئێران نەبایە، کوردەکانی ئێران هەموو

عەجەماوی دەبوون».
بە دوای ئەو کۆبوونەوەیەدا بە بۆنەی تێپەر بوونی دەساڵ بەسەر شەهیدکردنی سولەیمانی موعینیدا لە لایەن حیزبەوە کۆبوونەوەیەکی گەورە سازکرا. کۆبوونەوەکە حەسەنی ماوەرانی بەڕێوەی دەبرد. دوای وتاری کاک حەمەدەمین، وتاری من بەو ئیعتیبارە کە لە پاش کودیتای ۲۸ی موردادو روخانی حکومەتی مصدق لەگەڵ کاک سولەیمان زۆر نیزیک بووم‌و لە ساڵەکانی ٦٧و ٦٨ پێوەندیمان زۆر بوو سرنجی بەشدارانی کۆبوونەوەی راکێشابوو. لەم کۆبوونەوەیەدا حەسەنی ماوەرانی لەخۆوە وتارێکیشی بۆ برادەرێکی حیزبی کۆمونیستی عیراق دانابوو کە هیچ جێگای نەبوو. ئەوانیش لە جیاتی ئەوەی یەکێکی رەوان بێژ بنێرن، نەمزانی ئەو برادەرەیان لە کوێ دۆزیبۆوە. کە زمانی تێک دەهالاو کەس نەیدەزانی دەڵێ چی‌و باسی چ دەکا. دوکتور قاسملو بە هەق لەم هەڵویستەی حەسەنی ماوەرانی زۆر توڕە بوو.
لەم سەرو بەندەدا کە حیزب دەبوایە خەریکی پتەو کردنی تەشکیلات بێ‌و کاری تەنزیم‌و تەبلیغات لە شارو لە گوند رێک‌و پێک بکا، بە تەواوی هەستم بە کەم‌و کوڕی کاری تەشکیلاتی‌و بێ‌سەروبەرەیی دەکرد.
رۆژی ۱۳٥۸/۱/۱٦(۱۹۷۹/٤/٥) بە بێ ئەوەی گوێ بدەمە بڕیاری هەڵپەسێرانم، نامەیەکی دوورو درێژم لە چوار لاپەرەدا لە بارەی کاری تەشیکیلاتی‌و تەبلیغاتی‌و تێکۆشان لە لادێ‌و لە نێو تاقم‌و دەستەو چینە جۆربەجۆرەکانی کۆمەڵایەتیدا بۆ کومیتەی ناوەندی نووسی. لەبەر درێژی نامەکە بە پێویستم نەزانی بە قەولی کاک حەمەدەمینی سیراجی «چەند لاپەری کتیبەکەی پێ‌رەش کەمەوە». بەڵام هێندێ خاڵی بەرچاو کە لە نامەکەدا هاتوون‌و پێشنیارم کردوون دەیانخەمە بەرچاوی خوێنەرانی بەرێز.
لەسەرەتاوە نوسیبووم: «ئەم شێوەکارەی کە ئێستا لە حیزبدا دەست

پێکراوە، نەک هەر شێوەیەکی دروستو باش نیە، بەڵکو لەگەڵ پێرەوی نێوخۆی حیزبیش نایەتەوە. ئاواڵە کردنەوەی دەرگای حیزب هەر بە ناو نووسین، حیزب دەکاتە کۆمەڵەیەکی بێسەرو بەری بە ناو زۆرو بەناوەرۆک پوچو بەتاڵ. ترسم هەیە ئەوەندە سەرکەوتنەی ئێستا بەری چاومان بگرێو بەشی زۆری کاتمان بۆ قبوڵ کردنی خەڵکو قسەو باسو دیدو بازدید تەرخان بکرێ. لە بارەی کاری ئێستامانەوە بیرو رای خۆم بەم جورە دەخەمە بەرچاو:

١- وەرگرتنی ئەندام بە گوێرەی پێرەوی نێوخۆی حیزب. داواکردنی ئەندامەتی بە نووسین،، چاوەدێری، ناساندنی دووکەسی باوەر پێکراو. لە وەرگرتنی ئەندام پێویستە زۆر ئیحتیات بکرێ. ئەفرادی هەلپەرەستو بێبیروباوەر، کەسانی سەربەکۆنەپەرستیو کورەدەرەبەگی بێبار کە زوڵمیان لە خەڵک کردبێ نابێ بە ئەندامی حیزب وەربگیرێن.

٢- دەزانین کە کومیتەی ناوەندی ئێمە زۆر لاوازە. پێویستە لەسەرانسەری کوردستان تێکۆشانی بەربڵاو دەست پێبکرێو ئەفرادی لێهاتوو بێنە نێو حیزبو لەو تەنگە بەری جوغرافیایش بێنە دەرێ.

٣- بە پێویستی دەزانم تا پێکهاتنی کۆنگرە کۆنفرانسێکی میللی بیەسترێ. بەو مانایە تەنیا ئەندامانی حیزبی بەشدار نەبن، بەڵکو کەسانی ناسراوی نیشتمانپەروەری غەیرە حیزبیو خاوەن رابردووی خاوێنو خاوەن ئیحترام لە نێو کۆمەڵدا بەشدار بکرێ. با ئەوانە بەشدار بن، گوێ لە راپۆرتی کومیتەی ناوەندی بگرن، لە سیاسەتی حیزب تێبگەنو لە دووا رۆژدا ببنە پشتیوانی حیزب.

٤- لە نارچەو گوندەکان کۆبوونەوەی خەڵکی ساز بکرێنو بەرپرسانی حیزب بچنە ناویان قسەیان بۆ بکەن، گوێ لەقسەو ویستو پێشنیارو بیروڕای خەڵک رابگرن».

پاشان لە بارەی پێکهێنانی رێکخراوەکانی پیشەییو غەیرە حیزبی

بەدرێژی باسم کردبوو. دیارە ئەو دەم کومیتەی ناوەندی نە بەو کارانە رادەگەیشت نە ئەوەش بوو کە بتوانێ وەلأمدەری هەلو مەرجی پێش‌هاتوی ئەو دەم بێ. ناو دەنووسراو خەلک گزیا هەر بە ناو نووسین دەبوو بە ئەندامی حیزب. بە خزرای نەبوو کاک جەلیلی گادانی ۳۰۰ کەسی بە نوێنەرایەتی سی هەزار ئەندامی حیزبی بۆ کۆنگرەی چوار هێنابوو. کاک حەمەدەمینی سیراجی بە هەق لە کۆنگرەدا گوتی: «خۆزیا لە جیاتی ئەو سی‌هەزارە سی‌سەد ئەندامی تەواوی حیزبیمان هەبوایە».

# کۆبوونەوەی نەغەدە

کومیتەی ناوەندی ح .د.گ.ا. سەرەرای تێکۆشانی سیاسی و نیزامی نێوخۆی ولاتو سەرقاڵ بوون بە کێشەو هەرای کوردستانو دم بە دمە لەگەڵ حکومەتو گیرو گرفتی زۆر، هەوڵیشی دەدا کە لە نێوان هێزەکوردستانیەکانی عیراقیش‌دا ئاشتی پێک بێنێ‌و لەو کاتە ناسکەدا قیادە موقەتی ئەودەمو یەکیتی نیشتمانی ئاشت کاتەوە. چونکە پرشکی ئەم دوو بەرەکیە رەکوردستانی ئێرانیش کەوتبوو. مام جەلال لە رێگای کۆمەڵەو مامۆستا شیخ عیزالدینەوە تۆزی ئاکۆکی چاندبوو. تەنانەت لە ناوچەی شنۆ بۆ هێندێ لە روناکبیرانی کوردی ئێران کە یارمەتیان پێدەکرد، گەلاڵەی پرۆگرامی کۆمەڵەیەکیشی بۆ ئامادە کردبوون کە حیزبیان پێ‌ساز بکا. کومیتەی ناوەندی بە پێچەوانەی کۆمەڵەو مامۆستا دەیویست مام جەلالو کاک مەسعود ئاشت کاتەوە. بۆ ئەو مەبەستە بریار درابوو کە لە نەغەدە لە ماڵە مامۆستا مەلا سالحی رەحمەتی دوکتور قاسملو، مامۆستا شیخ عزالدین، کاک مەسعود بارزانی‌و کاک سامی عبدالرحمن کۆببنەوەو باسی ئەو مەسەلەیە بکەن. دوکتور قاسملو بەمنی گوت: کە بچمە شاری شنۆو کاک مەسعودو کاک سامی بێنم بۆ نەغەدە. سەیر ئەوە بوو دوکتور قاسملو کە ملی راندەکێشا بریاری هەڵپەساردنم هەڵوەشێنیتەوە، ئەو کارانەشی هەر بە من دەسپارد.

ماشینی سواریم لە کاک سولتانی شیخ ئاغایی وەرگرت‌و لەگەڵ کاک وسینی بەخشی ئەندامی شۆرای شاری مەهاباد چووینە شنۆ. کاک مەسعود و کاک سامی بە گەرمی‌و بە دۆستانە بەخێرهاتنیان کردین. لەبارەی لێک نیزیک بوونەوەو یەکیتی باسێکی زۆرمان کرد. هاتینە سەر ئەو باوەرە کە رۆژی دوایی شەو بچینە نەغەدە. منیش خەبەر بدەم دوکتور قاسملوو مەلا شیخ عیزالدین بێنە نەغەدە.

بۆ نانی نیوەرۆ لە ماڵی حاجیەکی شنۆیی بانگ کرابووین. حاجی کە خودای تەعالا سەروەتێکی یەکجار زۆری پێ‌بەخشی‌بوو، تەواوی مەلاو مامۆستاو حاجی‌و گەورە پیاوی شاری داوەت کردبوو. کە وەژوور کەوتین جەنابی قازی خزری (قازی شنۆ) کە لە لای سەرەوە دانیشتبوو هەستاو تا بەر دەرگا هات، بە گەرمی لە ئامێزی گرتم‌و بردمی لە پەنا خۆی دایانم. گوتی: «ئەوە دۆست و برای قەدیمی منە. کاتی خۆی لە شنۆو پاشان لە دەشتە بێل یەکترمان دیوە. الحمدالله ئەوە ئەو جاریش یەکترمان دیتەوە». بە سرتە پێم گوت: «ئەو شیعرانەی تۆم هەروا لە بیر ماون کە دوای گەرانەوەت لە سەفەری باکۆ لەگەڵ پێشەوا لە تاریفی ستالین‌و باغرئوفدا دات نابوون. دەڵێی‌چی بۆیان بخوێنمەوە». دەستێکی لەسەر رانی دانام‌و گوتی: «لەم قسانە گەرێ، وەختی نیە، تۆ برێک زمان لەقی».

جەنابی قازی خزری لەو کەسانە بوو لە سەفەری دواییدا لەگەڵ پێشەوا چووبووە باکۆ. لە گەرانەوەدا شیعرێکی دانابوو دەڵێ:

| | |
|---|---|
| «گەلی کورد ئیتفاق‌و گەر نەدیوە | بچن بۆ خاکی پاکی شۆرەوی‌وە |
| تەواریش ئیستلاحێکە عروسی | لە جیاتی ئیخوەتی ئیسلام خسوسی |
| ستالین ئەو رەئیسی وا بە هیمەت | تەواریشە لەگەڵ ئەفرادی میللەت |
| وەکی میرجەعفەری سەرداری باکی | دەڵێ یۆلداش بە عەمباڵ‌و بەخاکی». |

دانیشتنێکی خۆش‌و بە دیداری گەلێک دۆست‌و برادەرانی قەدیمی ناوچەی شنۆ شاد بووم. دەبوایە شەو لە شنۆ بێنمەوە. بە کاک

مەسعودمگوت: من دەمەوێ شەو بچمە گوندی چەپەراوێ. خزمێکم لەوێیە پێویستە سەریان بدەم. گوتی: «چەند پێشمەرگەیەک لەگەڵ خۆت بەرە». گوتم: زۆر سوپاس. پێشمەرگەم ناوێ شارەزام‌و بە تەنیا دەچم.

هەوا دەهات تاریک دابێ، لەگەڵ کاک وسینی بەخشی سوار بووین بەجادەی پیرانشاردا بۆ چەپەراوێ. رێگای چەپەراوێمان نەدیتەوە، تەماشام کرد وەختە بگەینە سۆلدۆز. وەبیرم هاتەوە کە ئێرە شیخ‌رەشەو کاتی خۆی لەم مەلبەندە شارەزا بووم. گەراینەوە کوێرەرێیەکمان دیتەوەو گەیشتینە نێو گوندی. بنکەی پێشمەرگەی لێبوو لە دوور دەنگیان داین. پێشمەرگەکان هاتنە پێش، کە ناسیانم وەپێشمان کەوتن بۆ ماڵی خزمەکەم. زۆری پێنەچوو مەلا زەینەل‌و دەپازدە کەسی خەڵکی گوندی پەیدا بوون. ئیتر ئەو شەوە تا نیزیک بەیانی نەخەوتین. وای چەند خۆش‌و بەتامە دانیشتنێکی ئەوتۆ کە خەڵک تامەزرۆی دیدارت بن‌و بە ئاواتی ئەوە بن چاویان پێت بکەوێ. لەو کاتەدا ئەم شیعرەی شیخی جامی- م وەبیر هاتیزوە کە دەڵێ:

«چە خوش وقتی‌است و خرم روزگاری که یاری برخورد از وصل یاری
بر افروزد چراغی آشنائی رهایی یابد از داغ جدائی»

بەیانی گەراینەوە بۆ شنۆیێ. بە تەلیفون بە دوکتور قاسملوم راگەیاند کە شەو بێنە نەغەدە. دوای نیوەرۆ ئێمە لە پێش کاک مەسعودو سامی‌دا هاتین بۆ نەغەدە. تەماشام کرد لە شنۆیی‌را هەتا نەغەدە نیوە نیوە بارزانی چەگدار لەمبەرو بەری جادە وەستاون‌و رێگایان خستۆتە ژێر چاوەدێری. کە گەیشتمە نەغەدە دیتم بارزانی لە سەربانی ماڵی مەلا سالح‌و خانوەکانی دەورو بەری کیشک دەکێشن.

ئێوارە درنگ دوکتور و مامۆستا شیخ عیزالدین پەیدا بوون. کاک مەسعودو کاک سامیش هاتن‌و لەماڵی مەلا سالحی رەحمەتی کۆبوونەوە

سازکرا. بەلاٚم کۆبوونەوە بوو بە مزگەوت. خەلکێکی زۆری بێمەسئولیەت و هێندێ ئاژاوەچی هاتبوونە ژوورو هەر لە خۆوە هەلیان دەدایە. من چەند جار لە شێوەی پێک هاتنی کۆبوونەوەکە رەخنەم گرت. هێندی کەس هەر بۆیە هاتبوون کە نەهێلن قسەکان بگەنە یەک. لە کۆبوونەوەدا هاتینە سەر ئەو بریارە کە مامۆستا شێخ عیزالدین لەگەل مام جەلال پێوەندی بگرێ و هەلو مەرجی چاو پێ کەوتن و کۆبوونەوەیەکی تر پێک بێنێ. ئیتر من بێ خەبەر مامەوە، لام وایە کۆبوونەوەی نەغەدە هیچ بەرهەم و ئەنجامێکی نەبوو، چونکە کەس بە تەنگ یەکێتی هێزە کوردیەکانەوە نەبوو.

# تەشکیلاتی شنۆ

لە شنۆیە چەند برادەری حیزبی کومیتەیەکیان پێک هێنابوو پتر باری کۆ کردنەوەی چەگداری هەبوو. کاک مرادی قادری بەسەریان رادەگەیشت. کومیتەی ناوەندی بڕیاریدا بچمە شنۆو بەرپرسیی ڕێکخراوی شنۆ بگرمە ئەستۆ بێ‌ئەوەی خۆم لەوێ بمێنمەوە. دیارە لەم سەرو بەندەدا مەسەلەی هەڵبژاردن‌و لەبەرچاو گرتنی بیرو رای ئەندامان لەگۆڕیدا نەبوو. لە شنۆیە کومیتەیەکی حیزبیم دامەزراندو کاک مەلا محەمەدی مراد ڕەسولیم کرد بە مەسئولی تەشکیلات‌و کاک مرادی قادریش بە بەرپرسی نیزامی. هێندێ ڕێ‌و شوێنی چالاکی حیزبایەتی‌و شێوەی کار کردنم بۆ دیاری کردن‌و گەرامەوە مەهاباد. ئیتر تەشکیلاتی شنۆ راستەوخۆ پێوەندی بەمنەوە هەبوو. پاش ماوەیەک برادەرانی شنۆ لە گوندی نەلۆس کۆبوونەوەیەکی گشتی مەڵبەندی شنۆیان پێک هێنا. لە هەموو گوندەکانەوە خەڵک بۆ کۆبوونەوە داوەت کرابوو. خەبەریان دا بەمن کە بچم بەشداری بکەم‌و وتار بدەم. لەگەڵ یەک دوو برادەری تەشکیلاتی مەهاباد لە ڕۆژی دیاری کراودا چوومە نەلۆس. پتر لە ٥٠٠ کەس لەسەرانسەری مەڵبەندی شنۆ لە مزگەوتی نەلۆس کۆبوونەوە. سەفەرێکی لە رادە بەدەر خۆش‌و دڵگراوە بوو. پاش ٢٨ساڵ چاوم بە دیداری هێندێ هاورێیانی حیزبی روون دەبۆوە کە لە سەردەمێ ڕەش‌و بەترسی دوای رووخانی کۆماری دیموکراتی کوردستان بە نهێنی پێکەوە

خەباتمان کردبوو. ئەودەم هەموومان هاوتەمەنی یەک بووین. بەلاَم ئێستا ئەوان لەمن پیرتر دەهاتنە بەرچاو یادیان بەخێر. برادەرانی وەک میرزا قادر کە پێکەوە بناخەی «یەکیتی لاوانی لادێ»مان دامەزراندبوو. وەک مەلامحەمەدی شیخی، عەزیز بەرکەڵ، سەید محەمەدی بالاگیری، قادری قازی، کە هەموومان ساڵەکانی ٤٩و ٥٠ لە تێکۆشانی نهێنی دابووین. وەک مامۆستا مەلاعەولای ئیمامی، ئەو دۆستە بەرێزەو ئەو مەلا قسە خۆشە کە ریشێکی وای لە خۆ نابوو تا درنگ نەمناسیەوە. پاشان یادی کۆنمان زیندوو کردەوە. زۆر کەسی تریش یادیان بەخێر.

لە مزگەوتی گەورەی نەلۆس بە درێژی لەسەر بارودۆخی وڵاتو سیاسەتی حیزبی دیموکراتو تێکۆشانی سیاسیو ئەرکی ئەندامانی حیزبو پێوەندی لەگەڵ کۆمەلانی خەڵکو لەسەر یەکیتی هێزە کوردستانیەکان لەهەموو بەشەکانی کوردستان قسەم کرد. هێندێ برادەری کۆمەڵەش هاتبوون داوایان کرد کە رێگا بدەین ئەوانیش قسە بکەن. سەبارەت بە هەڵوێستی یەکیتی خوازانەو نیشاندانی هەستی برایانە گوتم فەرموون ئەوە میکرۆفۆنو قسە بکەن. کاک خالیدی عەزیزی کە بەرپرسیان بوو، هاتە پشتی میکرۆفۆنو لە جیاتی باسی خەباتو یەکیتیو شیکردنەوەی بارو دۆخی وڵات دەستی کرد بە هێرش بۆسەر قیادەی موقەتو جەماعەتی بارزانی.

گوتم: کاک خالید، ئەو کۆبوونەوەیە ئێمە سازمان کردوەو خەڵک بە دەنگی ئێمەوە هاتوە. ئێمەش لە هەلو مەرجی ئێستادا نامانەوی لە کۆبوونەوەی ئێمەدا هێزێکی کوردی پەلامار بدرێو دوژمنایەتی سازبکەین. بە تایبەت دەمانەوی لەگەڵ قیادەی موقەت کە هێزێکی کوردستانیە نیزیک بینەوە. هەوڵ دەدەین لەگەڵ یەکیتی نیشتمانی ئاشتیان کەینەوە. تکایە باسێکی دیکە بکە.

فایدەی نەبوو کاک خالید بە گوێرەی سیاسەتی کۆمەڵە لەسەر

قسەکانی سور بوو. ئیتر گوتم: ئێمە ڕێگا نادەین لە کۆبوونەوەی ئێمەدا دژی سیاسەتی ئێمە قسە بکرێ. کاک خالید گوتی: «ئەوە دیموکراسی نیە. لەگەڵ برادەرەکانی هەستاو وەدەر کەوت». ئێمە پاش تەواو بوونی کۆبوونەوە گەڕاینەوە بۆ مەهاباد. پاشان کاک یوسفی ڕیزوانیم بۆ سەرپەرشتی تەشکیلاتی شنۆ ناردە ئەو شارە کە زۆر لەوێ نەمایەوە.

## دەرکردنی وەرزێران لە ناوچەی ورمێ

سەیرێکی رەوەندی پێشکەوتنی کۆمەلایەتی کوردستان بکەین. بۆمان دەردەکەوێ ئاغاو دەرەبەگی کورد بەتایبەت لە کوردستانی ئێران زۆربەیان یا لە خزمەتی حکومەتی عەجەمدا بوون یا لەبەردەستی ژاندارمو قازاخ دا زەلیلو سەرشۆڕ بوون. ئەگەر حکومەتی عەجەم دەسەلاتی نەماوەو کورد هەلی بۆ هەلکەوتوە، دەرەبەگی کورد دەستی کردوە بە تالانو راوو رووتی مسکێنو رەشایی خەلک. یا بۆ پاراستنی بەرژەوەندی خۆی، خۆی خزاندۆتە نێو ریزی جولانەوەی رزگاریخوازی. ئەگەر هەستی بە کزی جولانەوە کردووە، بۆتە جاشو دژی میللەتەکەی چەکی دەست داوەتێ.

لەو کاتەدا کە لە کوردستانی ئێران خەبات بۆ خودموختاریو بۆ وەدەست هێنانی دەسەلاتێکی میللی لەگۆڕێدابوو، لە ناوچەی ورمێ لە مەحالی دەشتو شوێنەکانیتر دەرەبەگی شکاکو هەرکی دەستیان کردبوو بە تالان کردنی گوندیەکانو سەدان مالی وەرزێریان لە گوندی وەدەر نابوو. سەدان مال بە خاو خێزانەوە هاتبوونە شاری ورمێ لە کۆلانانو لە نێو شار ئاوارەو لێقەوماو دەسوورانەوەو یان لە ئوستانداری مانیان گرتبوو.

رۆژی ١٩٧٩/٤/٧ بۆسەردانی لێقەوماوەکانو ئاگاداری لەرووداوەکە چوومە ورمێ. لە گەرانەوەدا بە شنۆو نەغەدەدا هاتمەوە. کاتێک کەپشتمە نێو شاری نەغەدە وەزعێکی ئالۆزم هاتە بەرچاو. چەکدار لەسەربانو لە

شەقامەکان لە حالی ئامادەیی شەردا بوون. هێندێ لە شەقامەکانی شار بەدارو بەردو تەختە گیرابوو. لەمالی کاک ئەحمەدی خەزوورم دابەزیم‌و پرسیم ئەم ئالۆزیە چی‌یە؟ گوتیان دوای نیوەڕۆ ئوتوبوسێک سەربازی بێ‌چەک لە پێگەی جەلدیانەوە هاتونە نەغەدە حەمامێ بکەن. لە سەر زێنوێ قارنێ، پێشمەرگە تەقەیان لێ کردوون‌و یەکیان کوشتوە. ئەوانی‌تر ئێستا ناوێرن بگەڕێنەوە بۆ جەلدیان. کومیتەی عەجەمانیش وەخۆ کەوتوون‌و خەڵکیان چەکدار کردوەو لە تۆڵەی سەربازی کوژراو دوو کوردیشیان گرتوون. کومیتەی کوردەکانیش خۆیان بۆ بەرگری ئامادە کردوە. چوومە کومیتەی کوردان پڕ بوو لە چەکدار. یەک دوو کەسی بێ‌مەسئولیەت هەڵتۆز هەڵتۆزیان بوو. تۆزێک بەسەریان دا هاتم‌و گوتم :داخوا ئێستا لەسندوس وەختی شەڕو کێشەیە؟ دوایە گوتم: ئەو چەکدارانەی سەربان‌و سەر شەقام کۆ بکەنەوە. من دەچمە کومیتە عەجەمان‌و بلاوەیان پێ‌دەکەم. برادەرانی کومیتە گوتیان چۆن دەچی؟ هەموو لە مەتەرێزدان‌و خۆیان بۆ شەڕ ساز کردوەو نابێ بچیە بەر دەستیان. گوتم : کەس لەگەڵ من نەیە، من دەچم‌و بلاوەشیان پێ دەکەم. لەو کاتەدا ماشەڵڵاخانی کوڕی قوڵی‌خانی هات. کە چاوی بەمن کەوت گوتی : «کاتێکی باش هاتووی، وەزع زۆر ئالۆزە. سەربازێک کوژراوە، ئەوانی‌تر ناوێرن بچنەوە جەلدیان. پێشمەرگە ڕێگایان گرتوە. ئەو عەجەمە سەگبابانەش هەروا سەرشانی خۆیان دەپچرن». گوتم: من ئەوە دەچمە کومیتەی عەجەمان تۆ چاوەڕوان بە هەتا دێمەوە. ئەو سەربازانەش دەگەڵ خۆم دەبەمەوە بۆ جەلدیان. بە تێبو مەترێزو چەکداری عەجەماندا چوومە کومیتەی عەجەمان. زۆر لە ئەندامانی کومیتە دۆست‌و ناسیاوی قەدیم بوون. زۆر بە گەرمی بەخێرهاتنیان کردم. بەسەریاندا هاتم گوتم: ئێستا یەکیتی پیویستە. ئەم وەزعە چی‌یە پێکتان هێناوە؟ من بلاوەم بە کوردەکان کردوە تکایە ئێوەش ئەم چەکدارانە کۆ بکەنەوەو ئەم

مەتەرێزانەی سەر شەقام‌و سەربان لابەرن. مەلایەکیان لە نێو بوو دەستی کرد بە شیرەشیر. بەلام مەشەدی یوسفی بنابی‌و یەک دوویەکی‌تر لێی وەدەنگ هاتن‌و مەلایان بێدەنگ کرد. گوتیان: «پێشمەرگە رێگای جەلدیانیان گرتووەو ئەو سەربازانە ناتوانن بچنەوە». گوتم: ئامادەبان بکەن من دەیانبەمەوە، تەسلیمی فەرماندەی پادگانی جەلدیانیان دەکەم. ئێوەش ئەم دوو کوردانە بەرەلا بکەن. یا یەک لە ئەندامی کومیتە لەگەڵم بێ‌و بزانێ کە پێشمەرگە لەسەر رێگا نین‌و پێشمەرگەش تەقەی نەکردووە. پاش هێندێ گلەیی‌و قسەو باس بە زەحمەت یەکیان ساز کرد کە لەگەڵ من بێتە جەڵدیان. گوتم: ئەوە دەچمەوە پێش کومیتەی کوردان، ئوتوبوسی سەربازەکان بابێتە ئەوی دەکەوینە رێ. هاتمەوە کومیتەی کوردان بە مەلا سەید ئەحمەدی سەعدەبی-م گوت: سوار بە لە پێشدا برۆ بەو پێشمەرگانەی قارنێ‌و دۆڵی باو بادینان بڵێ، کەس لەسەر رێگا نەبێ‌و تا ئێمە دەچین‌و دەگەرێینەوە خۆیان نیشان نەدەن.

مەلا سەید ئەحمەد کەوتە رێ. ئوتوبوسی سەربازان هات بە ماشەاللە خانم گوت: پێم خۆشە تۆش لەگەڵمان بێی با عەجەمەکان دڵنیا بن. سواری ماشین بووین‌و وەپێش ئوتوبوس کەوتم تا جەڵدیان. سەربازەکانم تەسلیمی فەرماندەی پادگان کردەوەو پێم گوت: ئەوانە دیتیان کە یەک پێشمەرگەش لە رێگادا نیە. ئەوانەی تەقەیان لە ئوتوبوس کردوە پێشمەرگە نەبوون. فەرماندەی پادگان سوپاسی کردو گەراینەوە بۆ نەغەدە. ئەمجارە هەراو کێشەی کوردو عەجەم لە نەغەدە هێندێ بۆوە. بەلام دیار بوو وەک پزلوی بن خۆڵەمێش بزیسکی ئاگر هەر مابوو. لەسەر ئەوە بەند بوو یەکێک فوی لێ‌بکاو ئاگر هەستێ‌و تەرو وشک پێکەوە بسووتێنێ. بە داخەوە ئاخرەکەشی هەروای لێ‌هات.

لە گەرانەوەدا لە مەهاباد باسی وەزعی لێ‌قەوماوەکانم پێشکێش بە برادەران کرد. من لەسەر ئەو باوەرە بووم کە حکومەت نەیدەویست ئەو

مەسەلەیە چارەسەر بکاو دەرکراوەکان بنێرێتەوە سەرگوندو ڕێو شوێنی خۆیان. کۆمیتەی مەرکەزی حیزبی دیموکرات ڕۆژی ١٩٧٩/٤/١١ بەیاننامەیەکی بڵاو کردەوەو کردەوەی دەرەبەگانی مەحکوم کردو لە بەیانەکەدا هاتبوو کە: بۆ گێڕانەوەی دەرکراوەکان بۆسەر شوێن‌و جێگای خۆیان بە هەموو تواناوە تێ‌دەکۆشین. لەسەر بانگەوازی حیزبی دیموکرات دەستکرا بە کۆکردنەوەی یارمەتی بە لێقەوماوان. ڕۆژ نەبوو لۆریەک نان‌و پەنیرو برینج‌و ڕۆن‌و شەکرو چاوو پەتو لە مەهابادەوە بۆ لێقەوماوانی ورمێ بەرێ نەکرێ. هەر لەو کاتەشدا حیزبی دیموکرات هەوڵی دەدا کە مەسەلەکە بە هێمنی چارەسەر بکرێ‌و گوندیەکان بچنەوە سەر شوێنی خۆیان‌و ئەوەی لێیان ئەستێندراوە بیاندرێتەوە. بەڵام ئاغاکان ملیان ڕانەدەکێشا. لە لایەکی‌ترەوە ڕێکخراوە چەپەکانی وەک فیدایی‌و کۆمەڵەو ئیتحادی کومونیستان‌و پیکارو توفانو ئیتر بێ‌ئەوەی دەسەلاتێکیان هەبێ‌و چاری مەسەلەکەیان پێ‌بکرێ ئاگری کێشەیان خۆشتر دەکرد، دەچوونە نێو لێقەوماوەکان‌و گۆیا بۆ توند کردنی خەباتی چینایەتی هانیان دەدان.

کومیتەی ناوەندی ح.د.ک.ا هاتە سەر ئەو باوەڕە کە لەگەڵ ئوستانداری ورمێ قسە بکرێ. پێشمەرگەی حیزبێ لەگەڵ ژاندارمی دەولەتی بە زۆری دەرکراوەکان بەرنەوە سەر ڕێ‌و شوێنی خۆیان‌و بیانپارێزن. بۆ وتو وێژ لەگەڵ ئوستانداری بەو مەبەستە دیسان من دیاری کرام کە بچمە ورمێ. ڕوژی ١٩٧٩/٤/١٤ چومە ئوستانداری‌و لەگەڵ حەتکۆ ئوستانداری ورمێ سەبارەت بە پێشنیاری حیزب قسەم کرد. بە ئوستاندارم گوت: با ژاندارمە لەگەڵ پێشمەرگەی حیزب ئەو دەرکراوانە بگێرنەوە سەرجێگەی خۆیان. پێشمەرگەی ئێمە دەیانپارێزن. ئوستاندار دەیگوت: «تا ئەمری دەولەت لە مەرکەزەوە نەیەت من ناتوانم ئەو کارە بکەم». لە ڕاستیدا دەولەت لە لایەک نەیدەویست ئاغاکان سەرکوت

بکا، بۆ جاشیتی دوا رۆژ دەیپاراستن. لە لایەکی‌تر نەیدەویست کە حیزبی دیموکرات‌دەست بخاتەنێومەسەلەکەو ئیعتیباری‌لەناو گوندیەکانداز‌یادبکا.

سەنناری مەمەدی پێشنیاری دەکرد کە بە بێ یارمەتی ئوستاندارو بە بێ هێزی دەولەتی با دەرەبەگەکان بگرین‌و زیندانیان بکەین‌و دەرکراوەکانیش بەرینەوە سەر جێگاو رێگای خۆیان. کومیتەی ناوەندی لەبەر ئەوەی شەری خۆ بەخۆی کوردەکان ساز نەبێ لەگەڵ پێشنیاری سەنار یەک نەبوو. کاک مەسعود بارزانیش بۆ ئەوەی مەسەلەکە ئالۆزتر نەبێ‌و دەرەبەگ‌و ئاغاکان ریسوا نەبن‌و سەرکوت نەکرێن، هەولی دەدا کە وەرزێرەکان دەست لە مانگرتن‌و شکایەت هەڵگرن‌و لەگەڵ ئاغاکان رێک کەون. ئەو رۆژەی من بۆ سەردانی مانگرتوەکان لە سالۆنی ئوستانداری چووبوومە نێویان، کاک مەسعودیش هات، قسەی بۆ دەکردن‌و داوای لێ‌دەکردن کە دەست لە مان گرتن هەڵگرن‌و بگەرێنەوە.

پاش باس‌و وتو وێژ لەگەڵ مانگروتوەکان گەیشتینە ئەو بریارە کە چەند کەس هەڵبژێرن‌و بۆ شکایەت بچنە تاران. من گەرامەوە بۆ مەهاباد، حیزبی دیموکرات لەم مەسەلەیەدا هیچ هەنگاوی لێ‌براوی ناویشت. ئەوەندە دەزانم بێجگە لە حیزبی دیموکرات ئەو دەستەو گرۆی‌تر، گشتیان دەیانەویست بە قازانجی مەرام‌و سیاسەتی خۆیان لە دەربەدەری‌و لێ‌قەوماوی ئەم خەڵکە کەلک وەربگرن. تۆ بلێی مێژوو هەر بەم رێ‌رەوەدا نەرواو نەرزیشتبێ؟!.

# سەفەر بۆ قتور

کە چورمەوە مەهاباد دوکتور قاسملو گوتی: «سەتنار یەک دووجار داوای کردووە کە برادەرێک بێتە ناوچەی قتور لە نیزیکەوە لەگەڵ خەلک ئاشنا بیٚ‌و سیاسەتی حیزبیان بۆ روون کاتەوە. پێم باشە کەسێکی دیکەش لەگەڵ خۆت بەری‌و بچی. قتور ناوچەیەکی گرنگەو ئەگەر لەوێ بنکەیەکی حیزبی‌مان هەبێ زۆر باشە. ئێستا سەتنار لە ورمێیە. یەک دوو مەلای خەلکی ئەو ناوچەیەش هاتبوونە لای مامۆستا، بزانە بەڵکو ئەویش یەکێک بنێرێ».

چورمە لای مامۆستا شیخ عیزالدین‌و قسەکانی دوکتورم پی‌گوت. ئەرموی زۆر باشە مەلا سەعیدی کامەمی لەگەڵ خۆت بەرە. کاک مونتەقیمی قازی ماشینێکی زۆر باشی هەبوو، بۆ سەفەری وادوور دەینالاند. پێم گوت: سەفەرێکی ئاوامان لەبەرە پێم خۆشە لەگەڵمان بێی. ئامادەیی خۆی نیشاندا، مەلا حەسەنی رەستگاریشم دیتەوە و ئامادەم کرد کە بچین بۆ قتور. سوار بووین لەگەڵ مەلا سەعیدیش چوینە ورمێ لەوی سەتناری مەممەدی‌مان دیتەوە. دەهاتین کە برۆین نازانم مەلا حەسەن چی‌تری دیتبۆوە، خۆی گیرابەوەو نەهات. رۆژی ١٩٧٩/٤/١٦ لەگەڵ سەتناری مەممەدی‌و مەلا سەعیدو مونتەقیمی قازی لە ورمێوە بەرەو سەلماس کەوتینە رێ. شەو لە سەلماس میوانی کاک سەتنار بووین. بەیانی سەتنار چەند چەکداری خۆی هەلگرت‌و کەوتینە رێ، چووینە شاری خۆیەو

لە فەرمانداری دابەزین. لە نێو شار بوو بە قاو کە چەکداری کورد هاتونە نێو شار. کومیتەی عەجەمان لەشار گورج چەکداران کۆدەکاتەوەو لە فەرمانداری بوو بە سەرت‌و خورت. لێکدا لیکدا دەیانناردە کن فەرماندار کە ئەو چەکدارانە کێن‌و لە چی دەگەڕێن. پاش ئەوەی کە بۆیان روون بۆوە میوانین‌و دەچین بۆ ناوچەی قتور، ئەندامانی کومیتە هاتنە لامان‌و بۆ فراوین میوانداریان کردو دووای نانخواردن سوار بووین بۆ قتور.

کاتێک مرۆڤ دەگاتە زارگەلی قتور، لەو شاخ‌و رۆدو هەلدێرو چیا سەرکەشانە سەری سور دەمێنێ‌و سام دەیگرێ. رێگای قەتار بۆ تورکیا بەقەت پالی ئەم چیاو دۆلەدا کشاوە. لە زۆر جێگا شاخ کون کراوەو بەراستی کاری حەزرەتی فیلە. ئێستا بیر لەوە دەگەمەوە، هێزەکانی حیزبی دیموکرات ئەگەر بەراستی لەم ناوچەیە شەڕیان دەکرد، بۆچی رێگای قەتاری قتوریان نەدەتەقاندو پشتی ئابوری ئێرانیان نەدەشکاند؟ جێگای وای هەیە بزنیش ناتوانێ پێی هەلگەرێ. هێلی قەتار بەوێدا کشاوە، بە بۆمبایەکی دەستی تەرت‌و تونا دەبێ‌و بە سالێک چا ناکرێتەوە. بە خۆزایی نەبووە کە ماوەیەکی بەکجار زۆر ئەم ناوچە کرنگەی نیشتمانی کورد جێگای کێشەو ناکۆکی ئیمپیراتوری ئێران‌و عوسمانی بووە. لە رێگا جارو بار توشی زەلام دەبووین سەننار دەیناسین‌و یا دەیپرسی خەلکی کوێن. دەی‌ئەسپارد کە خەلکی گوندی سبەی بەیانی لە فلان گوند ئامادە بن. شەو چووینە گوندی مەخێن دیار بوو ئەم ناوچەیە سەنناریان بە گەورەی خۆیان دەزانی. میوانداریەکی فرە کوردانەیان ساز کرد. بەیانی لەگەلٚ تاو هەلات لە هەموو لایەکەوە زەلام لە چیا دەهاتنەخواری‌و خۆیان دەگەیاندە کۆبوونەوە. تا لای چێشتەنگاری لام وایە نیزیکەی هەزار کەس کۆ بوونەوە. کۆبوونەوە دەست پێکرا. پاش ئەوەی کاک سەننار منی بە خەلکەکە ناساند نیزیکەی سەعاتێک قسەم کرد. بەلاٚم گومانم لەوەدا نەبوو کە یەک کەسیش لێم‌حالی نەبوون‌و

نەیانزانی دەلێم چی. باش بوو کاک سەتنار بە گەورەیی خۆی قسەکانی منی بە زمانی خۆیان بۆ دەگێرانەوە، رەنگە لە زمانی وی تێگەیشتبن. مەلا سەعیدیش لە لایەن مامۆستاوە قسەی کرد، بەلام بەراستی هەر بە هەوادا رۆیشتن. دوای کۆبوونەوەو نان خواردنی نیوەرۆ گەراینەوە بۆ سەلماس، لەوێ مالاوایمان لە کاک سەتنار کردو شەو هاتینەوە مەهاباد.

# شەری نەغەدە

رۆژگار بە خێرایی تێدەپەرین. رووداوی نالەبار دەهاتنە پێش حیزبی دیموکرات لە توانای دا نەبوو بەسەر رووداوەکاندا زاڵ بێ. نەبوونی کادری لێهاتوو، نەبوونی تەشکیلاتی رێک‌و پێک، گێرەو کێشەی چەک‌و سەربازخانە، گێرەشێوێنی قولەرێکخراوی چەپ‌رەو، پیلان‌و لاساری حکومەت، تێکۆشانی حیزبی دیموکراتیان تووشی کەندو کۆسپ دەکرد. دوکتور قاسملو بریاری دابوو کە لە شارەکانی کوردستان دەفتەری حیزب بکرێنەوەو بەم بۆنەوە کۆبوونەوەی هەراو ساز بکرێ.

لە نەغەدە وەزع تۆزێک فەرقی هەبوو. دوو کومیتەی کوردو عەجەم دامەزرابوون. هەر لەسەرەتاوە ناکۆکی‌و دەمبە دمەیان پێکەوە هەبوو. لە پەنا کومیتەی کوردان رێکخراوی حیزبیش لە نەغەدە کاری دەکرد. وەک پێشتر باسکرا، دوکتور قاسملو رەحمانی حاجی ئەحمەدی لێ‌کردبوە مەسئولی ئەو برادەرانە کە پێشتر رابردووی تێکۆشانیان هەبوو، هەروەها تووشی زیندان‌و دوور خستنەوەو شەقی ساواک‌و ژاندارمەریش ببوون. لە نێو رێکخراوی حیزبیشدا کەسانی‌وا هەبوون دەیانویست هێز بە عەجەمەکانی نەغەدە نیشان بدرێ. لە تەشکیلاتی نەغەدە باسی ئەوە دەکەن کە بەبۆنەی کردنەوەی دەفتەری حیزب میتینگێکی گەورە ساز بکرێ‌و لەهەموو رێکخراوەکانی حیزبی دیموکرات بگێرنەوە کە بە چەکەوە بێنە نەغەدەو بەشداری بکەن. لەنێو ئەندامانی رێکخراوی نەغەدەدا

برادەری وا هەبوون لەگەڵ پێکهاتنی مێتینگ لە نەغەدەدا هاودەنگ نەبوون. لە لایەکی‌تر کومیتەی عەجەمان بە نامەی رەسمی داوای لە کومیتەی کوردان کردبوو کە لەم هەڵو مەرجەدا مێتینگی چەکدار لە نەغەدە ساز مەکەن. ئەگەر هەر دەتانەوی سازی بکەن یا لەو شوێنەی دیاریتان کردوە کە نێو جەرگەی کەرەکی عەجەمانە بیگوێزنەوە بۆ دەرەوەی شار یا بۆلای گوندی بالغچی. بەلام بەرپرسی داسەپاوی دوکتور قاسملو بۆ نیشاندانی هێز پێ‌دەچەقێنێ کە دەبێ هەر لەو شوێنە کۆبوونەوە ساز بکرێ.

رۆژی ١٩٧٩/٤/١٩ سەرهەنگ زەهیر نیژاد فەرماندەی لەشکری ٦٤ی ورمێ لەگەڵ جەوادی فەرماندەی ژاندەرمەری‌و یەک دوو ئەفسەری دیکە بە هیلی‌کۆپتەر هاتنە سەددی مەهابادو داوایان کرد چاویان بە دوکتور قاسملو بکەوی. دوکتور کاک حەمەدەمین‌و منی لەگەڵ خۆی برد بۆ کۆبوونەوە. باسەکە گەرم‌و سرنج راکیش بوو. ئەوان دەیانەویست ئەرتەش بێتەوە پادگانی مەهاباد. زەهیر نیژاد دەیگوت: «شۆرش کراوە، بەلام سەقامگیر نەبوە. ئێوە دەبێ داوای هیچ نەکەن تا بە تەواوی سەقامگیر دەبێ. ئەودەم ویستەکانتان داوا بکەن».

دوکتور دەیگوت: «خەلک بۆیە شۆرشی کردوە کە ناعەدالەتی رژێمی رابردوو بە* ستەمی نەتەوایەتیشەوە لەبەین بچێ. ئێوە ئەگەر ئێستا مافی خودموختاری قبوڵ بکەن، دیارە بەرنگای رژێمی رابردوودا نارۆن. ئەودەم کوردیش بە جیددی‌تر لە شۆرش پشتیوانی دەکا».

ئەوەی لەم کۆبوونەوەیەدا پتر سرنجی منی راکێشا قسەکانی ئەفسەرێکی کورد بوو بە ناوی رەسولی خەلکی شاری سنە کە لە پادگانی خانێ خزمەتی دەکرد. ئەم رۆلە کوردە جوامێرە بێ ئەوەی گوێ بداتە دوارۆژی ژیان‌و دەرەجەو پلەی نیزامی پیاوانە بە گژ فەرماندەی لەشکردا دەهات‌و لەسەر مافی خودموختاری کوردستان پێی‌دادەگرت. باسەکەمان

یەک دوو سەعاتی خایاند، بە نەتیجەیەک نەگەیشتین.

ئێمە لە سەددی مەهاباد دەگەڕاینەوە تەماشام کرد کەریم حەداد چەند لۆری پڕکردوە لە چەکداری ناوچەی سەردەشت‌و بۆ میتینگی نەغەدە کەوتۆتە ڕێ. چووینەوە دەفتەری حیزب. چەند کەس لە برادەرانی کومیتەی ناوەندی لەوێ بوون باسی میتینگی نەغەدەو هاتنی ئەندامانی حیزب لەشارەکانی دیکەوە دەکرا. کاک حەمەدەمینی سیراجی گوتی: «دەمەوێ ئەوە باس بکەم، نازانم لەو هەلومەرجەدا کە لە نێوان کوردو عەجەمی نەغەدە ناکۆکی هەیە، ئێمە ئەم میتینگ و کۆبوونەوەی چەکداری بۆچی ساز بکەین‌و چ پێویستە. ئێستا لەوێ دەفتەری حیزب کراوەتەوە، کاریش دەکا، ئیتر ئەم بەزمەی بۆچی ساز بکەین؟». من پشتی قسەی کاک حەمەدەمینم گرت‌و گوتم: بەنەزەری من هیچ پێویست نیە. لە نەغەدە ناکۆکی زۆرە. دوو حەوتوو پێش من نەگەیشتبامە نەغەدە شەر ساز دەبوو. میتینگی چەکدارو خەلک کۆکردنەوە لە نەغەدە لەم هەلومەرجەدا نە قازانجەو نە پێویست.

دوکتور قاسملو گوتی: «بەرپرسی کومیتەی سندوس بریاری‌داوەو لە هەموو رێکخراوەکانی حیزبیان گیراوەتەوە، تازە تێکی نادەین». بەلام بەرپرسی کومیتەی سندوس ئەگەر بریاری‌داوبوو هیچ ئامادەییەکی لەباری چاوەدێری‌و کێشک‌و نەزم‌و رێک‌و پێکی لەبەر چاو نەگرتبوو. ڕۆژی ٣١ی‌خاکەلێوەی ١٩٧٩ لەسەرانسەری کوردستانەوە خەلک بەرەو نەغەدە کەوتبوونە ڕێ. چەکدارو بێ‌چەک ژن‌و مێرو پیرو لاو لە گەرەکی عەجەمان لە مەیدانێکی خۆلە پۆتەی وەرزشی‌دا کۆببوونەوەو مەیدان هەر زمەی دەهات.

ئەم خەلکە بە دلنیایی بە بێ‌خەیالی شەرو کێشە بۆ تەماشاو بۆ نیشاندانی پشتیوانی لە حیزبی دیموکرات هاتبوونە نەغەدە. کەس بیری لەشەر نەدەکردەوەو بە خەیالی شەر نەبوو. حیزبی دیموکرات نەخەیالی

شەری هەبوو ئەبۆ شەر خەلکی کۆکردبۆوە. بەلاْم دیاربوو عەجەمی نەغەدە چەند رۆژ پێشتر خۆیان بۆ شەر ئامادە کردبوو. لە سەربانان مەتەریزیان ساز کردبوو. لە نێو شاردا ئامادەیی شەر بەرچاو دەکەوت. دەیانگوت نانی چەند رۆژیان کریوە. بەلاْم ڕێکخراوی حیزب و کومیتەی نەغەدەو ئەو خەلکەی هاتبوونە نەدغەدە لەبەر ئەوەی خەیالی شەریان نەبوو، لەبەرانبەر ئەم ئامادەیی عەجەماندا نەخۆیان سڵ کردبوو نە گوێیان دایە. کەمتەر خەمی و لێ‌نەزانی بەرێوەبەرانی میتینگ خەتایەکی گەورە بوو کە لە حیزبی دیموکراتدا قەت لێی نەکۆلْدرایەوە.

کاک حەمەدەمینی سیراجی چوە پشت میکرۆفۆن کە میتینگ بکاتەوە. تەقەی تفەنگێک هات. تەقەیەکی دیکەشی بە دواوە بوو بێ ئەوەی کەس بزانێ لە کوێوە تەقە دەکرێ. خەلک شلەژا. کاک حەمەدەمین چەند جار هاواری کرد تەقەی مەکەن و لەسەر خۆبن، فایدەی نەبوو. دەرپەرین و راکردن دەست پێکرا. هێندێ کەس لەخۆوە بێ‌ئامانج تەقەی دەکرد. دیوارێکی نەختێک بەرز لەوێ بوو.چوومە سەر دیوارو هاوارم کرد تەقەی مەکەن با بزانین چی‌یە؟ لە پەنا میتینگ تەقە دەکرا. یەکێک لە کورەکانی نەغەدە بەسەر زێدە دیوارێکدا چووە سەرو بۆی چوو کە بێدەنگی بکا. یەک دوو کەس دەستی منیان گرت و لەسەر دیوار هێنایانم خوار. کا' حەمەدی سەروکانی(کاپیتان قادری) گوتی: «کورە چە دەکەی؟ کەس لێرە نەما با بڕۆین بەجێت ناهێلم». لەسەر دیوارەکە هاتمە خوارێ، لەگەلْ کا حەمەدی رۆیشتین. ماشینێکی فولکسواگۆن دەهات رایگرت و گوتی:«سواربن». بە زەحمەت خۆمان تی‌ئاخنی. کەمێک رۆیشت دیتم مامۆستا هێمن بە تەنیار بە لاکەلاک دەڕوا. دابەزیم مامۆستام لە جێگای خۆم سوارکرد، گوتم: ئێوە برۆن، خۆم مامەوە. عەجەمێک لەسەربان لە مەتەریزدابوو، سەری هێنابوە دەرێ تەماشای ئێمەی دەکرد. بانگم کرد: بۆ تەقەی دەکەی؟ دەستی راوەشاند برۆ

تێپەرە. لەولاتر چەند کەس خۆیان دابووە بەر بێلایی دووکانێک. گەیشتمە کن وان گولەیەک هاتوو یەک لەوان وەعەرزی کەوت رانی بریندار بوو. ماشێنکی باری لەوێ راوەستابوو، بە کابرام گوت: وەرە ئەو بریندارە دەربازکە. کابرای شۆفێر گوتی: «سواری ناکەم بۆکوێی بەرم؟». بە ئەوانی دیکەم گوت: هەڵی گرن بێنن سواری کەن، خۆشم سەرکەوتم لە پەنا شۆفێر دانیشتم گوتم: بازۆ بۆ پێش دەفتەری حیزب. کابرا خۆی نەگرت. رۆیشتین. تەقە بەردەوام بوو کەس نەیدەزانی بۆچی تەقە دەکاو لەگەڵ کێ شەر دەکا؟

لەپێش دەفتەری حیزب عالەم کۆ ببۆوە، دەنگۆی سەیر بڵاو دەبوونەوە: وەک فلانکەسیان کوشت... ژن و منداڵی کوردەکانیان لەسەر چۆمی وەبەر دەس رێژداوە...... فلان ماڵیان تالاّن کردوەو...هتد. پرسیم: دوکتور قاسملو چی لێهاتوە؟ گوتیان لە ماڵی مامۆستا مەلا سالح-ە. کە چووم رێبەرانی ئەوم لەوێ کۆبوونەوە پەشۆکاوو بێ بەرنامە. مەلا سالح و کاک حەمەدەمین بە تەلیفون لەگەڵ مەلای عەجەمان (میرزا براییمی محرر) قسەیان دەکردو هەوڵیان دەدا تەقە رابگرن و چەکدار کۆبکرێنەوە. فایدەی نەبوو، دیار بوو پلان و نەخشەی عەجەمان زۆر لەوە قوڵتر بوو. پێشتر خۆیان بۆ شەر ئامادە کردبوو، کۆنە ساواکی وەک معبودی و مراد قەتاری و هی‌تر بەسەر چەکداری رووت و رەجاڵی عەجەماندا زاڵ بوون و ئاگری شەریان خۆش دەکرد. کوردەکان چونکە بە هیوای شەر نەهاتبوون بڵاو و سەر لێشێواو و نەیاندەزانی چ بکەن. تالاّن و راو رووت و گرەوگان گرتن دەست پێ‌کرابوو. ئەو کوردانەی هاتبوونە نەغەدە زۆربەیان ماشێنەکانیان لەگەرەکی عەجەمان دانابوو. عەجەم دەستیان کردبوو بە دزین و شاردنەوەی ماشێنەکان.

پاش باسێکی زۆر لە ماڵە مەلا سالحی هاتە سەر ئەو بڕوایە، پێویستە بەربەرەکانی بکرێ. بۆ ئەوەی سەرکوت بکرێن پێویستە چەکی قورس

بێنن. دوکتور قاسملو گوتی: «با کاک کەریم بچێتەوە مەهاباد دوو تۆپی گەورە بێنێ». بێ ئەوەی بیر لەوە بکرێتەوە چەکی قورس بۆ شەڕی مەیدان دەبێ. ئەگەر وابایە دەبوو نەغەدە وێران بکرێ. دوکتور گوتی: «جا کەوابە تۆ گیر مەبە ماشینێک پەیدا بکەو بڕۆ دوو تۆپی گەورە بێنە». هاتمە دەر دەبوایە بە پەسوێو بە مەیدان بەڵەکدا بڕۆم. دەبوایە جیپ یا لەندەوێر پەیدا بکەم. بە ماشینێکی سواری چوومە بالفچی. بە هەڵکەوت شیخ نجم‌الدینی غەوس‌ئاباد پەیدا بوو دەچووە مەهاباد. سواری کردم، دوای نیوەڕۆ گەیشتمەوە مەهاباد. چوومە پێش دەفتەری حیزب کاک ئومەرم دیتەوە کە بەرپرسی پادگان‌و ماشینەکانی سەربازخانە بوو. عالەمێکی زۆر لەپێش دەفتەری حیزب کۆ ببوو گوێراگری دەنگ‌و باسی نەغەدە بوون. گوتم: ماشێنێکی ئەرتەشی‌و تۆپێکی ۱۰۵ ئامادە بکاو لەگەڵ تۆپچی بکەوینە ڕێ. گوتیان: «ئەفسەری تۆپخانە تەنیا سەروان جاویدفەرە. ئەویش لەگەڵ مەلا ڕەسولی پێشنماز دمەقالی بوە، تۆراوەو چۆتەوە ماڵی‌و دانیشتوە». گوتم: ئێوە گوللە تۆپ‌و شۆفیر ساز بکەن من دەچم جاویدفەر دێنم. چوومە ماڵە کاک ئەحمەدی جاویدفەرو گوتم: وەختی تۆران‌و دڵێشی نیە، دەبێ بچینە نەغەدە ڕۆژی تێکۆشانە. گورج ڕاست بۆوەو خۆی ئامادە کردو چوینە پێش دەفتەری حیزب. ماشێن بە شۆفێرو تۆپەوە ئامادەی حەرەکەت بوو. کاک حامیدی گەوهەری پەیدا بوو. گوتی: «باشە ئەو ماشێنە بنزینی تێدایە، دەزانن چەندەی بنزین دەوێ؟». باش بوو چەند تەنکە بنزینی زیادیشمان هەڵگرت‌و کەوتینە ڕێ. باران دەباری هەتا پەسوێ ڕێگا خۆش بوو. لە پەسوێ تێپەڕین ماشێن حاسیە بوو. باران لێی نەدەکردەوە. گەڕامەوە بۆ پەسوێ دوو تراکتۆرم هێنان‌و بە زەحمەتێکی زۆر لە قوڕو چەڵپاو دەرباز بووین، لای بەیانی گەیشتینە بایزئاوی. لە ماڵە کاک سادقی ڕەحمەتی هاوڕێ‌و هاوکارو ئەندامی کۆنی حیزب لاماندا. ئاگریان کردەوە خۆمان وشک

کردەوەو نانو چامان خواردو کەوتینە رێ. دەمانچەیەکی حەوت‌تیری بچوکم بە رووتی دەبەر پشتێنابوو، لەم هاتوو چۆو پالْ پێوەنانو تەرو فوریەدا کەوتبوو ئێستاش نەدیتراوە.

تاو هەلْدەهات گەیشتینە بالْغچی. پێشمەرگە لەسەر رێگا بوون گوتیان: «دوکتور لێرەیە». کەچووم حەساری کاک عەولای حەسەنزادە هەر زمەی دەهات. بەرپرس‌و رێبەرانی حیزب نەغەدەیان بەجێ هێشتبوو هاتبوونە بالْغچی. کوردەکان لە نەغەدە بێ ئەزمو بێ سەرکردە کەوتبوونە دیفاع‌و هێرشی عەجەمان توندتر ببوو. تفەنگێکی دوور بێن‌دار کە جێگای نەدەدرزراوە فرزەی لەخەلْک بریبوو. هەرچی سەری وەدەر نابایە دەکوژرا.

چوومە ژووری‌و بە دوکتورم گوت: ئەوە تۆپ لێرەیە چی لێ بکەین؟ بوو بە باس‌و بیرو رادەربڕینی جیاواز: با جارێ تۆپەکە بشارینەوە دیار نەبێ. تۆپ‌و ماشێنیان بردە بناری بالْغچی کە نەی بینن. ماستاو کەرانی دەورو بەری دوکتور پێشنیاریان کرد بەر لەهەموو شت جارێ با دوکتور بروار بچێتەوە مەهاباد‌و لەو کێشەو هەرایە دوور کەوێتەوە. نەوەک خودا نەخواستە شتێکی بەسەر بێ‌و ئەم میللەتە کوردە هەتیوو بێ‌کەس بمێنێتەوە. رانک‌و چۆخەیەکیشیان بۆ ئامادە کردبوو، ئامادەی رۆیشتن.

بریاردرا، مەلا رەسول‌و سەید رەسول وەک مەسئولی پێشمەرگە بمێننەوە، وەزعی شەرو بەرگری رێک‌و پێک بکەن. دوکتور قاسملو لەگەلْ دەستەی دەوروبەری بچێتەوە مەهاباد.منیش هەرچەند هەلْپەسێرابووم وەک بەرپرسی سیاسی حیزبی دیموکرات لە نەغەدە بمێنمەوە. من ئیتر لەسەر دوکتور قاسملو گیر نەبووم‌و لەگەلْ دوو پێشمەرگە کەوتمە رێ بە پێیان بۆ نەغەدە. با ئەوەش بلێم سوپاسی ئەو هاونیشتمانیە بەناسراوەم لەبیر نەچێتەوە کاتێکی باسی ئەوەم کرد کە دەمانچەم لێ‌کەوتوە، ئەو جوامێرە دەمانچەیەکی ١٤خۆری لە قەدی خۆی کردەوەو لە پێشی دانام.

ئەمدەناسی بەلاّم پاش دوو سێمانگ رۆژێک لە مەهاباد هاتە لام. دەمانچەکەم وێداوە. چونکە ئەودەم کاک سامی بە کاک ئەبی قادریدا دەمانچەیەکی نێرگانی کورتی زۆر جوانی بۆ ناردبووم.

لەپردی بالغچی پەڕیمەوە دیتم ئەوە ژنو منداڵو خەڵکی بێچەک بە گریانو رۆرۆ لە نەغەدە وەدەر دەکەون. رامگرتن، دڵخۆشیم دانەوەو گوتم: ماڵو حاڵی خۆتان بەجێ مەهێڵن، بۆ کوێ دەچن بگەڕێنەوە. هێندێک لەگەڵ من گەڕانەوە. دیتم ئەوە رەحمانی حاجی ئەحمەدی مەسئولی تەشکیلاتی دوکتور قاسملو بە بن دیواریدا بە دیڵە دزە بەرەو بالغچی دەڕوا. گوتم: ئەوە بۆ کوێ دەچی؟

- کەس لە نەغەدە نەماوە، هەموو رۆیشتوون، ئەدی چ بکەم؟

- زۆر عەیبە، تۆ مەسئولی تەشکیلاتی، ئەو مێتینگ و هەرایە لەسەر بڕیاری تۆ ساز بووە. بگەڕێوە، لە دەفتەری حیزب مەبزوو، ئێستا مەلا رەسوڵو سەید رەسولیش دێنەوە.

رەحمان لەگەڵ من گەڕاوە چووینە دەفتەری حیزب. وەزعەکە بەرەو ئالۆزی دەچوو. خەبەری کوشتنی ئەوکوردانەی لەگەڕەکی عەجەمان دەژیان بلاّو دەبۆوە. گرتنو گرەوگان لە هەر تک لاوە دەست پێکرابوو. مەلا رەسوڵو سەید رەسوڵ هاتنەوە نەغەدە، هەموو فکرو تەقەلا ئەوە بوو کە جێگای تفەنگە دووربینداەکە بدۆزنەوە. کە چوومە دەفتەری حیزب، ژوورێک لە سەرەوەی دەفتەر پڕ کرابوو لە عەجەمی رەشو روت گوتم ئەوانە چ لێدەکەن؟ سەید رەسو گوتی: «ئەوانیش کوردیان زۆر گرتوون، رایان دەگرین». چووینە ماڵی مەلا سالح عالەمێکی زۆر لەوێ کۆ ببۆوە.

کومیتەی ناوەندی حیزبی دیموکرات رۆژی یەکی بانەمەڕ لەسەر شەڕی نەغەدە بەیاننامەیەکی بلاّو کردبۆوە.

سەید رەسو لەگەڵ هێندێ پێشمەرگە چەند حەساری بەرەو قەلات بڕیبوو بەو هیوایە کە تفەنگچیە دووربیندارەکە بدۆزێتەوە. دەیانگوت

لەسەر قەلاْت لە عەنباری ئاوی‌دایە. دوای نیوەرۆ هاتەوە گوتی: محەمەد ئەستانی کوژرا. خەبەرێکی گەلێک ناخۆش‌و داخدار بوو. کورێکی گەنج، ئازاو لەبەر دلاْن. ورەی چەکدارەکان کز ببوو. لە مالی مەلا سالحەوە پەیتا پەیتا تەلیفونمان دەکرد بۆ میرزا برایمی محرر کە شەر رابگرن‌و براکوژی نەکرێ، جوابیان نەدەدایەوە. تەمەس لەگەلْ حەسەنی ورمێ پەیوەندیان گرتووەو داوای یارمەتیان کردووە. لەشکری ٦٤ی ورمێ تانکی ناردوون‌و چاوەڕوانی هاتنیان دەکەن. دوای نیوەرۆ بوو رۆژی ٢ی بانەمەری ٧٩ خەبەریان هێنا کە تانک هاتنە نێو شار. بەلاْم کوردەکان پێیان وابوو کە تانکی ئێمەن‌و لە مەهابادەوە هاتوون. ئەرتەشیەکان لە محەمەدیارەوە رەسمی مەلا شیخ عیزالدینیان بە تانکەکانەوە نووساندبوو تا خەلک بە فریو بچێ. رەسمی مامۆستا ئەوەندە خێرەشی بۆ کورد بە ناوچاوە بوو.

تانگ گەیشتە نێو شارو تەقەیان دەست پێکرد. سەید رەسو زۆر بە گورجی لەمالی مەلا سالح ئارپیچی دەپالْ یەک ناو ئامادەی کردوو دای بە پێشمەرگەیەک کە گۆیا شارەزاو وەستای ئارپیچی وەشاندن بوو. خودا هەلْناگرێ زۆریشی ئامۆژگاری کرد کە چ بکاو چۆن بەکاری بێنێ. ئەوانەی لەوێ بوون پشوویەکیان هاتەوە بەرو چاوەڕوان بوون کە ئێستا تانک وەسەر یەک دەگەرێ. زۆری پێنەچوو تەقەی ئارپیچی دەنگی دایەوە. بەلاْم نەک تانک دووکانی وەسەر یەک گیرابوو. تانگەکان ئیدارەی ئاماری نەغەدەیان ئاگر تێبەردا. رۆژی ٣ی بانەمەر چەکداری کورد لە شاریدا کەم ببوون. سەید رەسو هات گوتی: «جاوید قەر برینداو بوو بەرێم کرد بۆ بالْغچی». خەبەرێکی ناخۆش بوو. سەعات حەوتی ئێواری لەگەلْ مەلا رەسول‌و سەید رەسو قەرارمان دانا کە بمێنینەوەو دژی تانگەکان کە بە نێو گەرەکی کوردان‌دا دەسورانەوە ئارپیچی بەکار بێنن. تەواوی رۆژ کاک ئەحمەدی خەزورم دەهات دەیگوت: «با ژن‌و مندال برۆن‌و لێرە نەمێنن»، ئەمدەهێشت دەمویست کاپیتان قادری بەرێ بکەم،

ئەدەرزیی دەیگوت: بەجێت ناهێلم. سەعات ٩ی ئێوارە بوو لەگەڵ مەلا رەسوڵ و سەید رەسو لە خەیابانی بالغچی لەنیزیک ماڵی خەزوورم راوەستابووین، تانگێک بە پێش ئێمەدا هات تا دەرەوەی شاری رۆیشت‌و گەرایەوە. لەخۆرا تەقەی دەکرد. من گوتم: زۆر هیلاکم دەچم لە ماڵی خەزوورم تاوێک دەنوم، ئەگەر شتێک بوو خەبەرم دەنێ. دوایە چوومە دەفتەری تەشکیلاتی حیزب بە کاک سەعید کویستانیم گوت: زۆر هیلاکم سێ‌رۆژە نەنوستوم. لە ماڵی کاک ئەحمەدی تاوێک دەنوم، مەلا رەسوڵ‌و سەید رەسو لێرەن‌و ئێستا دێنە لات. کە چووم ماڵە کاک ئەحمەدی پڕ بوو لە خەڵک. لە دیوێکی راکشام تازە چاوم گەرم دەکرد، کاک ئەحمەد وەخەبەری هێنام‌و گوتی: «ژن‌و منداڵی مەلا ساڵحی رۆیشتن، نەغەدە کەسی تێدا نەماوە. با ئەو ژن‌و منداڵانەی ئێمەش برۆن». دیتم فایدەی نیە خۆیان کۆکردەوە‌و بەرێ‌یان کردن. کاک حەمەدی سەروکانی و کاک ئەحمەدی خەزوورم و مەلا سەید ئەحمەد‌و دوو سێ کەسی دیکە مانەوە. لای بەیانی کاک سەعید کویستانی هات گوتی:

- کاکە تۆ لێرە چ دەکەی؟ کەس نەماوە. نەغەدە چۆڵ بوو.
- ئەدی مەلا رەسوڵ‌و سەید رەسو چی‌یان لێهات؟
- ئەوانیش رۆیشتن، ئێمەش ئەوە دەرۆین، دەفتەریش چۆڵ کراوە.

بەیانی بەردابوو هەستام زۆر بە زەحمەت کاپیتان قادریم رازی کرد کە بڕوا، لەگەڵ کاک ئەحمەدی بەڕێم کردن. مەلا سەید ئەحمەد لەگەڵ من مایەوە چوینە ماڵی مەلا ساڵحی. هێندێ خەڵک لەوێ کۆ ببوونەوە، خەبەرو دەنگۆی ناخۆش بڵاو دەبوونەوە، خەبەریان هێنا گوتیان: «دەفتەری تەشکیلاتی حیزب ئاگر دراوە». بە مەلا سەید ئەحمەدم گوت: تکایە بچۆ بزانە راستە یان نا؟ مەلا سەید ئەحمەد رۆیشت کە خەبەر بێنێتەوە، بەخوای پاش چەند رۆژ لە مەهاباد دیتمەوە. کە مەلا سەید

ئەحمەد تەهاتەوە هەستام گوتم: با بچمە دەر بزانم ئەو دنیایە بۆ وێران بوو. ئاغای خادمی لەگەڵم هات. کە چووین دەفتەری حیزب نەسووتابوو. بەلام ئەم دەوروبەرە هەمووی چۆڵ بوو. لە ماڵێک دەگەڕاین کە تەلەفونی هەبێ بەڵکو بتوانم لەگەڵ میرزا برایمی محرر قسە بکەم‌و داوای لێ بکەم کە پێشی تالانی ماڵە کوردەکان بگرێ. چونکە ئیتر بەربەرەکانی نەمابوو. ماڵێکمان دیتەوە کە گۆیا تەلیفونی هەیە. کە وەژوور کەوتم بەجارێک حەبەسام. دیتم سەروان جاویدفەر بە بریندارى لە ژوورێکدا درێژ بووە. لە کاتێکدا سەید ڕەسو گوتبووی بەرنم کردوە. دوو برین پێنچی بۆکانیش لەوێ بوون، لام وایە برادەرانی کۆمەڵە بوون. ماشینێکی پەیکان لە حەساری بوو، بە خاوەن ماڵەکەم گوت: تکایە گورج ئەوانە بگەیێنە بالغچی. گوتی: «ناتوانم، ماشینەکەم بنزینی نیە».

- کاکە ڕۆژی ئەو قسانە نیە. ئەوانە دەگیر دەکەون. سویچی ماشینەکەم دەیە، ئەگەر تۆ نەیانبەی خۆم دەیانبەمەوە مەهاباد.

ئیتر کابرا لە ترسی ماشینەکەی سوار بوو. جاوید فەرو برا برینپێنچەکانیشم سوار کردو بەرنم کردن. دەگەڵ خادمی گەرامەوە ماڵی مەلا سالح. خەڵک بلاوەی کردبوو. کەم کەس لە نەغەدەدا مابوو.

لەو کاتەدا مەشەدی حەسەن قولی هات. مەشدی حەسەن قولی عەجەمێکی خەڵکی زولم‌ئابادی نێزیک عەجەملی‌یان بوو. لە زەمانی حکومەتی مصدق-ەوە لەگەڵ ڕێکخراوی حیزب کاری دەکرد. پیاوێکی ئازاو جوامێرو بە دەسەلات بوو. لەگەڵ ئاغاکانی دەوروبەر بەربەرەکانی دەکرد. وەختی خۆی زۆرم یارمەتی دابوو، ئەویش پاڵی وەبرادەرانی حیزب دابوو. مەشدی حەسەن قولی تاوێک دانیشتوو گوتی: «ماشینم هیناوە هەستە با بڕۆین. بچینە ماڵی ئیمە پاشان دەتگەیێنمەوە مەهاباد. سەگبابێک نیە پێشت بگرێ».

گوتم زۆر سوپاس من ئیرە چۆن بەجێ بێلم. تۆ برۆ من جارێ لێرە

دەبم. ئەگەر پێویست بوو خەبەرت دەدەمێ.
مامۆستا مەلا سالح گوتی: «مەشدی ئەتۆ زۆر پیاوی چاکی، هەمیشە لەگەڵ کوردانو دۆستی کورد بووی. بەڵام عەیبێکت هەیە، کومونیستی کۆمونیست».
مەشدی گوتی: «مامۆستا چۆن شتی وا دەفەرموی، من ئەوا ٢٨ساڵە مریدی کەریمی حیسامیم، چۆن کومونیستم؟
مامۆستا گوتی: «تەواوە ئەوە سابیت بوو کە کومونیست نی‌ا».
مەشدی ڕۆیشت. سێ پێشمەرگەی حیزبی دیموکرات لەکن من مابوون. یەکیان محەمەد بۆکانی بوو کە لە عیراقیش لەگەڵمان بوو پاشانیش لەگەڵ تاقمی حەوت کەسە ڕۆیی. ئەوانی‌تر عەولا بارزانی‌و کوریکی گەنجی مەهابادی بوو بە ناوی قاسم. گوتیان کاک کەریم: «کەس نەماوە ئێمە چ بکەین؟».
- چۆن کەس نەماوە... ئەوە نیە ئێمە ماوین... بۆ ئێمە کەس نین؟ لێرە دەمێنینەوە با بزانین چۆن دەبێ. محەمەد بۆکانی گۆتی: «من نامێنمەوە دەڕۆم». قاسم و عەولا بارزانی گوتیان ئێمە دەمێنینەوەو بەجێت ناهێڵین.
ڕۆژی ٥ی بانەمەڕی ١٣٥٨(١٩٧٩/٤/٢٦) لە شەڕی نەغەدە ١٧کەس لە ماڵی مەلا ساڵحی مابووینەوە. ١٢ تفەنگمان هەبوو دەگەڵ شیست تیری قاسمی. ئاگاشمان لەوە نەبوو داخوا هیچ کوردی چەکداری دیکە یا بێ چەک لە نەغەدە ماونەوە یان نە. ئەوەندەمان دەزانی دەوروبەری ماڵی مەلا سالح چۆل ببوو. وەک لەبیرم بێ ئەمانەی خوارەوە مابوونەوە:
مامۆستا مەلا سالح، خالە مینی بەرزنجی، دوکتوری کوری خالەمینی، کاک نومەری ئیلخانیزادە، دوکتور محەمەدی کوری مەلا ساڵحی، حوسێنی کوری مەلا ساڵحی، عەولا بارزانی، قاسم، لام وایە موحسینی کوری مامۆستاش مابۆوە. ئەوانی دیکە ناویان لەبیرم نەماوە.

قاوڵتیمان دەخوارد، دوکتور محەممەد وەک ئەندامی کۆمەڵە هەڵی بۆ هەڵکەوتبوو بەسەر حیزبی دیموکراتدا هاتەخوار: «شەڕیان ساز کردو خەڵکیان بەجێ هێشتو کەسیان نەیوێرا لە نەغەدە گیر بێ‌و...».

گوتم دوکتور: وەختی ئەم قسانە نیە، ئەوەتا من لێرەم و نوێنەری حیزبی دیموکراتیشم. با بیر لە شتی‌تر بکەینەوە.

کورەکانی مامۆستا مەلا ساڵحی دەیانگوت با بڕۆین‌و نەغەدە بەجێ بێلین. مامۆستا دەیگوت: «بەقسەتان ناکەم، دەبێ لەم خانوەدا بکوژرێم‌و ئێرە بەجێ ناهێڵم». دم بە دمەکەیان توند بوو، کورەکان دەیانگوت: «تۆ لەبەر ئەو فەرش‌و نێو ماڵ‌و خانوبەرەیە نارۆی. هەمورمان بە کوشت دەدەی. ئێمە دوکتورو موهەندیسین، کار دەکەین، ماڵت بۆ پەیدا دەکەینەوە». مامۆستا دەیگوت: «لەبەر شەرەف‌و کەرامەتی کوردایەتی نارۆم. ئێرە بۆ عەجەمان بەجێ ناهێڵم». پاشان مامۆستا رووی لەمن کردو گوتی: «ئەری تۆ دەڵێی چی، چ بکەین، بڕۆین یا بمێنینەوە؟».

گوتم: نابێ بڕۆین، ئابڕومان دەچێ، لێرە دەمێنینەوەو دیفاع دەکەین. نامەوێ باسی ئەوە بکەم کە ئەو هەڵوێستەی من چەندە کاری کردە سەر خاڵە مین‌و مامۆستا مەلا ساڵحی. چ تۆوێکی دۆستایەتی‌و موحیبەتی لە نێوان ئێمەدا چاند. بۆ نمونەی ئەم دۆستایەتیە لێرەدا هەودای باسەکە دەپسێنم‌و دەقی وەرگێراوەی نامەیەکی مامۆستا مەلا ساڵحی رەحمەتی بڵاو دەکەمەوە کە پاش ٣ساڵ لە سولەیمانیەوە بۆی ناردبووم:

### ئەمەش دەقی وەرگێراوەی نامەکە:

«بە ناوی خوای تواناو میهرەبان.. زانای پایە بەرز، دۆستی بەشەرەف‌و بەرێز جەنابی ئاغای میرزا کەریمی حیسامی.

دوای گەیاندنی سلاوی دۆستانەو ئەنجامی ئەرکی دۆستایەتی خالیسانە، هەمیشە سلامەتی‌و بەختەوەری ئەم دۆستە ئازیزو بەرێزە لە

خوای یەکتا داوا دەکەم. هیوادارم هەمیشە شادو خەندەدارو بەکەیفو دڵخۆش بی.

برای خۆشەویستم، ماوەیەکی زۆر بوو لێتان بێخەبەر بووم. هەمیشە چاوەروانی خەبەری سلامەتی ئەم دۆستە بەرێزە بووم کە بە خۆشیەوە قاسیدی خۆشخەبەر ئاغای میرزا وسینی کرمانجی تەشریفیان هێنا. لەگەڵ ئەوە کە دیتنی ئەو بوو بە هۆی خۆشحالیم. مزگێنی سلامەتی ئێوەشی بۆ هێنام‌و گوتی پێکەوە لەشوێنێک دەژین. بەراستی موژدەی خەبەرێکی شادی هێنەر بوو. گوتم خۆش بەحاڵت کە لەگەڵ مرۆڤێکی تەواوو سیاسەتمەدار رەفیقی کە لە زانست‌و تەجرەبەو سیاسەتی ئەو بەهرە وەردەگری. خۆشەویستم ئەگەر لە من دەپرسی شوکر ساخ‌و سلامەتم. وەک دەزانی لە سایەی بەرەکەتی سیاسەت‌و موحیبەتی ئێوە لە ئاست نەغەدە سەروەت‌و سامان‌و موڵک‌و کارو دارایی‌و نیشتمانی خۆم بەجێ‌هێشتووەو ئێستا لەوڵاتی عیراق کە بۆتە پەنای غەریبان بوومە پەنابەرو شەوو رۆژ بە یادی خێری دۆستان‌و دوعای سەرکەوتن بۆ خەباتگیرانی بەشەرەفی کورد کە دژی رژێمی خوێنخۆری خومەینی شەر دەکەن کات دەبەمە سەر.

کەریم گیان. هەرچەندە تۆ ئیمانت نیە. بەڵام بزانە بە گوێرەی ان مع العسر یسرا دوای نارەحەتی کە بەخەگبری خەلکی کورد بووە شادی و ئازادیش هەر دێت. بەیادی ئەو رۆژەی کە بێجگە لەمن تۆو چەند کەس لە کورەکان‌و هەشت کەسی‌تر کەس لە نەغەدە نەمابوو هەموو لەترسی گوللەی تورکان رایان کردبوو. لە رۆژێکی تاڵی ئەو کاتەدا بێ‌کەیف دانیشتبووی. گوتم: حیسابی ئەوە دەترسی؟ لە وڵامدا گوتت: ناترسێم، بۆیە نارەحەتم کە ئەمرۆ هێشتا ریشم نەتاشیوە. بەیادی نوتق‌و وتارو خەباتی پیاوانەت لە هەموو کۆبوونەوەکانی حوسنی‌نیەتدا کە بەغاغەی هەموویان پلانی رژێمی خومەینی بوو نوێنەرانی رژێم‌و ئاخوندی فیلباز

هەرچی دەیانگوت درۆ بوو. وەبیرت دێ لە کۆبوونەوەی حوسنی نیەت لە ورمێ چ بەلایەکت بەسەر ئەو جوجە ئاخوندە میزەر رەشە هێنا؟ بەیادی ئەو رۆژانە کە بە درۆ دژی مستەفای هیجری کاندیدای حیزب بۆ نوێنەرایەتی مەجلیسی شورای ئیسلامی خۆت وەک نوێنەری شارستانی نەغەدە ناساندو شەوو رۆژ هەوڵمان بۆدای‌و ئێمەت لەبەرچاوی حیزبی دیموکرات رەش کرد. لەپەر بەبێ ئاگاداری خەڵک بە قازانجی مستەفای هیجری خۆت کێشایەوە. بە یادی قسە خۆش‌و بە نامەکانت کە جارو بار کوفرت دەکرد، بەلام بەو خودایە لەم دنیایەدا هیچ کافرێکم بەقەدرایی تۆ خۆش ناوێ. بە یادی قسە خۆش‌و گاڵتەکانت لە ئاست شۆرشی کوردستان کە دەتگوت: «هەمووی نشەیە». کاک کەریم وەک بیستوومە تا ئێستا چەند جار خۆت گەیاندۆتەوە بولغارستان. ئیشەڵلا ماڵو منداڵت هەموویان ساخ‌و سلامەتن. دەشزانم لە چەند دانیشتنی کەیف‌و رابواردنی بێ‌دینی بولغارستاندا بەشدار بووی کەیفی خۆت تەخت کردووەو بە هێزی تەواوو بە خەیاڵی ئاسودەوە بۆ خەباتی شێلگیر دژی رژیمی خومەینی هاتویەوە کوردستانی خۆشەویست.

کاک کەریم مەبەست لە رتەی درێژو گاڵتەو حیکایەتی رابردوو ئەوە بوو، دەمویست بە درێژی لەگەڵت بدوێم. چونکە لە زانستی بەلاغەدا یەک لە نیشانەی فصاحت‌و بلاغت ئەوەیە کە لەگەڵ دۆستی بەراستی زۆر قسە بکەی. بەلام قسەی خۆمان بێ تۆ کەسێکی سیاسی. دەڵێن پیاوی سیاسی کەسی بەراستی خۆش ناوێ. دۆستایەتی سیاسەتمەدار بە گوێرەی مەسڵەحەت‌و پێداویستیەتی، ئیتر نازانم تۆش لەوانەی یا منت خۆش دەوێ. هیوادارم لە ریزی بێ‌وەفایان نەبی. کاک کەریم ئیتر زەحمەتت نادەم خودا حافیزی دەکەم، ئێوە بە خودای تەعالا دەسپێرم. سلاو موحیبەتی بەراستی من قبول بکە. هەموو برایانی پێشمەرگەی حیزب کە لە ژێر رێنوێنی ئێوەدا تفەنگ‌و چەکی شەرەفیان هەڵگرتووەو

هەموو ئەو کوردانەی کە خزمەتی ئێوە دەکەن سڵاویان دەگەیێنم. سەرکەوتنی هەمووان لە خودای یەکتا دەخوازم. بە هیوای دیدارو ئازادی کوردستان.

مەلا ساڵحی رەحیمی
١٣٦١/١٠/٢٧

وەک لەبیرم بێ، کورەکانی مامۆستا دوویان رۆیشتن. رۆژی هەوەڵ بێ‌شەرو تەقە رامانبوارد. بەڵام کارەساتێکی ناخۆش رووی‌دا. جارویار یەک دوو برادەر دەچوونە دەر کە تەماشای دەورو بەر بکەن‌و خەبەرێک بزانن. عەجەم دەستیان کردبوو بە تالانی خانوەچۆلەکانی کورد. کاک ئومەری ئیلخانیزادە وەدەر کەوت کە سەیرێکی دەورو بەر بکاو بزانێ چ باسە. کلاشنیکۆفێکی زۆر جوانی قونداغ ئاسنی پێ بوو، زۆری پێ‌نەچوو بێ‌تفەنگ گەرایەوە، بزرکاو سپی هەڵگەرابوو. واقمان ورما... ئەوە چیە کاک ئومەر کوا تفەنگەکەت؟

گوتی: «لەم لا دیوارە بامداوە (ناوی کوردێکی هێنا لە بیرم نەماوە) ئەم کوردە لەگەڵ چوار عەجەمان سواری سەرم بوون‌و تفەنگەکەیان لێ‌ئەستاندم، گوتیان برۆ ناتکوژین».

رۆژی هەوەل لە وەتاخی سەرێ‌و لەبەر پەنجەرەکان مەتەرێزمان ساز کردن‌و بریارماندا کە ئەگەر بێنە سەرمان بەرگری بکەین. نان‌و چێشتێکی باشمان ساز کرد. نوێژی شێوان بوو. مامۆستا مەلا سالح گوتی: «با نوێژەکە بە جەماعەت بکەین». بێجگە لە خالە مین کەس نەبوو نوێژی لەگەڵ بکا. چوونە دیوێکی دیکە نوێژیان کردو هاتنەوە لای ئێمە. گوتم: مامۆستا شوکر ئەهلی جەماعەت کەم بووە، لە حەڤدە کەس هەر دوویان نوێژی دەکەن.

- کافر، لەم حاڵەدا، جا ئەوە قسەیە؟

شەو بە گاڵتەو قسەی خۆش رامانبوارد. دوکتور بەرزنجی کوری خاڵەمین، لە شیروخورشید برینداری کوردیان لەبەر دەستی هێنابوە دەریٖو کوشتبوویان. نازانم چۆن دەرباز ببوو خۆی گەیاندبوە ماڵی مەلا ساڵحی. زۆر دەترساو باسەکەی هەر دەهێناوە سەر رۆیشتن.

رۆژی سێیەمی مانەوەمان، مەلا قەسیمی رەحمەتیو کورەکەی هاتنە لامان. دوو رۆژ بوو بە تەنیا لە خانوەکەی خۆی شەری دەکرد. خانوەکەیان ئاگر تیٖبەردا، بە قونە شەر بە چەکەوە خۆی گەیاندە لای ئێمە. لای نیوەرۆ ئاغای رازیو ئاغازادە هاتن. نانو ماستیان بۆ هێنابووین. مەلا ساڵح نامەیەکی نووسی بۆ مەلای عەجەمان، نامەکەیان برد بەلاٖم ئیٖتر نەهاتنەوە. رۆژی چوارەم لاتو سەر سەری قەرەپەپاخ پەلاماریان هێنار بوو بەشەر. نانو خواردەمەنیمان دەهات کەم بیٖ. یەکدوو ماڵە دراوسیٖی مامۆستا رایان کردبوو هەموو شتیٖکیان بەجیٖ هیٖشتبوو. یەک دوو کەسم لەگەڵ خۆ بردو چووم چوار پینج مریشکمان گرتو نانو پیٖخۆریٖکی زۆرمان هیٖنا. مریشک کوژرانەوە. گوتم مامۆستا خۆت دەزانی نا عیلاجی حەرامی حەلاڵ دەکا. ئیٖستا ئەم مامرگەلە حەلاڵن. مامۆستا گوتی : «کورە هەرچی تۆ دەیکەی حەلاڵە». ئەو رۆژە تا سەعاتی دەی شەو شەرو بوو. ئیٖمە فیشەکی بەخۆرایمان نەداویشت. شیست تیری قاسمی عەجەمی تۆقاندبوون. لای بەیانی هیٖرشیان هیٖنا، بە بلیٖندگۆ هاواریان دەکرد : «ئەگەر تەسلیم نەبن خانوەکە دەتەقیٖنین». سەعات ١٢ی نیوەرۆ بوو لە دەرگایان دا، بانگیان کرد. دەرگا بکەنەوە. لە حەساریٖ دامەزراین، دەرگا کردنەوەی چی. پاشان یەکیٖک بانگی کرد : «جەنابی مامۆستا من ئیرەجی تەبریزیم. لەگەڵ نوێنەری ئایەتولا تالەقانیو یاریدەدەری وەزارەتی کشور هاتوم. مامۆستا دەنگی کابرای ناسیو دەرگای کردەوە. ئاغای تەبریزی فەرمانداری تەوریٖز، درەخشان یاریدەدەری وەزارەتی نیٖوخۆ، ئاغای سەیفی فەرمانداری مەراغە دەگەڵ

کابرایەکی زەلامی سمێل فشی ڕەشتاڵەی سینگ‌و باسک کورتراوو پۆلێک موجاهیدی سەربەتاڵەقانی وەژوور کەوتن. کابرای سمێڵ فش کە جلی نیزامی لەبەردابوو خۆی ناساند: «سەرگورد جەوادی موئەزین» دانیشتوو ڕەسمێکی خۆی دەرهێنا کە لەگەڵ خومەینی ڕاوەستابوو، دەستی پێکرد. گوتم: جارێ لەو حیکایەتە گەرێ، ئەم لات‌و سەر سەریانە لە دەوری ماڵی مامۆستا دوور خەوە، پاشان قسان دەکەین.

موجاهیدەکانی سەرگورد، چەکدارە عەجەمەکانیان لە دەوری ماڵی مەلا ساڵحی ڕاونا. پاش قسەو باسێکی زۆر ئاغای تەبریزی پێشنیاری کرد کە بچینە فەرمانداری‌و لەسەر برانەوەی شەڕو هێدی کردنەوەی وەزعی نەغەدە بدوێین. من‌و مەلا ساڵح‌و خالە مین لەگەڵ سەرگوردو درەخشان‌و تەبریزی وەدەر کەوتین بۆ فەرمانداری. هێندێ لات‌و سەر سەری قەرەپەباخ لە دەوری ماڵی مامۆستا کۆببوونەوەو خەریک بوون بە گژ مامۆستادا بچن. سەرگورد وەک پیاوان سەردەستەکەیانی وەبەر شەقاندا. ئەوانی‌تر ڕایانکرد. کە دەچووین بۆ فەرمانداری دیتمان عەجەم بە پیکاب‌و عارەبانەو بە کۆڵ شت‌و مەکی ماڵە کوردەکان بە تاڵان دەبەن. بە سەرگوردم گوت: ئەوتا ببینە ئاوا کوردەکان تاڵان دەکەن. سەرگورد ماشێنی ڕاگرت‌و پێشی گرتن. شت‌و مەک‌و بارەکانیان بردە مزگەوتێک‌و سەربازی لەسەر دانان. پاشان پێم‌گوت: لەو کۆلانانەی پێش گەرەکی کوردان موجاهید دابنێ کە ماڵەکان تاڵان نەکرێن. چووینە ئیدارەی فەرمانداری. پتر لە هەزار کەس لەپێش فەرمانداری کۆ ببوونەوەو دژی مەلا ساڵح شوعاریان دەدا. پاشان قوڵی‌خانی پوزچلو، لەگەڵ ئاغای ڕازی‌و ئاغازادەو چەند کەیخوداو ریش سپی نەغەدە هاتن‌و دەستکرا بە قسەو لێکدانەوەو دۆزینەوەی ڕێگا بۆ ئاسایی کردنەوەی بارودۆخی نەغەدە. ئێمە لەو قسەو باسانەدا بووین. سەعاتی شەشی ئێوارە سەرهەنگ زەهیرنیژاد فەرماندەی لەشکری ٦٤ی ورمێ پەیدا بوو.

گوتی: «ئێستا بە هێلی کۆپتەر بە هەموو سندووس‌دا گەراوم. پێشمەرگەی دیموکرات لەگەڵوان‌و لەقارنەو خەلیفان‌و مەحمەشە کۆ بوونەوەو ئەم شەو بەسەر گوندی عەجەماندا دادەدەن».
درۆیەکی شلخدار. سەرهەنگ کاتێ ئەو قسانەی دەکرد کە لەگوندی ئاڵیاوێ بە هێلی‌کۆپتەر تەقەی لە خەڵک کردبوو، کوری کویخا محەمەدی کوشتبوو، هاتبوە نەغەدە ئەم درۆیانەشی ساز کردبوو. گوتم: ڕاست نیە، پێشمەرگەی دیموکرات لە هیچ گوندێکی کۆ نەبوونەوە، بەسەر هیچ گوندێکی‌دانادەن. ئێمە شەرخواز نین، بۆشەریش نەهاتبووینە نەغەدە. باسەکەمان درێژەی کێشا. ئاخرەکەی گوتیان: «ئەگەر حیسامی نەچێ پێشمەرگەکانی دیموکرات لە گوندی قارنەو لەگەڵوان بلاوە پی‌نەکا وتوریژ ناکەین. با ئەم شەو بچێ بلاوەیان پێ بکا. سبەی کۆدەبینەوە». سەرگوردی نوێنەری تالەقانی پێشنیاری کرد کە سواری ئامبولانسی گروهی تالەقانی بم‌و بچمە گەڵوان. گوتم دەچم بەوشەرتەی لەو دەستەی ئیمدادی تالەقانی یەکێکم لەگەڵ بێ‌و بزانێ کە سەرهەنگ درۆ دەکاو پێشمەرگەی ئێمە کۆنەبوونەوە. بەراستیش پێشمەرگەی حیزبی دیموکرات نەبەرنامەی شەرو نە بەرنامەی بەرگریان هەبوو. ئەوە سەرەتای شکانی ئێمە بوو لە خەباتی دژی رژیمی خومەینی‌دا.
پێشنیارەکەم قبول کرد، چووینەوە ماڵی مامۆستا. سەعات هەشتی شەو ئامبولانسیان هێنا. بە خەتێکی سووری درشت لێی نووسرابوو: «امداد گروه طالقانی» موجاهیدێک‌و شۆفیریش هاتبوون. من‌و دوکتور بەرزنجی‌و کاک نومەری ئیلخانیزادە لەگەڵیان سوار بووین‌و بەرەو باڵفچی‌و گەڵوان کەوتینە ڕێ. لە ڕێگادا کاک نومەرو دوکتور بەرزنجی بە نۆرە بە میکرۆفۆن هاواریان دەکرد: «برایانی پێشمەرگە تەقەی نەکەن کاک کەریمی حیسامیمان لەگەڵە». تا گەیشتینە نیزیک گەڵوانێ بە نۆرە هاواریان دەکردو جارو بار میکرۆفونەکەیان دەدا بەمنیش.

لە ڕیزە بەردەکانی پێش گەڵوانێ پێشمەرگە لێمان ڕاپەڕین و دەنگیان داین. دابەزیم و بانگی سەرپەلی پێشمەرگەکانم کرد. سۆراغی مەلا ڕەسوڵ و سەید ڕەسوم پرسی. گوتیان: «ئەوە لەگەڵوان لە ماڵی سەید حەسن-ین.

بۆ شارەزایی دوو پێشمەرگەم سوار کردو چووینە گەڵوان. ماڵی سەید حەسەغان دیتەوە. کە چووم مەلا ڕەسوڵ و سەید ڕەسو خۆیان لێ بە عەرزی دادابوو. دیاربوو جێگاکەشیان کرێن نیەا. دەستەی رادیۆ تەلەڤیزیونی مەهابادیش هاتبوون کە مصاحبەم لەگەڵ بکەن. لە وتو ویژ لەگەڵ تەلەڤیزیونی مەهاباد، حزبەکانی ساز بوونی شەڕو پیلاتی کۆنە ساواکیەکان و پەلاماری لەشکری ٦٤و ناردنی تانگ و دەربەدەری خەڵک و تالانی ماڵە کوردەکان و هاتنی موجاهیدینی تالەقانی و درۆیەکانی سەرهەنگ زەهیرنیژادم بە درێژی ڕوون کردەوە. شەو لەگەڵوان خەوتین و بەیانی زوو گەڕاینەوە بۆ نەغەدە. ئیتر تەشمزانی مەلا ڕەسوڵ و سەید ڕەسو چی‌یان کردوو چی‌یان بەسەر هات و کەنگێ گەڕانەوە مەهاباد. گەیشتینەوە ڕاست ماڵی مەلا ساڵحی، بەدوکتور بەرزنجی و کاک ئومەری ئیلخانیزادەم گوت: ئێوە لێرە دابەزن و بچنە ماڵی مامۆستای تا من دەچمە شیروخورشیدو سەرگوردو تەبریزی دەبینمەوە. دوکتور بەرزنجی گوتی: «منیش هەر دێمە شیروخورشید»، کاک عومەریش دانەبەزی. ڕۆیشتین، من لە پێشەوەی ئامبولانسەکە سوار ببووم و کوت و شەلوارم لەبەردابوو. عەجەمی نەغەدە لەم‌بەرو بەری شەقام و کۆلان ڕاوەستابوون، پێیان وابوو من نوێنەری تالەقانیم. گەزێک ملیان نەوی دەکردو سلاویان دەکرد. لە شیرو خورشید ژوورێکی تایبەتی بۆ دوکتورو برینپێچەکانی گرۆی تالەقانی دیاری کرابوو، لەسەر دەرگاکەش نووسرابوو: «گروە امداد طالقانی». ئێمە ڕاست چووینە ئەو ژوورە. دوکتورێکی هیندی کە لەوێ کاری دەکردو هاوکاری دوکتور بەرزنجی بوو هاتە ژوورێ، بە دوکتور

بەرزنجی گوت: «ئەوە بۆ هاتویە ئێرە؟ دوو رۆژە لێت دەگەڕێن، چکارت بێرەیە؟». کە دوکتوری هێندی ئەوەی گوت، دوکتور بەرزنجیو کاک ئومەری ئیلخانیزادە چرژان. گوتیان: زەحمەتە نەجاتیمان بێ. گوتم: پێم گوتن دابەزنو مەبەنە ئێرە. ئێستاش ئێوە هیچ مەڵێن، من ناناسن، وەک نوێنەری تالەقانی قسە دەکەم. چووم لە جێگای دوکتوری لە پشت مێز دانیشتم. عەجەمێک هاتە ژوور کە چاوی بە دوکتور بەرزنجی کەوت، گورج گەڕایەوە. دوکتور گوتی: «دەرچوو، ئەو سەگبابە من دەناسێو زۆریش خراپە. تازە نەجاتمان نابێ».

کابرا وەدەر کەوتو زۆری پێنەچوو لەگەڵ دوو عەجەمی چەکدار وەژوور کەوتن. ئیتر هەر دەرگایان کردەوە من وچانم پێنەدان، بە فارسیە کێویلکەی خۆم، زۆر بە تووڕەیی دەنگم دانو گوتم: ئێرە دەفتەری ئایەتولڵا تالەقانیە، چۆن بە چەکەوە بێئیجازە وەژوور دەکەون. یاڵلە جەهەندەم بن. وەدەر کەون. پدر سەگ. ئیتر هەر خۆیان نەگرتو گەڕانەوە. دوکتور بەرزنجی پشویەکی هاتەوە بەر. گورج دوو کەلیمەم نووسی بۆ سەرگورد مونەزین کە لە فەرمانداری بوو. نووسیم فەوڕەن بگەیە ئێرە وەزع خەتەرە. دام بە پێشخزمەتو گوتم: گورج بەغار بۆ سەرگوردی بەرە. ئیتر زۆری پێنەچوو سەرگورد پەیدا بوو. گوتم: زوو بمانگەیەنەوە ماڵی مەلا ساڵحی. سەرگورد وەک پیاوان سواری کردینو ئەوجاریش دوکتور بەرزنجی نەجاتی هات. رۆژی دوایی کۆبوونەوە لە فەرمانداری سازکرا. پاش باسێکی زۆر گەیشتینە ئەو بڕیارە کە هەوەڵێن هەنگاو بۆ هێدی کردنەوەی وەزع، گیراوەکان بگۆڕینەوە. رۆژی ٨ی ڕانەمەری ١٩٧٩ عەباسی ئوستانداری ورمێ هاتە نەغەدە. ئەو رۆژە بوو کە ٤٢ مەیتی کوردە کوژراوەکانمان ناردەوە مەهاباد کە لەوێ بنێژرێن. لە وتووێژدا لەگەڵ ئوستاندار پێشنیارم کرد

١- هەموو ماڵە کوردەکان بگەڕێنەوە بۆ نەغەدە.

٢- شورایەکی هاوبەشی کوردو تورک لە نەغەدە پێک بێ. کومیتەی حەسەنی هەڵوەشێتەوە.
٣- سزادانی ئەو کەسانەی کە شەڕیان ساز کردووە.
٤- ئەوانەی بە گرژگان گیراون لە هەر تک‌لا ئازاد بکرێن.

ئوستاندار گوتی: «پێویستە بۆ چارەسەر کردنی وەزعی نەغەدە کۆبوونەوەیەکی بەرین لە ورمێ ساز بکەین. ئێستا تۆ دەبێ لەگەڵم بێی بچینە مەهاباد». دوکتور بەرزنجیو دوکتوری کوری مەلا سالحی گوتیان: «ئێمەش هەڵگرە». قاسمی پێشمەرگەشم سوار کردو لەگەڵ ئوستاندار چووینە مەهاباد. لە رێگا ئوستاندار گوتی: «باراستەو خۆ بچینە سەر قەبران».

گوتم: «مەسلەحەت نیە ئەورۆ ئەو هەموو مەیتە بۆ مەهاباد ناردرانەوە. خەڵک داخدارو بریندارن، تووشی کێشەی دەبین، پێشی خەڵک ناگیرێ. دوکتور بەرزنجی هەڵی دایەو گوتی: «واباشە جەنابی ئوستاندار راست بچێتە سەر قەبران». من بێدەنگ بووم، ئیتر شوفیر راست بۆسەر قەبران ئاژوای. عالەمێکی یەکجار زۆر لەسەر قەبران کۆ ببوو. مەیت ریز کرابوون بۆ ناشتن، دیمەنێکی داخدارو دڵتەزێن. کاتێک زانیان ئوستاندار هاتوە لە هەموو لاوە روویان تێ‌کردو دەوری ماشینەکەیان دا. ئوستاندار سپی هەڵگەراو چاوێکی بەمانای لە دوکتور بەرزنجی کرد. پاشان رووی دەمن کردو گوتی: «ئاغای حیسامی ئێستا من چ بکەم، خۆ من خەتایەکم نەکردوە». بە دوکتور بەرزنجیم گوت: فەرموو دابەزە پێشی ئەو خەڵکە بگرە. گوتم با نەچینە سەر قەبران. هێرشەکە توندتر دەبوو، مەترسی لێدانو کوشتنی ئوستاندار هەست پێدەکرا. لە ماشێن هاتمە دەرو تاکسیەک لەوێ راگیرابوو. چوومە سەر تاکسیەکەو رووم کردە خەڵکو گوتم: هاونیشتمانانی بەرێز ئوستاندار میوانەو لەگەڵ من هاتوە.بۆ نیشاندانی هاودەردی هاتۆتە سەر قەبران،

لەم ڕووداوەدا پێموایە خەتایەکی نیە. تکاتان لێدەکەم بڵاوەی بکەنو باکارەساتی گەورەتر نەقەومێ. ئیتر من ناتوانم سوپاسو شوکرانەی ئەم خەڵکە زامدارو بەشەرەفە بەجێ بگەیێنم. چەند کەس هاواریان کرد ڕاوەستن کاک کەریم قسە دەکا. پاش قسەکانی من خەڵکەکە کشانەوەو بڵاوەیان کرد. لەسەر تاکسی هاتمە خوارو ئوستاندارم بردە فەرمانداری. دوای نیوەڕۆ تا سێ‌ڕای محەمەدیار لەگەڵی چوومو بەرێم کردەوە بۆ ورمێ.

# کۆبوونەوەی حوسنی نیەت

شەری نەغەدە بەڵایەکی لابەلا بوو بە ئەستۆماندا هات. خەڵکێکی بێگوناح کوژراو دەربەدەر بوون و تاڵان کران و خەڵکێکی زۆریش ئاوارەو روویان کردە مەهاباد. زۆربەیان لە خانەی جەوانان چادریان بۆ هەڵدرابوو. دەست کرا بە شکایەت و ناردنی تێلگراف و ناردنی دەستەی نوێنەرایەتی بۆ تاران. سەیر ئەوە بوو شیرو خورشیدی ناوەندی ئێران لە تاران بە نامەی رەسمی بۆ شیروخورشیدی ورمێ و نەغەدەو مەهابادی نووسیبوو کە یارمەتی بە لێقەوماوانی نەغەدە مەکەن. دەقی کۆپیەی نامەی شیروخورشیدی تاران لەلای من بوو، بەداخەوە لەگەڵ سەندو بەڵگەکانی دیکەی شەری نەغەدەو شەری پاوەو...هتد. لە وڵات پارێزراون، لێرە بەدەستەوە نین.

مامۆستا مەلا شیخ عیزالدین پەیامێکی ناردو داوای لە خەڵک کرد کە یارمەتی بکەن، حیسابێکی بانکی بە ژمارە ...٧و ٦٩٦٩ بۆ یارمەتی بە لێقەوماوانی نەغەدە کرایەوە. خەڵکی بەشەرەفی کورد هەرچی لە دەستیان هات لە یارمەتی دریغیان نەکرد.

دوای پەیوەندی لە نێوان پیاو ماقوڵ و سیاسی و مەلاکانی ناوچە بە کوردو عەجەمەوە، بریاردرا کۆبوونەوەیەک لە ورمێ بە بەشداری کەسایەتە سیاسی و کۆمەڵایەتیەکانی کوردو عەجەم لە دانیشتوانی ورمێ و شنۆو نەغەدەو مەهاباد بۆچارەسەرکردنی کێشەی نەغەدە ساز

بکرێ. لە نەغەدە مامۆستا مەلا سالحو خالە مین، لە شنۆیە قازی خزریو میرزا ڕەحیمی محمودیو حاجی حەیدەری قادریو میرزا ڕەحمانی زەرزا. لە ورمێ کاک یوسفی کوردنیژادو جهانگیر ئاغای دەریو تیللی بەگ، لە مەهاباد مامۆستا مەلا ڕەحیمی عەباسیو کاک حەسەنی بابەتاهیری بەشداریان دەکرد. لە عەجەمی نەغەدە میرزا براییمی موحریرو مەلا حەسەنی ساواکی سەردەفتەرو دوو عەجەمی دیکە، لە ورمێ ئاغای فەوزیو قورەیشیو شارداری ورمێو ئوستانداری ئازربایجانی ڕۆژئاوار فەرماندەی لەشکری ٦٤ بەشداریان کردبوو. سەرگورد موئەزین نوێنەری ئایەتولا تالەقانیو درەخشان یاریدەدەری وەزارەتی کاروبارو خەڵکێکی زۆری دیکەش بەشداری کۆبوونەوە بوون. کومیتەی ناوەندی حیزبی دیموکرات دیسان منی بە نوێنەری حیزب بۆ ئەو کۆبوونەوەیە دیاری‌کرد. دەگەڵ مەلا سەید ئەحمەدی سەعدەیی چووین بۆ کۆبوونەوە. ئێمە بە ماشێن چووینە سێ‌ڕای محەمەدیار لەوێوە بە هێلی‌کۆپتەر بردیانین بۆ ورمێ.

کۆبوونەوە لە مێهمانسەرای ورمێ لە لایەن شارداری ورمێوە ڕێکخرابوو. لە پێشدا کۆبوونەوە بە ئایەتی قورئانی پیرۆز (واعتصموا بحبل‌الله جمیعا) کە بۆتە بنێشتە خۆشکەو کەسیش گوێی ناداتێ، لە لایەن قازی شنۆیە کرایەوە. هەر بە دوای ئەودا ئاخوندێکی سەرڕەشی ڕوتەڵەی باریک، سەری لەبەن عەبا هێنا دەرو دایمەزراند. دەستی پێکرد بە شێوەیەکی بێ‌ئابڕوانەو ئاژاوەچیانەو درۆی وەهای دەهۆندەوە کە تەنیا مەلای شیعە دەتوانێ سازیان بکا. کەمی مابوو مەجلیسەکە وەگریان خا. دژی حیزبی دیموکرات شتی‌وای ساز کردبوو، بەڕاستی کەس نەدیبووی نە بیستبووی. ئاغای قورەیشیو فەوزی دەگەڵ قازی خزری کۆبوونەوەیان بەڕێوە دەبرد. یەک دووجار دەنگیان‌دا گوتیان: «زۆرت پێ لێ‌هەڵێناوە». نەخێر کابرا بێدەنگ نەدەبوو. هەتا ئوستاندار بە زۆری

بێدەنگی کرد. لە مەلا سەید ئەحمەدم پرسی ئەوە کێیە؟
– ئەوە ناوی مەلا حەسەنییە. لە نەغەدە دەفتەری مارەو تەلاقی هەیە، ساواکیەکی ناسراوە. پاشان یەک دوو مەلا قسەیان کرد بەدوای ئەواندا ئوستاندار دەستی پێکرد. دوای ئەوستانداری کاک حەسەنی باباتاهیری کە مەعموری دەولەت‌و فەرمانداری مەهاباد بوو بە شێوەیەکی شێواو مەنتقی بە وورەیەکی بەرزو ئازایانە، دژی سیاسەتی دەولەت لە کوردستان، دژی هەڵویستی ئوستاندارو فەرماندەی لەشکر دەستی پێکرد. پیلان‌و نەخشەی کۆنەساواکیەکانی نێو دەزگای دەولەتی‌و پلانی حەسنی ئیمام جومعەی ورمێی روون کردەوەو ناردنی تانکی بۆ نەغەدە مەحکوم کردو پیاوانە لە بزوتنەوەی رزگاریخوازی کوردو لە مافی خودموختاری دیفاعی کرد. ئوستاندار یەک دووجار دەنگی داو گوتی: «تۆ مەعموری دەوڵەتی، حەقت نیە ئاوا دژی دەوڵەت قسە بکەی». کاک حەسەن لە ولامی‌دا گوتی: «تۆ مەعمورێکت دەوێ درۆزن بێ مەرایی بکا. بۆ هەموو جینایەتێک بەڵێت پێ بلێ. من لەو مەعمورانە نیم، دەلێی تا ئێستا ئیستیعفا بدەم».
من پێشتریش حەسەنی باباتاهیریم دەناسی دۆستایەتیمان هەبوو. بەلام هەلوێستی ئەورۆژەی ئەو پیاوە ئازایە سەد ئەوندەی دیکە رێزی لە لای من زیاد کرد، دۆستایەتیەکەمان بە هێزتر بوو. ئێستاش کە لێک دوورین ئەم هەستەم لە ئاست کاک حەسەنی باباتاهیری هەر بەردەوام‌و بەهێزە.
پاش قسەکانی باباتاهیری یەک دوو کەسی‌تریش قسەیان کرد. ئینجا سەرهەنگ زەهیرنێژاد فەرماندەی لەشکری ٦٤ی ورمێ هەستاو بە چەند سەرباز دۆشکەیەک‌و قەتارێک فیشەک‌و چەند تفەنگی هێنا لەسالۆنی کۆبوونەوە داینا. دەتگوت لەشەری دووەمی جیهانیدا سەرکەوتوە، بە دەورەیاندا دەسوڕاو پاشان گوتی: «ئاغایان تەماشا کەن ئەوانە لە حیزبی دیموکرات گیراون. ئەگەر هێلی‌کۆپتەرەکان نەگەیشتبانی‌و ئەو چەکانەیان

ئەگرتبا ئێستا ئەهاونیشتمانانی نەغەدە دەمانو نە دەسەلاتی حکومەتی ئیسلامی لە ئازربایجان». دیارە ئەو دزشکەو تفەنگانە لە کاتی شەری نەغەدە لە ئالیاویٚ لە دەستەیەک پێشمەرگەی سەید رەسوی گیرابوونو وەک پێشتر باسکرا چەند کەسیش گوژرابوون. کاک مرادی قادری مەسئولی پێشمەرگەی تەشکیلاتی شنۆ دەنگی فەرمانی زەهیر نیژادی لە هیلیکۆپتەرەوە زەبت کردبوو کە فەرمانی دابوو هەر رەشاییەکی لەسەر زەوی دەبینن دەستی لیٚمەگیرنەوە. دوای قەرەچی ئۆینی سەرهەنگ زەهیرنیژاد یەکێک لە مەلا عەجەمەکانی ورمیٚ پێشنیاری کرد با قسە کردن تەواو بیٚو باسی بریارەکانی کۆبوونەوە بکەین.

من دەستم هەلێناو گوتم: «ئەو کۆبوونەوەیە بۆ لێکۆلینەوەی شەری نەغەدەو چارەسەر کردنی وەزعی نالەباری ئەوشەرە پێکهاتبوو. بەلاٚم لێرەدا ئاخوندێکی ساواکیو کۆنە قازاخێکی ئەرتەشی شاهەنشاهی کۆبوونەوەیان کرد بە کۆبوونەوەی دژی حیزبی دیموکرات. کە وابوو من وەک نوێنەری حیزبی دیموکرات بە مافی خۆمی دەزانم کە وەلامیان بدەمەوەو کۆبوونەوەش لەسەر رووداوەکان روون کەمەوە».

ئوستاندارو قازی خۆریو مەلا فەوزی گوتیان: «تکا لە ئاغای حیسامی دەکەین کە لەو مافەی خۆی چاو بپۆشیٚ با کۆبوونەوە تێک نەچیٚ».

گوتم: «کورد بە درێژایی مێژو هەر چاوی پۆشیوەو مافی پیٚشێل کراوە. ئەگەر رێگا نەدریٚ من قسە بکەم، لە کۆبوونەوە دەچمە دەرو هەر بریارێکی کۆبوونەوە بیدا بۆ حیزبی دیموکراتی کوردستان قابیلی قبولٚنیە»

بەدوای قسەکانی مندا، زۆربەی بەشدار بووانی کۆبوونەوە گوتیان با ئاغای حیسامی قسە بکا. لە پێشدا گرنگی کۆبوونەوەو پیلاتی حەسەنی نیمام جومعەی ورمیٚو سازکردنی شەری نەغەدەم روون کردەوە. پاشان بەسەرو گوێلاکی ئاخوندی کۆنە ساواکیدا هاتمە خواریٚ. یەک لە مەلاکان

گوتی: «ئاغای حیسامی ببوورە وشەی ئاخوند سوکایەتیە، تکایە ئەم وشەیە بەکار مەهێنە».
گوتم: «ببەخشن، من کوردم‌و فارسی باش نازانم بەلأم لام وایە بۆ ئەو ئاخوندە کۆنە ساواکیە کە لیباسی مەلایانی لەبەر کردوە ئەگەر وشەی ئاخوند سوکایەتی بێ پڕ بە پێستیەتی. ئەو ساواکیە حەقی نیە لە کۆبوونەوەی حوسنی نیەت‌دا دابنیشێ. وام لێکرد کابرا راست بۆوە عەبای بە سەر شانی داداو کۆبوونەوەی بەجێ هێشت‌و ئیتر کەس نەیدیتەوە. ئەمجار بام‌داوە سەر سەرهەنگ زەهیرنیژاد گوتم: «ئەو نمایشەی سەرهەنگ شتێکی سەیر نیە، ئەو لە ئەرتەشی شاهەنشاهیدا پەروەردە کراوە. فرچکی بە درۆو بوختان‌و بەرتیل‌و سەرکوتکردنی خەلک گرتوە. ئێستاش خۆی خزاندۆتە نێو شۆرشی گەلانی ئێران. ئەو چەکانەی ئەو نیشانی دان‌و بە کوشتنی دەیان کەسی بێ‌چەکی خەلکی ئالیاوێ وەچنگی هێناون لەوێ نە شەڕ بووەو نە کەس خەیالی شەڕی هەبووە. بەلأم نیشاندانی چەک شتێک نیە خەلکی کوردستان چەکدارەو ئەرتەشی شاهەنشاهی چەک کردوە. بۆ ئاگاداری ئاغای سەرهەنگ زەهیر نیژاد من لێرە رادەگەینم کە بەو تیربارە کورد چەک ناکرێ. ئێمە چەکی باشترو چەکی قورسمان هەیەو بۆ وەدەست هێنانی ماقی خودموختاری بەکاری دێنین. ئێمە هاتووین لێرە کۆبینەوە ئەم ئاگرە بکوژێنینەوە کە حەسەنی‌و زەهیرنیژاد لە نەغەدە هەلیان کردوەو دوو برای کوردو قەرەپەپاخیان بە گژ یەک‌دا کردوە کە سالەهای سالە بە برایەتی دەژین. ئێمە نەهاتووین باسی ناکۆکی حکومەتی ئیسلامی‌و حیزبی دیموکرات بکەین. بەلأم زەهیر نیژاد وەک پاشماوەی ئەرتەشی دژی خەلکی دەیەوی ناکۆکی قولتر بکا.
زەهیرنیژاد راست بۆوەو گوتی: «من ناتوانم ئەم سوکایەتیە قبولێ بکەم».
من گوتم: «هەرچی لە دەستت دێ کۆتایی مەکە. هەر تکمان راست

بووینەوە، کۆبوونەوە شێواو خەڵکەکە هەستا سەر پێ. سەرگورد جەوادی موئەزین نوێنەری تالەقانی هەستاو بە زەهیرنیژادی گوت: «تۆ لە شەر دەگەڕێی. بۆ کێشەی نەغەدە من بەرپرسم، هەر سەبارەت بەو کێشەیە لەتارانەوە هاتووم». ئەمجارە سەرهەنگو سەرگورد دمیان تیک ناو چەقەکە بوو بە هی ئەوان. سەرۆکایەتی کۆبوونەوە رایگەیاند وچانەو نان دەخۆین. نانو خوانێکی هەراو سازکرابوو. کە هەستاین ئاغاکانی هەرکیو کوردەکانی‌تر هاتن تۆقەیان لەگەڵ کردمو گوتیان بەراستی چاوەڕوان نەبووین ئاوا جوابیان بدەیەوە، سەرت بەرز کردین. جهانگیرئاغای دەری هات گوتی: «لە ئێستاوە مریدی تۆم. دۆستایەتیم پێ دەکرێ». قسەکەی راست بوو، لە سالاتی دووایدا گەلێک کاری پیاوانەی لەدەست هات.

ئاغای یوسفی کورد نیژاد کرا بە بەرپرسی نووسینی بریارنامەی کۆبوونەوە، دوای نوسین هێنایە لای منو جارێکی دیکەش پێکەوە خوێندمانەوە. لە کۆبوونەوەی دوای ئاخواردن بریارنامەکە پەسندکراو لە لایەن بەشدار بووەکانەوە ئیمزا کرا. بەداخەوە دەقی بەیاننامەکە کە نوسخەیەکی لە لای من بوو بە دەستەوە نیە، ئەوانەی لە بیرم بن ئەو چەند خالانەی خوارەوە بوون:

١- ئەم کۆبوونەوەیە حەوتووی جارێک لە مەهابادو نەغەدەو لە پیرانشارو لە شنۆ پێک بێ. بەشداربووەکانی ئێستا بەشداری بکەن.

٢- گیراوەکان بگۆردرێنەوەو ئازاد بکرێن.

٣- ماشینە دزراوەکان لە هەر شوێنێک خاوەنەکەی بیناسێتەوەو سەندو بەڵگەی بەدەستەوە بێ، دەبێ وەری گرێتەوە.

٤- شتومەکی تالان‌کراو لە مزگەوتی نەغەدە کۆبکرێتەوەو بدرێتەوە بە خاوەنەکانیان.

٥- کوردەکانی نەغەدە بگەڕێنەوە سەرماڵو حاڵی خۆیان.

**٦- گورزەی ئیمدادی تاڵەقانی بەسەر راپەراندنی ئەم بڕیارنانەیە رابگا.**

لام وایە یەک دوو وردە شتی دیکەش بوون کە لە بیرم نەماون.

دووای تەواو بوونی گۆ بوونەوە ئێمەیان بردە فرۆکەخانەی ورمێ کە بە هیلیکۆپتەر بچینەوە مەهاباد. برادەرانی شنۆیەش لەگەڵ ئێمە هاتن کە بێنەوە مەهابادو لەوێوە بچنەوە شنۆ. جێگری ئوستاندارو شارداری ورمێ لەگەڵ ئێمە هاتبوونە فرۆکەخانە. پتر لە دووسەعات چاوەروان بووین هیلیکۆپتەر نەهات. نیوەنیوە تەلیفونیان دەکرد، هیچ دیار نەبوو. کاک حەسەنی باباتاهیری گوتی: «با برۆین بە تاکسی بچینەوە نێو شار لەوێ ماشین پەیدا دەکەین». ئاخرەکەی دوای چاوەروانیو نیگەرانی زۆر هیلیکۆپتەر پەیدا بوو. سواربووین لام وایە ببوونە ۱۱ کەس بەراستی هەموومان لە فیلو ناراستی زەهیرنیژاد نیگەران بووین. گەیشتینە سەر شبرین بلاخ، لەپڕ وەک لە حەوا شتێک بەردەیەوە، هیلیکۆپتەر پتر لە ۲۰۰ میتر کەوتە خوار. یاللە یاللە پەیدا بوو، دڵ کەوتنە لێدان، بەڵام خۆی گرتەوە، ئێستاش نەمانزانی چ بوو کابراش هیچی نەگوت. بەڵام بەراستی رەنگ لە روان پەڕیبوونو مەلاکانیش خودایان هاتبوە بیر.

بەدوای ئەوەدا دوو کۆبوونەوە دیکەش لە نەغەدەو لە پیرانشار پێک هاتن لە هەر تکیان دیسان لەگەڵ سەرهەنگ زەهیرنیژادو ئوستاندار تووشی دمەقاڵێ توند بووم. بێجگە لەوە ناراستیو بوختانی نارەوای مەلای شیعەم باشتر بۆ دەرکەوت. من لە زەمانی مصدق-ەوە میرزا براییی موحرر مەلای عەجەمان لە نەغەدە دەمناسی، پێم مرۆڤێکی موسوڵمانو باش بوو. لە کۆبوونەوەی نەغەدە ئەم کابرا ناموسلمانە هەستاو بە هەر تک دەستان بەسەری خۆی داداو قیژاندی و گوتی: «کوشتنو تالان کردنو سوتاندن قەی ناکات، بەڵام وەرن بزانن ئەو کوردانە چ دەکەن. عەجەمێکی پیریان هێناوەتە کن من، سێ کورد لە رێگا گرتوویانەو ئەوندەیان لاقە کردوە کە لە خۆ چووبوو.

ئیتر من ئاگرم گرت. لێی وەدەنگ هاتم گوتم: «تۆڵای خۆت مەلای، بەڵام دیارە درۆزنو نامسوڵمانو بێ‌ناموسی. کورد کاری وا ناکا، کوا ئەو پیرە عەجەمە لە کوێ‌یە؟ داوا لە کۆبوونەوە دەکەم ئەو بوختانەی ساخ کاتەوە. کۆبوونەوە شێواو پاشان تکایان کرد کە واز لەو باسە بێنم. سمایلی ئاغا مەجیدیش هاتبوە نەغەدەو لەو کۆبوونەوەیە بەشدار بوو. نازانم سەرهەنگ زەهیرنیژاد چی پێگوتبوو بانگی کردمو گوتی: «کاک کەریم دەمگرن».

- تا... چۆن دەتگرن؟ تۆ بۆ بەشداری کۆبوونەوە هاتووی ناتوانن بتگرن.

- ناتوانن نیە، ئەو هەموو سەگبابە لێرە کۆبوونەوە، سەرهەنگ بە تەمایە بمگرێ.

- کەوا بوو لەسەر تەواو بوونی کۆبوونەوە رامەوەستە، بە بیانویەک بچۆ دەرێ سوار بەو برۆ. ئەگەر دەتەوێ تا سەرگوردی نوێنەری تالەقانی ئاگادار بکەم. کاک سمایل ئازایانە خۆی دزیەوەو بۆی دەرچوو. لەو هەرای نەغەدەدا وەک بەرپرسی شێروخورشید پیاوانە یارمەتیەکی یەکجار زۆری بە لێقەوماوانی نەغەدە کرد.

کۆبوونەوەی سێیەم لە پیرانشار پێک هات. لە کۆبوونەوەی پیرانشار سەرهەنگ زەهیرنیژادو عەجەمەکانی نەغەدە نەهاتبوون. پێش کۆبوونەوە هەموو عەجەمی دانیشتوی پیرانشار چووبوونە پادگانو دەیانگوت ناوێرین لە پیرانشار بژین ئەمنیەتمان نیە. گەیشتینە پیرانشار ئوستاندارو مەلاکانی ورمێ یوسفی کورد نیژادو جانگیرخانی دەرێو برایانی شنۆ هاتبوون. فەرماندەی پادگانی پیرانشاریش بەشداری کردبوو. کۆبوونەوە لە فەرمانداری دەست پێکرا. یەک دوو عەجەمی کۆنە ساواکی دانیشتوی پیرانشار هاتنو کردیان بە هاوارو رۆرۆ کە ئەمنیەتمان نیەو ناتوانین لێرە بژین. ئوستاندار کۆبوونەوەی بەڕیوە دەبرد. خەریک بوو کۆبوونەوە بکاتە باسی شلتاخو هەرای ئەو عەجەمانە. گوتم: «ئێمە بۆ لێکۆڵینەوەو

چارەسەر کردنی وەزعی نەغەدە هاتووین. نابێ کۆبوونەوەی ئێمە کاتی خۆی بۆ شەڕلاتانی ئەوانە تەرخان بکا. ئوستاندار گوتی: «دەبێ چارەی ئەو مەسەلەیە بکرێ. ئەوانە ناتوانن لێرە بڕۆن».

گوتم: «ئەگەر ناتوانن لێرە بڕۆن با بڕۆن. تا ئێستا کێ هەڕەشەی لەوانە کردوە. دەیانەوێ شڵتاخ بە کورد بکەن. ئەگەر ترسیان هەیە با بار کەن‌و پیرانشار بەجێ بێلن». دەگەڵ ئوستاندار لێمان بوو بە قرە. گوتم: «تۆ بوویە لایەنێکی کێشەو مورافەعە. کەوایە تۆ سەلاحیەتت نیە کۆبوونەوە بەرێوە بەری دەبێ لەوێ لابچی پاشان کۆبوونەوە درێژە پێدەدەین. ئوستاندار بە ناچاری لەسەرکورسیەکە هەستاو مەلا قورەیشی هاتە سەر کورسی بەرێوەبردنی کۆبوونەوە. بریارنامەیەکی دیکە لە پشتیوانی بریارنامەی پێشوو نووسراو ئیمزا کرا. لەو کاتەدا کە کۆبوونەوە تەواو دەبوو، دیکخراوەکانی فیدایی‌و کۆمەڵەو خەڵکی پیرانشار لە دەرووبەری فەرمانداری کۆبوونەو دەیانگوت: «رێگا نادەین ئوستانداروو مەلاکانی ورمێ بکەرێنەوە». برادەرێکی خەڵکی پیرانشار بەناوی مەلا سەید شیخ محەمەد لە دەرەوە هەر هاواری دەکرد نەمانفرۆشن. ناچار لێی وەدەنگ هاتم‌و گوتم: «تۆ چ هەرا هەرایەکتە، خۆ مانگا نی بفرۆشرێی». هێندێک لە میوانەکان چوونە دەرێ‌و پاش هاتووچۆو گفتوگۆ لەگەڵ خەڵک، گوتیان تا کاک کەریم قسە نەکا نەڵێ ئوستاندار ئیجازە بدەن ناهێڵین وەدەر کەوی. من لە ژوورێ بوومو بە ئانقەست خۆم دەبوارد. یەک دووجار ئوستاندار هات گوتی: «تەکلیفی ئێمە چی‌یە؟ گوتم: فەرموون خۆت بچو قسەیان لەگەڵ بکە. پاشان ئاغای قورەیشی‌و قازی خزری هاتن و گوتیان تکا دەکەین کارێکی وابکە بڕۆین. ناگەینەوە ورمی‌و شنۆ. هەر لە ژوورێ چوومە پشتی میکرۆفۆن‌و لە پشتیوانی‌و هاوکاری خەڵک سوپاسم کرد. داوام لێکردن بلاوەی بکەن‌و رێگا بدەن میوانەکان بڕۆن. بە دڵەوە ئێستاش هەر سوپاسی ئەم خەڵکە

دەکەم کە بە قسەی من دەست بەجێ بڵاوەیان کرد. هاتمە دەرو ئوستانداروو میوانەکانم گەیاندەوە پادگانی پیرانشار.

یەک لە خاڵەکانی بریاری کۆبوونەوەی حوسنی نیەت ئەوە بوو ئەو کەسانەی ماشێنیان وون بووە یان دزراوە لەهەر شوێنێ بیدۆزنەوە دەبێ بدرێتەوە بە خاوەنەکەی. لە هەرای نەغەدە ماشێنێکی پەیکانی دوکتور قاسملوش بەتالان چووبوو. سەید رەسوی بابی گەورە لە لاجانێ لە گوندی لگین توشی عەجەمێکی نەغەدەیی دەبێ، ماشێنێکی پەیکانی زەردی لێ ئەستاندبوو هێنابووی دابووی بە دوکتور، ئەویش لە جیاتی ماشێنی خۆی رای‌گرتبوو، سواری دەبوو.

دوای کۆبوونەوەو راگەیاندنی ماشێن ئەستاندنەوە، عەجەمی نەغەدە بە پرسیاران وەدوای ماشێنەکەی دەکەوێ لە مەهاباد لەبەر دەرکی بارەگای حیزب ماشێنەکەی دەدۆزێتەوە. دوکتور لە سەفەر بوو، کابرای خاوەن ماشێن پەیدا بوو. نامەی فەرمانداری نەغەدەی هێنابوو داوای ماشێنەکەی دەکرد. بە کابرام گوت: بچێ قەبالەو سەنەدو بەڵگەی ماشێنەکەی بێنێ. کابرا چووبوو سەنەدو بەڵگەو سەید رەسولیشی بە شاهید هێنابوو. ماشێنەکەم داوە بە کابراو رەسیدم لێ‌وەرگرت. دوکتور قاسملو لە سەفەر هاتەوەو ماشێن نەمابوو. کردی بە هەرار بۆچی ماشێنتان داوەتەوە بە کابرا. با چووبا ماشێنی منی دیتباوە ئەو دەم ماشێنەکەی بردباوە. گوتم: من دەچم بە ناوی حیزب بریارنامە ئیمزا دەکەم کە ماشێن بدرێنەوە. تا ئێستبا پتر لە ٥٠ کورد ماشێنی خۆیان وەرگرتۆتەوە. ئێستا ئێمە دەبێ ماشێنی خەڵکی داگیر کەین؟. مامە غەنی بەسەری داهات‌و گوتی: «ئێمە لە مەسەلەی نەغەدە کاک کەریمان کردۆتە نوێنەری حیزب. کابراش هاتوە لێرە ماشێنی ناسیوەتەوە، دەبوایە دەستی بەسەرداب‌گرین؟. دوکتور بە نارەزایی وازی هێنا. منیش لێرەدا واز لەباسی شەری نەغەدە دێنم. بەداخەوە نووسراوەو بەڵگەکانی لەمەر شەری نەغەدە کە لە لای من

بوون بە دەستەوە نین بلأویان بکەمەوە. ئەوەی لەبیرمەو لە دەفتەری یادداشتەکانم بە کەم‌و کوڕی نووسراونەوە هێنامنە سەر کاغەز. ڕەنگە زۆر شتم لە بیر نەمابێ یا بیویست نەبێ بیان نووسم. لە شەری نەغەدەدا زۆرکەس بەشدار بوو، ڕەنگە زۆر ئازایەتیشیان نواندبێ، ڕەنگە فیشالیشی بە بەرەوە بکەن هەرکەسە جورە دیتنێکی هەبێ‌و بە جورێک بەشدار بووبێ. ئەگەر هەموو برادەران، هەموو بەشدارانی ئەو شەرە ناڵەبارو لابەلایە بیرەوەریەکانیان بنووسنەوەو کۆ بکرێنەوە، قوژبنێکی بەرچاو لەبەسەر هاتی کوردستانی ئێران لە مێژوودا پر دەکەنەوە من تەنیا ئەو شتانەم بە کەم‌و کوریەوە نووسیوە کە پێوەندیان بەخۆمەوە هەبووەو ڕاستەوخۆ بەشداریان بووم. بەو هیوایە هەموو ئەو کەسانەی لەسەر شەری نەغەدە شتێک دەزانن بیخەنە سەر کاغەزو تۆماری بکەن.

# کۆبوونەوەی شیخان

لە بانەمەری سالی ١٩٧٩دا، کاک سەید عەزیزی شەمزینی لە تەواوی سەرۆک عەشیرەت‌و ئاغاو دەرەبەگی کوردی ناوچەی مەهابادو شنۆو لاجان‌و پیران‌و شکاکاتی گیرابۆوە کە لە گوندی شیخان لە ناوچەی شنۆ میوانی ئەو بن‌و کۆبوونەوەیەک پیک بینن. لە مەلا شیخ عزالدینیشی گیرابۆوە بەلام کۆمیتەی ناوەندی حیزبی دیموکراتی داوەت نەکردبوو. ئەودەم سەید رەسولی بابی گەورە لە مەلبەندی لاجان بەسەر بەشی پیشمەرگەی حیزب رادەگەیشت. نامەیەکی بۆ سەید رەسوی نووسیبوو ئەویشی داوەت کردبوو.

سەید رەسو نامەکەی ناردبوو بۆ کومیتەی ناوەندی، داوای کردبوو کە برادەرێکی کومیتەی ناوەندی بەشداری ئەو کۆبوونەوەیە بکات. مامۆستا تەلیفونی بۆ من کردو گوتی: «بۆ ئەو سەفەرەی شیخان ئیوە دین یان نا؟».

گوتم: سەید عەزیز لە کومیتەی ناوەندی نەگیراوەتەوە، سەید رەسولی داوەت کردووە، ئەویش ئیستا لە شنۆیەو لام وایە دەچی.

مامۆستا فەرموی: «پیم باشە ئیوە بین، ئەم خەلکە کۆبۆتەوە دیارە شتیک هەیە. با بزانین ئەم کۆبوونەوەیە چی‌یە».

پاشان مامە غەنی تەلیفونی لی‌کردم گوتی: «سەید رەسول نامەی ناردوە، گۆیا لە شیخان کۆبوونەوەیەکی گەورە هەیە، دەبی ئیمە بەشدار بین».

گوتم: «زۆر پێویستە، مامۆستاش تەلیفونی کردووە. با یەک لە برادەرانی کومیتەی ناوەندی بچێ.
- کێ بچێ؟ ئێمە قسەمان لێ‌کردووە دەبێ تۆ بچی. چەند پێشمەرگەیەک لەگەڵ خۆت بەرەو بچۆ بزانە چی‌یە.
چوومە دەفتەری حیزب. ئەحمەدی بارام میرزا ماشینی هەبوو سازم کرد لەگەڵ چەند پێشمەرگەیەک لەگەڵ مامۆستا کەوتینە رێ. مامۆستا بە عادەتی خۆی یەک دوو کەسی کۆمەڵەو پەیکارو یەکیتی کۆمونیستانی لەگەڵ خۆي هێنابوو. لەوانە کاک سەلاحی شەمسی بورهانی‌و حەسەن‌ئاغای کوری کاک ئا رەحمانی میهمانداری لەگەڵ بوو.
پێش ئەوەی بکەوینە رێ، بە تەلیفون بە برادەرانی تەشکیلاتی شنۆیەم راگەیاند کە ئەندامانی حیزب ئەوانەی چەکدارن بێنە گوندی قورزشاوی‌و ئەلۆس‌و وچەپەراوێ. بەرپرسی تەشکیلات‌و نیزامی بێنە شیخان. یەک دوو برادەر دیاری بکەن بۆ پێوەندی نێوان شیخان‌و برادەرانی کە لەم گوندانە دەبن.
بریارمان‌دا بە مەیدان بەلەک‌و بە لاجانێدا بڕۆین. چوونکە دوای شەری نەغەدەی سەفەر بە سندووسی‌دا زەحمەت بوو. لە سەروکانی لەبەر ئەوەی پادگانی جەلدیان نەمان‌بینێ، لامان‌داو بە گوندی «توان»دا کە ئەدیو بوو سەرکەوتین‌و لارێ بە دەشتی سۆفیانێدا رێمان‌داگرت. باران دەباری لە نیزیک سۆفیانێ ماشێنەکان گیرسان. بە پێ‌یان چووینە سۆفیان. تراکتۆرمان ناردن ماشێنەکانیان دەرباز کردو بە تەری گەیشتینە شێخان.
چ بچین. گوندی شێخان قەت وای بە خۆوە نەدیبوو. لە نێو شکاکانەوە بگرە تا بەری مەنگوران‌و مامەش‌و پیران‌و قوڵەئاغای دانیشتووی شارەکان لە شێخان کۆ ببوونەوە. دوو وەتاخی گەورەی سەید عەزیزی پڕ بوون‌و لە دالان‌و پاشخانەش خەڵک راوەستابوون.
لەلایەکی دیکەوە ئەندام‌و لایەنگرانی حیزبی دیموکرات لە جیاتی ئەوەی

لەم سێ‌گوندەی دیاریم کردبوون کۆوە بن هاتبوونە شێخان‌و لە مزگەوت‌و لە مالآن جێگر ببوون. پەیتا پەیتا دەیانناردە لای من کە چ باسە، ئەو ئاغایانە بۆ کۆبوونەوە، داخوا خەیالی خراپەیان نیە.

نیوە نیوەشی پیاوێکی کاک سەید عەزیز دەهات‌و سرتەیەکی دەگەڵ دەکردو دەڕۆیشت. سەید عەزیز هەستی پێ‌کردبوو کە خەڵکێکی زۆر روویان کردۆتە گوندی.

پێش ئەوەی نان بێنن بێجگە لە ئەحوالپرسی‌و قسەی ئیعتیادی هیچ باسێکی سیاسی نەهاتە گۆڕێ. نانیان هێنا، نان‌و خوانێکی لە رادە بەدەر کوردانەو جوامێرانە. دەزگایەکی شاکار ساز کرابوو. نان خوراو چایی خورایەوەو، میوان مات‌و بێ‌دەنگ کەس زمانی نەدەگەرا. بێدەنگیەکە درێژەی کێشا. من وەدەنگ هاتم‌و گوتم:

- لام وایە کاک سەید عەزیز تەنیا هەر بۆ نانخواردن ئەم ئاغایانەی داوەت نەکردووە. بێگومان لە هەل‌و مەرجی ناسکی ئەمرۆی کوردستاندا، کۆبوونەوەی ئاوا گەورە بۆ مەبەستی سیاسی دەگیرێ. بە ئیجازەی مامۆستا من داوا لە کاک سەید عەزیز دەکەم کە بە وتارێکی خۆی ئەم بێدەنگیە بشکێنێ‌و با ئاغایان باسەکە بکەنەوە.

کاک سەید عەزیز گوتی: «قسەی من هەر بەخێرهاتنی میوانانە، فەرموون با قسان بکەن.

حاجی حەیدەری قادری کوری مام وسێنی سۆفیانێ، پرۆگرامی حیزبی دیموکراتی کوردستانی لەباخەلی هێنا دەرو گوتی: «ئێمە لێرە کۆبووینەوە کە باسی ئەم بەندەی پرۆگرامی حیزبی دیموکرات بکەین کە دەلێ: (زەوی هی ئەو کەسەیە کە کاری لەسەر دەکا) ئەو بەندە دژی ئێمەیەو مانای ئەوەیە خاوەن مولکی کوردستان دەبێ لەبرسان بمرن. داوامان ئەوەیە کە ئەم بەندە لە پرۆگرامی حیزبی دیموکرات بسرێتەوە».

بە دوای ئەودا کاک عەولای جەلدیانێ وەدەنگ هات‌و گوتی: «ئێمە

بووین بە ژن، دەسەڵاتمان نەماوە، ئاغا لە کوردستان لە ژن بێدەسەڵاتترە».

میرزا ڕەحمانی زەرزا گوتی: «ئێمەش خەڵکی ئەم ولاتەین، دەمانەوێ بژین ئەگەر موڵکەکانمان لێ ببەن ئیتر ژیانمان نامێنێ. ئێستا کە موڵکەکەمان لێبراوە، با دەو دوومان بدەنێ. دەنا ناژین».

یەک دوو قوڵە ئاغای دیکە وەدەنگ هاتن‌و گوتیان: «ڕاستی ئێمە دەمانەوێ وەک پێش ئیسلاحاتی عەرزی شا، موڵکەکان وەک خۆیان لێ بێتەوەو موڵکانەمان بدەنێ».

پاش دم تێوەرداتی زۆربەی ئاغاکانی بەشداری کۆبوونەوە من گوتم: «مامۆستا تەشریفی لێرەیەو بە ڕەسمیش داوەت کراوە، با شیێک بفەرموێ».

مامۆستا شیخ عیزالدین گوتی: «لەبەر ئەوەی کە باسەکە لەسەر پرۆگرامی حیزبی دیموکراتە، با کاک کەریم وەلام بداتەوە».

کاک سەلاحی شەمسی بورهانی کە هێندێ ئاژەوەچی عەجەم‌و چەپی خواری لە خۆی کۆکردبوونەوەو دەیویست لە کوردستان خەباتی چینایەتی بکات، کە باسەکە دەست پێکرا چووە ژوورێکی دیکە. پێش ئەوەی وەدەنگ بێم، هەستام‌و چووم کاک سەلاحم دیتەوە. گوتم: «کاک سەلاح تۆ کە خۆت بە لایەنگری زەحمەت کێشان دەزانی، ئەوەتا دەیانەوێ ئیسلاحاتی زەوی هەڵوەشێنەوە. فەرموو وەرە ببڕو ڕای خۆت دەر ببڕە». کاک سەلاح مرتەقی لەبەر نەهاتە دەرو نەهاتیشە دیوی کۆبوونەوەکە.

گەڕامەوە جێگای خۆم‌و گوتم: «بە ئیجازەی کاک سەید عەزیزی، بۆ من زۆر جێگای داخە لەو کاتەدا کە خەبات بۆ خودموختاری بۆتە گرنگ‌ترین ئەرکی سەرشانی هەموو کوردێکی بەشەرەف، سەرۆک عەشیرەت‌و ئاغاو خاوەن موڵکی کورد کۆدەبنەوە داوای هەڵوەشانەوەی ئیسلاحاتی زەوی دەکەن. دەیانەوێ جارێکی‌تر نیزامی ئەرباب ڕەعیەتی

بگەڕێتەوە کوردستان‌و دەست بکەنەوە بە چەوساندنەوەی زەحمەتکێشانی گوندی. یانی خراپتر لەوەی کە شا کردوویەتی. بەراستی ئەگەر زانیبام ئەم کۆبوونەوەیە بۆ هەڵوەشاندنەوەی ئیسلاحاتی زەویە، نەدەهاتم‌و بەشداریم نەدەکرد. من پێم وابوو لەم هەلو مەرجە ناسکەدا ئاغاو سەرۆک عەشیرەتی کورد کۆدەبنەوە بۆ وەدەست هێنانی مافی خودموختاری رارێژ دەکەن‌و پناخەی یەکێتی بۆ ئەم خەباتە دادەڕێژن. بەلاّم بەداخەوە وادیارە ژێردەستی ژاندارم‌و حکومەتی عەجەمیان لەبیر چۆتەوە. دەیانەوێ دابی ئاغاو رەعیەتی زیندوو کەنەوە. من وەک نوێنەری حیزبی دیموکراتی کوردستان لێرەدا بە ئاشکرا رادەگەێنم کە رێگا نادەین ئیسلاحاتی زەوی دەستکاری بکری‌و سیستمی ئاغاو رەعیەتی جارێکی‌تر لە کوردستان زیندوو بێتەوە».

پاش قسەکانی من مامۆستا شیخ عیزالدین گوتی: «قسەکانی کاک کەریم تەئیید دەکەم‌و هیچی زیادیم نیە کە بیڵێم».

بێدەنگی جارێکی دیکەش باڵی بەسەر کۆبوونەوەدا کێشا. ئەوەندە نەبێ کاک سەید عەزیز گوتی: «ئەری بۆ چای ناهێنن».

برادەرانی حیزبی کە لە شێخان کۆ ببوونەوە لێگدا لێگدا دەیانناردە ئێمە چ بکەین، باسەکە چووبووە دەرەوەو خەلکی تۆزێک هاروژاندبوو. من جارێکی‌تر وەدەنگ هاتم‌و گوتم: «ئێستا کە لێرە کۆبووینەوە باشتر نیە لەسەر پێک هێنانی شورایەکی کاتی سەرانسەری کوردستان قسە بکەین؟ بۆ ئەوەی کەوا دەرنەکەوی کۆبوونەوەی ئاغایان هەر بۆ نانخواردن بووە با بەرنامەیەک بۆ ئەم کارە دابنێین‌و بڕیارنامەیەکیش بنووسین. گرنگی ئەم هەنگاوە لەوەدایە کە نیشانی بدەین، دەولەتیش تێ بگا کە لە کوردستان هەر حیزبی دیموکرات نیە داوای مافی کورد دەکا، بەڵکو هەموو خەلکی کوردە بۆ ئەو مافە خەبات دەکات».

بە تێکرایی پێشنیارەکەی منیان پەسند کرد، پاش باس‌و لێدوانی چەند

کەس گەیشتینە ئەو بڕیارە کە نوێنەرێکی مامۆستا شێخ عیزالدین و نوێنەرێکی حیزبی دیموکرات بە کوردستاندا بگەڕێن و لە ماوەی مانگێکدا کۆبوونەوەیەکی مەزن لە هەموو ئاغاو سەرۆک عەشیرەت و مەلاو شێخ و شەخسیاتی دیکەی کورد لە هەموو دەستەو تاقمێک لە مەهاباد ساز بکرێ و شورای کاتی ناوەندی سەرانسەری کوردستان دابمەزرێنێت.

میرزا رەحمانی زەرزاو حاجی حەیدەری قادری دیاری کران کە بڕیارنامەکە ئامادە بکەن، پاشان هێنایانە لای من کە چاوێکی پێدا بخشێنم. منیش بە عادەتی خۆم بە قەولی کاک ئەمیری قازی (هیچیشی تێدا نەبێ نوکە قەلەمێکی هەر دەگەیێنمێ) لام وایە یەک دوو نوکە قەلەمم گەیاندنێ و بڕیارنامە بۆ دانیشتوانی کۆبوونەوە خوێندرایەوەو بە تێکڕایی پەسندیان کردو دەست کرا بە ئیمزاکردنی. لام‌وایە نیزیکەی شیست ئیمزای پێوە نووسابوو. نوسخەیەکی دەقی بڕیارنامەکە بۆ دەولەت و بۆ ئوستانداری و بۆ ڕۆژنامەکانی تاران ناردرا، نوسخەیەکی لە لای من ڕاگیراوەو بە داخەوە لە ولات ماوەتەوە لێرە نیە کە وەک سەنەدێکی مێژوویی بلاو بکرێتەوە. وەک لە بیرم مابێ پاش سەرەتایەک لە بارەی مافخوراوی گەلی کورد ئەو چەند مادەی سەرەکی تێدا گونجێنرابوو.

١- دیفاع لە شۆرشی ئێران بە ڕێبەرایەتی خومەینی.
٢- پشتیوانی لە شۆرشی ئێران لە بەرامبەر پیلانی ئیمپریالیزمی ئەمریکادا.
٣- پشتیوانی و خەبات بۆ وەدەست هێنانی خودموختاری لە کوردستان.
٤- پێکهێنانی شورایەکی کاتی ناوەندی سەرانسەری کوردستان.

تا دەهات شیخان پتر قەلە بالغ دەبوو. خەلکی گوندەکانی شنۆ مزگەوت و مالی خەلکیان پڕ کردبوو. هێندێک لە ئاغاکان لەگەل کاک

سەید عەزیز کەوتنە سرت‌و خورت. پاشان کاک سەید عەزیز گوتی: «خەڵکێکی زۆر لێرە کۆبۆتەوە. پێشنیارم ئەوەیە کاک کەریم بچێتە مزگەوت‌و بریارنامەکە بۆ خەڵک بخوێنێتەوەو بڵاوەیان پێ‌بکا.

هەستام چوومە مزگەوت. بارانێکی نەرم دەباری، عالەمێکی یەکجار زۆر لەبەر باران‌و لە هەیوان‌و لە ژووری مزگەوت کۆبوونەوە. خەڵکم بەخێرهاتن کردو لە وریایی‌و زیری ئەم خەڵکە سوپاسم کرد. گوتم: «کۆبوونەوەی ئیمڕۆ ئەنجامێکی باشی هەبوو. ئەم بریارنامەیە کە بۆتان دەخوێنمەوە بە تێکرایی دەنگ پەسند کراو ئیمزا کراوە. بریارنامەکەم خوێندەوە بوو بە چەپڵەڕێزان‌و پاشان خەڵک بڵاوەی کرد. ئێمەش لە خزمەت مامۆستادا گەراینەوە بۆ مەهاباد.

بەداخەوە بریارنامەکە هەر لەسەر کاغەز مایەوە، من ئیتر ئاگام لێ نەما کە بۆچی بۆ پێک هێنانی شورایەکی ئاوا کە باسکرابوو هیچ هەنگاو ناوێژرا. دەتوانم ئەوەندەی بڵێم لام وایە حیزبی دیموکرات لەبەر لەخۆبایی بوون نەیدەویست کەسی‌تر لە کوردستان لە دەسەلات‌و لە شوورادا بکاتە شەریک. پێی‌وابوو هەموو شت تەواوەو حکومەتی خودموختاری دامەزراندوە. نموونەی ئەم لەخۆبایی بوونە، کۆبوونەوەیەک بوو لەگەڵ برادەرانی کۆمەڵە پێک هات. بریار درا کە حیزبی دیموکرات لەگەڵ کۆمەڵە لەسەر هاوکاری‌و هاوئاهەنگی خەبات وتووێژ بکار بگاتە ئەنجامێک. لە لایەن کومیتەی ناوەندیەوە کاک ئەمیری قازی‌و من دیاری کران کە بچین وتووێژ بکەین. بریار وابوو لە ماڵی مامۆستا شێخ عیزالدین کۆبینەوە. کە چووین لە لایەن کۆمەڵەوە تەنیا کاک عەبدوڵای موهتەدی هاتبوو. من پێم‌وابوو چونکە مامۆستاش تەشریفی هەیە نوێنەرانی کۆمەڵەش دەبوونە دووکەس. لە وتووێژەکەدا بەراستی باسەکەمان پتر لە سەر دەسەلات‌و حاکمیەت بوو لە کوردستان، نەک هاوکاری‌و خەبات بۆ خودموختاری، لەکاتێکا دەسەلاتی گەورەتر هەرەشەی لێ‌دەکردین. با

ئەوەش بلێم کاک ئەمیر کەلێک نەرمتر بوو. بەلاَم من بە گوێرەی بیرووای ڕێبەرایەتی حیزب کە لە کوردستان دەبێ دەسەلاتی هەموو شت بە دەست حیزبی دیموکرات بێ، توندتر پێم دەچەقاند.

## هەڵوەشانەوەی بریاری نابەجێی هەڵەپەسێرانم.

لە مانگی جۆزەردانی ١٩٧٩ کومیتەی ناوەندی بە بەشداری کادرو بەرپرسی رێکخراوەکانی حیزبی، بە ناوی پلینۆمی حیزب کۆبوونەوەیەکی سازکرد. نامەیەکم بۆ دەفتەری سیاسی نووسی، داوامکرد کە بریاری هەڵپەسێرانم هەڵوەشێنەوە، تا وەک ئەندامی کومیتەی ناوەندی لە پلینۆمدا بەشداری بکەم. ئەگەر وانەکەن، داوا لە پلینۆمدەکەمو مەسەلەکە لەوێ دێنمە گۆرێ. کاک ئەمیری قازیو دوکتور قاسملو دژی هەڵوەشانەوەی بریارەکە بوون تا ساڵێک تەواو دەبێ. مامەغەنی هەوەڵجار بوو دیتم بە توندی وەدەنگ هاتوو گوتی: «زۆرم پێ سەیرە لەوەتی کاک کەریم گەراوەتەوە قورسایی تێکۆشانی حیزب لەسەر شانی ئەو بووە. شەری نەغەدە، پێوەندی لەگەڵ مەعمورەکانی دەوڵەتی، کۆبوونەوەکانی ورمێو نەغەدەو خانێ، کاروباری دێهات، نازانم ئێوە چتان کردووە؟ بریارێکی بێجێ دراوە، کاک کەریمیش گوێی نەداوەتێو کاری کردوە. کاک کەریم ئەندامی کومیتەی ناوەندیەو بریاری ئاواش دەبێ هەڵوەشێتەوە». برادەرانی‌تریش پشتی مامە غەنیان گرت. ئەمجارە دوکتور شتێکی دیکەی هێنا دەرێ. نووسیبووی گوتی: «ئەگەر وایە با کاک کەریم ئەو نووسراوە ئیمزا بکا». نووسیبووی کە لەمەودوا بە بێ ئیجازەی حیزب نابزومەوە». بەراستی گاڵتەم بە هەڵویستو بە کینی توزی دوکتور قاسملوم هات. پیش ئەوەی من وەدەنگ بێم مامە غەنی گوتی:

«ئەوە قورباتە، ئیمزای بکە یا بزانین دەبریتەوە». من بێ ئەوەی هیچ بلێم ئیمزام کردوو بە دوکتورم گوت: «باشی هەڵگرە لێت بزر نەبێ». لە پلینۆمدا بە درێژی لەسەر کەمو کوری کاروباری تەشکیلاتو سازکردنی شەری نەغەدەو سیاسەتی حیزب قسەم کرد. دوای کۆبوونەوە مامۆستا هێمن بە مودیری رۆژنامەی کوردستانو چاپەمەنی حیزب دیاری‌کرا. دوکتور قاسملو پێشنیاری کرد کە منیش لە رۆژنامەدا کار بکەم. مەبەستی ئەوە بوو کە لە کاری تەشکیلاتیو پێوەندی دەگەڵ خەڵک دوور کەومەوە. دەنا ئەودەم نووسەری رۆژنامە زۆر بوون. وەک: فەتاحی کاویان، فەتاحی ئەمیری، عەلی حەسەنیانی، مامۆستا هێمن، مەلا عەولاو ئیدیکە. کورەکانی یەکیتی لاوانیش هەرچەند بەشی زۆریان ئەندام یا لایەنگری حیزبی تودە بوون بەلاّم خۆیان خزاندبۆوە نێو حیزبی دیموکرات، کارو باری چاپەمەنیو بلاّوکردنەوەیان گرتبووە ئەستۆی خۆیانو بە جوانی راپاندەپەراند. بە تایبەت کاک حەسەنی ماوەرانی کە شارەزاییەکی زۆری هەبوو.

دوای شۆرشی گەلانی ئێران بێجگە لە دژی هەموو شت، دزی ئەدەبیش ببوە باو. هەرکەسێک دەستی رۆیشتباو بۆی کرابایە کتێبی نووسەرێکی وەگیر دەخستو چاپی دەکردو بلاّوی دەکردەوەو دەیفرۆشت بێ‌ئەوەی لانی کەم ئیجازەی چاپکردنەوە لە دانەری کتێب وەربگرێ. مامۆستا هەژاری رەحمەتی لەسەر ئەو مەبەستە شتێکی جوانی نوسیبوو.

رێکخراوی چریکە فیدایەکانی خەڵکی ئێرلن بە بێ پرس‌و، ئیجازەی من دوو کتێبی منی «دایکو کاروانی شەهیدان» چاپکردبوو بلاّوی کردبوونەوە. لەبەر ئەوەی زۆریش شۆرشگێر بوون، وێنەی پێشەوای شەهیدیان لەسەر بەرگی کتێبی کاروانی شەهیدان لابردبوو، کابرایەکی چەکداریان بە کلاشینکۆفەوە لە جێی ئەو قوت کردبۆوە.

چاپکردنو بلاّو بوونەوەی کتێبەکان بە زمانی کوردی لەو بارو دۆخەی

کوردستاندا، هەنگاوێکی بەکەلک بوو، بەڵام پرس نەکردنیان و جەوتی سیاسەتیان کە من لەگەڵی نەبووم وای لێکردم کە بەیاننامەیەک بنووسم و ئەو کارەی چریکەکان بە دزی ئەدەبی و بێئەخلاقی شۆڕشگێری دابنێم. بەیاننامەکەم نووسی و کورەکانی یەکیتی لاوان چاپیان کردوو بەلام پێم‌گوتن بە هیچ‌جۆر نابێ دەنگێک بلاو بکرێتەوە. چریکەکان کە خەبەریان زانیبوو شتێکی ئاوام نووسیوە. هاتنە لام و گوتیان: «تۆ لە ئێران نەبوی، کتێبەکانمان چاپ کردۆتەوە، ئێستاش زانیومانە کە شتێکت لەسەر ئێمە نووسیوە. هاتوین کە تکا بکەین ئەو نووسراوە بلاو نەبێتەوە، ئێمەش بە ناوی دیاری دەهەزارتمەنت دەدەینێ.

گوتم: «ئەگەر پێش چاپکردنەوە پرستان پێ‌کردبام هیچم نەدەویست، ئێستا کە ئەو پارەیە دەدەن قەی ناکا بلاوی ناکەمەوە.

گوتی: «کەوابوو من دەچم پارەکە دێنم. راست لەو کاتەدا تەلیفۆنیان بۆکرد کە گوشی تەلیفۆنی هەڵگرت، هەستم کرد چرژا. گوتی: «کاک کەریم بەیانەکە بلاو کراوەتەوە».

– شتی‌وا نیە... من گوتوومە رایبگرن و دەنگێک بلاو مەکەنەوە.

بە تەلیفۆن هێندێ دەقی بەیاننامەکەیان بۆ خوێندەوە. راست بوو. کورەکانی یەکیتی لاوان بلاویان کردبۆوە. ئەودەم حیزبی توده لەگەڵ چریکەکان ناکۆک بوو. کاک حەسەنی ماوەرانیش وەک تودەییەک بە خەیالی خۆی کە زەربە لە چریکەکان بدا و لەبەر فرە شۆرشگێری سەرەرای ئەوەی کەمن نەسپاردبووم بلاوی نەکەنەوە، دابووی بە تودەییەکان و لەشاردا بلاویان کردبۆوە. سەیر ئەوە بوو پاشان خۆشی بەو کردەوەیە رادەنا!!

برادەری چریک گوتی: «ئێستا چ بکەین؟

– نازانم... خۆتان بریار بدەن. راستیەکەی ئەوەیە کە ئەوکارە بە بێ ئاگاداری من کراوە، بە کارێکی بێ‌ئەخلاقیشی دەزانم. برادەری چریک

گوتی: «ئەگەر شتێک بنووسی کە ئەو بەیاننامەیە نووسراوەی تۆ نیە، ئێمە پارەکە دەدەین».

گوتم: «شتیوا نانووسم، چونکە بەیاننامەکە من نووسیومە، بەڵام من ئاگام لە بڵاوکردنەوەی نیە. کابرا هەستاو ڕۆیشت. بە کورتی ئاکۆکی نێوان حیزبی تودەو چریکگەلو شۆرشگێری حەسەنی ماوەرانی دەهەزارقەدنی لە کیس مندا. دوایە لەسەر ئەو مەسەلەیە لە سەقزو سنەش لە نێوان تودەو چریک بوو بە دەمەدەمەو بەیان بڵاوکردنەوە.

لە ڕۆژنامەدا دەستم بەکار کرد. بەڵام پتر لە کاری ڕۆژنامە خەلک پێویستی بەکاری سیاسیو تێکۆشانی من هەبوو. کومیتەی ڕێکخراوی شاری مەهاباد نامەیەکی ڕەسمی بۆ کومیتەی ناوەندی نووسیبوو داوای کردبوو کە: «کاک کەریمی حیسامی بە بەرپرسی تەشکیلاتی مەهاباد دیاری بکا». لە کۆبوونەوەی کومیتەی ناوەندیدا نامەکە خوێندرایەوە. دوکتور قاسملو دژی ئەوە بوو کە من ببمە مەسئولی تەشکیلاتی مەهاباد. برادەرانیتری کومیتەی ناوەندی لەگەڵ بیروڕای دوکتور نەبوون. دەفتەری سیاسی بە نامەیەکی ڕەسمی منی بە مەسئولی تەشکیلاتی مەهابادی حیزبی دیموکرات دیاری کرد. ئەو برادەرانەی کە لە تەشکیلاتدا بوون. ئەو پەری پێشوازیان لەو بڕیارە کرد. دەستمان کرد بە دابەشکردنی کارو پێک هێنانی ڕێکخراوە لە هەموو ناوچەکانی سەربەمەهاباد. حەوتووی ڕۆژێک دەچومە یەک لە گوندەکانی سەربە ناوچەی مەهابادو قسەم بۆ خەلک دەکرد. لە چۆمی مەجیدخان، لە شامات لە شارویران لەبەری مەنگوران کۆبوونەوەی گوندەکان پێک دەهاتو دەچوومە ناویان. بڕیارمان دا ڕۆژنامەیەکی ئۆرگانی تەشکیلاتی مەهاباد بە ناوی «پێشەوا» دەر بکەین کە لە ڕۆژنامەی کوردستان ئۆرگانی ناوەندی ڕێکو پێکتر دەردەچوو. پێویستە ئەوەی لەبیر نەکەم کە ڕێکو پێکیو مەحتەل نەبوونی دەرچوونی ڕۆژنامەی پێشەوا بەشی هەرە زۆری بەرهەمی

چالاکی‌و وچان‌نەدانی کاک سەلاحی گادانی بوو.

کەلاسی دەرسی سیاسیمان بۆلاوان دانا. حەوتووی ڕۆژێک نیزیکەی ٧٠ کەس گیژو کوری لاو بە تاسەوە دەهاتن‌و دەرسم پی‌دەگوتن. دەرسەکان بریتی بوون لە میژووی خەباتی گەلی کورد، کورتە میژووی حیزبی دیموکرات، جولانەوەی رزگاریخوازی نیشتمانی، شیوەی تیکۆشانی ڕیکخراوەیی‌و تەبلیغاتی. لە پەنا ڕیکخراوەکانی حیزبیدا دەستمان کرد بە دامەزراندنی یەکیتی پیشەیی لە شارو لە دیهاتیش یەکیتی جوتیارانمان دامەزراند. بیجگە لەو کارانەی کە پیوەندیان بە چالاکی حیزبیەوە هەبوو، لە تەلیڤیزیونی مەهابادیش حەوتووی ئیوارەیەک لەسەر میژووی جولانەوەی رزگاریخوازی کورد ریزە وتاریکم بلاو دەکردەوە کە لە لایەن خەلکەوە پیشوازی گەرمی لی‌دەکرا. ڕۆژیک لە کۆلانیک توشی پیرە پیاویک بووم. سلاوی کردوو گوتی: «ببەخشە ئەری تۆ کاکی میژوو نی؟».

# لەگەڵ مامۆستا شیخ عزالدین‌و شورای شاری مەهاباد

دوای گەرانەوەم بۆ مەهاباد چەند رۆژی پی‌چوو، چوومە زیارەتی مامۆستا. ئەودەم لە سالۆنێکی گەورە (نازانم کوی بوو) دادەنیشت. خەلک بە نۆرە دەچوونە ژوورو دەهاتنە دەرێ. لام وایە مەلا سەعیدی کامەمی بەرپرسی بەردەرگاو ئیجازەی چوونە ژوور بوو. من پێشتر بە خزمەت مامۆستا نەگەیشتبووم. بەلام لە دوورەوە دەمناسی چەند فەقێی مامۆستا کە ئەندامی حیزبی دیمۆکرات بوون، لە رێگای ئەوانەوە ئاگام لە وەزعی مەلاکان هەبوو. وەک بزانم مامۆستا لاتی کەم خۆی بە لایەنگری حیزبی دیمۆکرات نیشاندەدا. ئەو رۆژەی من چووم حەمەدەمینی کاکە سوارو چەند ئاغای دیکەی مەنگوڕ هاتنە لای‌و شکایەتیان دەکرد کە: «چەک‌و جبەخانەی سەربازخانە هەموو حیزبی دیمۆکرات بردوویەو کەس نازانێ چی لی‌هاتوە. بە کورتی داوای ئەوەیان بوو کە بەشیان بدرێ.

مامۆستا شیخ عیزالدین ئەورۆژە بە مەنتیق دیفاعێکی رەوای لە حیزبی دیمۆکرات کرد. لە بیرمە گوتی: «حیزب لەگەڵ حکومەت لە خەبات‌و بەربەرەکانی دایە. داوای خودموختاری دەکا. پێویستە ئەو چەکانە رابگری‌و بۆ رۆژی خۆی بیانپارێزێ. ئەوە فەرقی هەیە لەگەڵ ئەوەی عەشیرەتێک یا چەند کەس چەکدار بن». وەلامیکی ئەوتۆی نەدانەوە کە بە دلی ئاغاکان بی.پاشان پرسیارێکم لە مامۆستا کردو گوتم: مامۆستا

لە ئێران دژی ڕژێمی‌شا شۆڕش کراوە. ئێستا ئەو کوردستانەی ئێمە سێ‌کەسی وای تێدا نەبوو کە بگیرێن‌و بە تاوانی خەیانەت بە میللەت‌و هاوکاری لەگەڵ ساواک دادگایی‌و ئیعدام بکرێن! مامۆستا فەرمووی: «بەڕێ‌وەڵا دەکەسی ئاوا موستەحەقیش هەبوو، بەڵام ئیدی ئەوە نەکراوە». لە هەستان‌دا مامۆستا گوتی: «تۆ خۆت ڕوون مەکەو جارویار سەرێکی ئێرە بدە». من هاتو چۆم بۆلای مامۆستا درێژە پێ‌داو گەیشتە ئەو ڕادەیە ئیتر بۆ زۆر مەسەلەکانی نێوانی حیزبی دیموکرات‌و مامۆستا من لە بەین‌دابووم. من ڕۆژەکانی چوونی خزمەت مامۆستاو باس‌و مەسەلەکانم لە دەفتەری یادداشت نوسیوەتەوە. بەداخەوە ئەو دەفتەرە لە وڵات ماوەتەوە. ئێوارەیەک لە ماڵی وسێن مەراغەیی بووم ماشێنێک هات. گوتی: «مامۆستا لە دوای ناردووی». سوار بووم وەک لە بیرم بێ، لەسەرەوەی ڕادیو تەلەڤیزیونی مەهاباد لە کۆڵانێک لەبەر دەرگای ماڵێک دای‌بەزاندم. کە وەژوور کەوتم سێ‌چوار کەسی دیکەشی لێ بوون تەنیا مامۆستاو مەلا سەعیدو کاک محەممەدی ئیلخانیزادەو سەید عومەری زەمبیلیم ناسین. دانیشتین باسی وەزعی کوردستان‌و حیزب‌و ڕێکخراوەکان هاتە گۆڕێ. هەستم پێ‌کرد کە تەگبیر لە پێک‌هێنانی حیزبێک یا ڕێکخراوەیەک دەکرێ. مامۆستا ڕووی لە من کردو فەرمووی: «کاک کەریم چ بکرێ باشە؟ تۆ نەزەرت چی‌یە؟»

گوتم: مامۆستا من لەسەر ئەو باوەڕەم کە هەموومان لە حیزبی دیموکراتدا کۆ بینەوەو بە هێزی بکەین‌و بەرەو باشتری بەرین. ئیتر باسەکە کۆتایی پێ‌هات. من ڕانەکێشرام بۆ لایەکی‌ترو مامۆستاش لە کۆمەڵە دوور نەکەوتەوە. هەرچەند وەک ئاگادار بووم یەک دوو جاری دیکەش بۆ دامەزراندنی حیزبێک کەوتە هەوڵ‌و تەقەلا. مامۆستا زەبیحی‌و کاک سەعدی ڕەحمەتی‌و چەند کەسی‌تری کۆ کردەوە کە حیزبێک دروست بکا. تەنانەت مامۆستا زەبیحی ڕەحمەتی گەلاڵەی

پێرەوو پرۆگرامی حیزبەکەشی ئامادە کردبوو، بەڵام دیسان لەم کارەدا سەرنەکەوت. جارێکی‌تر هەواڵدەری رۆژنامەی کەیهان وتو وێژی لەگەڵ مامۆستا کردبوو. دەقی پرسیارو وەڵامەکان چاپکرابوون‌و رۆژنامەکە لەکن مامۆستا بوو. کە چووم بە گوێرەی عادەت زۆرەکان پڕ بوون. رۆژنامەکەیان بۆ دەخوێندەوە. مامۆستاش کەیفی پێ‌دەهات‌و تەسبیحەکەی هەڵداویشت‌و دەیگرتەوە. گوتی: «کاک کەریم پێت چۆنە؟»

گوتم: مامۆستا زۆر جوانت وەڵام داوەتەوە. راست وەک کادرێکی حیزبی دیموکرات قسەت کردوە. پێکەنی بەڵام هیچی نەگوت. لام وایە قسەکەی منی بە دڵ نەبووبێ.

جارێکی‌تر ئێوارە بوو کە هەڵدەستام هاتە بەردەرکێ‌و دوو کاغەزی هەزارتمەنی خستە گیرفانم. گوتم ئەوە چی‌یە مامۆستا خۆ من بێ پارە نیم.

فەرمووی: «پول هەر لازم دەبێ، ئەوە شتێک نیە با هەت بێ».

ئەو دەم لە دەفتەری سیاسی بریاردرابوو حەملەیەکی یارمەتی‌و پیتاک کۆکردنەوە بکەین. کاک ئەمیری قازی کرابوو بە بەرپرسی ئەو حەملەیە. هێندێ لە ئاغاکانی دیبۆکریان بۆمن دیاری کردبوو کە داوای یارمەتیان لێ بکەم. رۆژی دوایی پارەکەی مامۆستام دا بە کاک ئەمیرو قەبزی یارمەتی دوو هەزارتمەنم لێ وەرگرت‌و گوتم: مامۆستا داویە. کە چوومە خزمەت مامۆستا قەبزەکەم دایە.

- ئەوە چیە کاک کەریم؟

- مامۆستا قەبزی کۆمەگە بە حیزبی دیموکرات.

- من ئەو پارەیەم بۆ گیرفانی خۆت دابوو، حیزبی دیموکرات پارەی زۆرە.

سوپاسم کردو گوتم: فەرقی نیە، پێم خۆش بوو بزانن کە مامۆستاش یارمەتی بە حیزب دەکا.

## لەگەڵ کاک عەلی سەنجاری

لام وایە هەر لەم سەرو بەندەدا بوو، تێوارەیەک جەعفەرئاغای کەریمی تەلیفونی کردو گوتی: میوانێکم هەیە دەیەوێ چاوی بەتۆ بکەوێ.

- کێیە؟

- ئەگەر بێی دەیناسی‌و زۆر بە ئاواتە بتبینێ. ئەوە ماشینت بۆ دەنێرم تکایە تەشریف بێنە.

ماشێن هات‌و ئەگەر چووم کاک عەلی سەنجاری ئەندامی کومیتەی ناوەندی پێشووی پارتی دیموکراتی کوردستانی عیراق. بەخێر هاتن‌و چاک‌و خۆشی. هاتبوو بچێتە کەرەج بۆ سەرەخۆشی خوا لێخۆشبوو مەلا مستەفای بارزانی.

کاک عەلی گوتی: دەمەوێ بچمە تاران. هاتووم تا ئەو جێگایەی پێویستە ئێوە بەرێم بکەن. بەیانیش دێمە دەفتەرو پێم خۆشە هێندێ قسە بکەین.

شەو تا درنگ دانیشتین‌و بەیانی کاک عەلی هاتە دەفتەری حیزب. دووای تاوێک دانیشتن‌و چا خواردنەوە چووینە ژوورێک. کاک حەمەدەمینی سیراجیم بانگ کرد کە بەشداری وتو وێژمان بێت. من بە کاک عەلیم گوت: لەبەر ئەوەی پێویستە کۆمیتەی ناوەندی لەم چاو پێکەوتن‌و ئاخافتنە ئاگادار بکەم، دەبێ ببوری فەرمایشتەکانت یادداشت دەکەم. بەداخەوە دەقی یادداشتەکان لێرە بەدەستەوە نین. کاک عەلی

هەرچی لەسەر پێوەندیی ڕێبەرایەتی شۆرشی کوردستانی عیراق بەملاو لاوە دەیزانی‌و سەفەری هێندێ لەسەرۆک‌و ڕێبەرانی شۆرش بۆ ئیسرائیل‌و بۆ کوێ‌و کوێ باسی کردو منیش دەقیق یادداشتم دەکردن.

دوای تەواو بوون فرە سوپاسم کرد بۆ ئەو هەموو مەعلوماتە. ماشێنێک‌و پێشمەرگەمان دەتیختیار نا هەتا سەقز. نامەیەکم بۆ ڕێکخراوی سەقز نووسی کە لەوێرا تا ئەو جێگایەی پێویستە بەڕێی بکەن.

## سەفەری مامۆستا بۆتاران

لە ماوەی ڕاوێژو هاودەنگی هەموو لایەک وا بە باش زانرا کە مامۆستا سەفەرێکی تاران بکاو چاوی بە خومەینی‌و ئایەتوالاو مایەتولایان بکەوێ. دوکتور قاسملو گوتی: «ئێستا کە مامۆستا ملی بۆ سەفەر ڕاکێشاوە، وام پێ باشە تا دەکەویتە ڕێ بۆ بەڕێ‌کردنی لەوێ بی. وابکەن بەڵکو مامۆستامەلا کەریمی شاری‌کەندیش لەگەڵ خۆی بەرێ. ئیتر یەک دوو ڕۆژ پێش ڕۆیشتنی مەگەر شەوانە چووبامەوە، دەنا هەمیشە هەر لە ماڵی مامۆستا دەبووم. مەسەلەی چوونی مامۆستا مەلاکەریمی شاری‌کەندی بۆ تاران هاتە گۆرێ. ئێمە لەسەر ئەو باوەڕە بووین کە مەلا کەریمی ڕەحمەتیش لەو سەفەرەدا لەگەڵ بێ. مامۆستاش دوو دڵ بوو. لەوە دەترسا کە لە لای خومەینی مەلا کەریم هەڵوێستێکی دژی ئەو بگرێ. دیارە ئەوانەی لە دەوروبەری مامۆستاش کۆدەبوونەوە زۆر بە تەنگ یەکیتی‌و بەرژەوەندی گشتی بزوتنەوەی کورد نەبوون‌و پتر بەرژەوەندی تەنگی حیزبایەتی خۆیان لەبەر چاو بوو. مامۆستاش خۆشی گەرەک بوو کە کۆمونیست‌و چەپڕەو تەنانەت ئاژاوەچیشی لەدەورە

بن.باسێکی زۆرکرا، من بە جیددی پێمداگرت‌و گوتم: بە بڕوای مامۆستا مەلا کەریم لەگەڵ تۆ هەم شەخسیەتت زیاد دەبێ‌و هەم حکومەتیش حیسابی ئەوە دەکات کە لە کوردستاندا یەکیتی هەیە. مامۆستا فەرمووی: «ئەگەر وایە تۆ بچوو بە مەلا کەریمی بڵێ ساز بێ. بەلام حالی بکە کە لە تاران هەڵوێستی جیاواز نەگرێ». هاتمە دەرێ‌و چوومە خزمەت مامۆستا مەلا کەریم‌و لەگەڵم باسکرد. هەڵوێستێکی فرە ژیرانەو جوامێرانەی نیشانداو گوتی: ئامادەم». کە هاتمەوە خزمەت مامۆستا بە پێوە راوەستابوو. فەرمووی: «قسەت لەگەڵ کرد، چۆن بوو؟ بەلام کاک کەریم پێم باشترە لەگەڵ نەبێ. دیاربوو پەشیمانیان کردبۆوە. من تۆزێ بە توندی‌و بە لاتاو بەسەر ئەو کەسانەدا هاتم کە نایانەوێ لەکوردستان یەکیتی هەبێ. پێشتر هەستم بەوە کردبوو کە مامۆستا لە هەڵسورانی خۆیدا لە زۆر مەسەلەدا بڕیاری بۆ دەدەن. بەلام ئیتر لەوێدا گومانم نەما کە مۆستا لە بڕیارەکانیدا بە تەواوی سەربەخۆ نیە.

رۆژی ۱۹۷۹/۵/۱۳ مامۆستا بۆ تاران بەڕێ‌کرا. لام وایە هیچ رێبەرێکی نیشتمانی تا ئەورۆژە ئاوا بەرێزو حورمەت بەڕێ نەکرابوو. لە ماڵی مامۆستاوە تا سەربازخانەو بن باڵی هێلیکۆپتەر خەڵک راوەستابوون. من ماشینی دوکتورقاسملوم بۆ هێنابوو سوارم کرد. ئەوەندە خەڵک وەسەربانی ماشینەکەش کەوتبوون کە پاشان چەند هەزارتمەن خەرجی راستکردنەوەی ماشینەکە بوو. رۆژی ۷۹/۵/۲۰ وتو وێژی مامۆستای لە رۆژنامەی ئیتلاعات‌دا بلاو کرایەوە. مامۆستا لە تونی ئەوەدا کە دەڵێ: ئێمە موسوڵمانین‌و ئێرانین‌و بیجگە لە خودموختاری هیچی دیکەمان ناوێ، چاوپێکەوتنی خۆی لەگەڵ خومەینی‌و تالەقانی زۆر بە باشی باسکردبوو. مامۆستا ئاوا بەڕێ کرا بەلام بەداخەوە ئاوا نەهاتەوە لە جیاتی ئەوەی لە پاداشی رێزو حورمەت‌و دڵسۆزی خەڵک راست بێتەوە مەهاباد‌و راپۆرتی سەفەری خۆی بدا بەو خەڵکەی کە ئاوا بەڕێیان

کردبوو، کەوتبووە لای سەردەشت و لە پێشدا سەرێکی مام جەلالی دابوو پاشان گەڕابۆوە. ڕۆژی ١٩٧٩/٥/٢٦ پەیامی مامۆستا لەبارەی سەفەرەکەی بۆتاران لە ڕادیۆتەلەفیزیۆنی مەهاباد بڵاو کرایەوە. مامۆستا لە پەیامەکەیدا فەرمووی: «لە حوسنی نیەتی ئیمام و ئایەتوڵا تاڵەقانی ئێستا دەتوانم مزگێنی بدەم بە خەڵک خودموختاری کە ئاواتی خەڵکە بە ئەنجام دەگات».

لەگەڵ گەڕانەوەم بۆ مەهاباد شورای شاری مەهاباد هەڵوێستێکی دۆستانەو دڵسۆزانەی لە ئاست من نیشاندا. لە شیرکەتێکی شاماتی هێندێ ماشێن بەجێ مابوون. ئیجازەیاندا کە ماشێنێکی سواری بۆخۆم بێنم. کاک حەمەدەمینی عیسازادە لەگەڵم هاتە شیرکەت و ماشێنێکی سواری بۆ هەڵبژاردم کە سواری دەبووم. پاشان کە بڕیاریاندا ماشێنەکانی شیرکەتی بدەنەوە، ماشێنەکەی منیشیان وەرگرتەوە. شورای شار بە نامەیەکی ڕەسمی لە خانووەکانی کوی فەرەح خانویەکیان دامێ. لە نامەکەدا نووسرابوو. «شورای شاری مەهاباد بە پاداشی خزمەت و تێکۆشانت لە پێناو نیشتماندا ئەو خانووەت دەداتێ». لە سایەی هیمەتی دۆست و برادەران و هاوڕێیانی کومیتەی شار چوومە دەخانویەکی سازو پەرداخ و پڕ لە هەموو شتێکی پێویست بۆ ژیانێکی ئاسودەو ئارام. بەڵام زۆری پێنەچوو شەڕی سێمانگەی بەسەردا هات، خانوم بەجێ هێشت و دوای گەڕانەوە بۆ مەهاباد تا ماوەیەکی زۆر چوومەوە سەر ماڵان. جێگای خۆیەتی سوپاسی هەموو ئەوکەسانە بکەم کە ماڵەکەیان ئاوەدان کردبۆوە. هەر چەند تێیدا نەحەسامەوە.

# پیرانشارو ئایەتولاٚ رەببانی شیرازی

لە پیرانشار وەزع بەرەو تیکچوون دەچوو، هێندێ کەس لەگەڵ کورەکانی شیخی گەسگەسک شورایەکیان پێک هێنابوو. چریکو کۆمەڵەو هێندێ کەسی‌تر دژی ئەم شورایە بوون. دوو رۆژ بوو دوکانو بازار داخرابوون. پادگانی پیرانشان لە بیانوو دەگەرا کە دەست دەکاروباری شار وەربدا. برادەرانی پیرانشار داوایان‌کرد کە بچمو بە هەموو لایەک وەزعی شار هێندێ کەینەوە. پاش کۆبوونەوەو باسو وتو وێژێکی زۆر لەگەڵ هەموو دەستەو رێکخراوەکان گەیشتینە ئەو بریارە کە شورای کورەکانی شیخی هەڵوەشێنەوەو لە رێگای هەڵبژاردنەوە بۆ هەموو پیرانشار شورایەکی تازە دابمەزرێ.

لەوکاتەدا ئایتولاٚ رەببانی شیرازی وەک نوینەری خومەینی هاتبوە کوردستانو بەشارەکاندا دەگەرا. چووبووە ورمێو نەغەدەو سەردەشتو گەرابۆوە گەسگەسک ماڵە کاک سەیدتەهای.

رۆژ ١٩٧٩/٥/٣١ کاک حەمەدەمینی سیراجی هاتە پیرانشارو گوتی: «رەببانی شیرازی چۆتە ماڵە شیخیو با بچین بزانین لە چی دەگەرێ». لە سەردەشتەوە لەگەڵ چەند ئەفسەری ئەرتەشیو جەرادی فەرماندەی ژاندارمەری ورمێو هێندێ شلەو قولەی دیکە میوانی شیخی بوون. ئێمەش لەگەڵ کاک حەمەدەمین چووینو خۆمان کردە شەریکی میوانداری.

دەستکرا بە باسی وەزعی کوردستان. ئێمە رەخنەمان لە سیاسەتی چەوتی حکومەت دەگرتو شەر هەلاٚیسێنەری ئەرتەشمان روون

دەکردەوە. رەبھانی شیرازی گوتی: «ئاغای حیسامی بۆ ناوی حیزبەکەتان ناگۆڕن؟»

- باشە، بە گۆڕینی ناوی حیزبی دیموکرات مەسەلەکان چارەسەر دەکرێن؟ چ ناوێکی لێ بنێین؟

- ناوی بنێن حیزبی ئیسلامی. کاتێک دیکتاتۆر هەبوو لەبەرامبەر ئەودا دیموکرات وشەیەکی پەسند بوو. ئێستا کە ڕێژیمی دیکتاتۆری نەماوە ئیتر دیموکرات مانای نیە».

بەراستی گاڵتەم بە ئاقڵی ئاخوندان هات‌و بەزەییشم بە حاڵی خەڵکی ئێراندا هات کە چارەنووسیان لەبەر دەستی کێدایە.

ئێمە دەھات لە قسەو باسان بیینەوە، نانخورابوو، کابرایەکی قوتەی ڕوشەڵ بە ڕیشێکی کزرپەی حیزەوە، ڕاست بۆوەو هات لە نیوەڕاستی مەجلیسێ چۆکی دادان‌و دەستی پێ‌کرد. لەپێشدا ئایەتیکی قورئانی خوێندەوەو پاشان بە فارسیەکی خەست لە شێوەی ئەو ئاخوندە شیعانە کە مەرسیە دەخوێننەوەو خەڵک وەگریان دەخەن دایەزراندو هەرچی دەیگوت نەیدەگوتەوە. لە پێشدا وامزانی پاسدارەو یا ئاخوندی عەجەمانە. خوا چاکەی بۆبکا یەکێک لە کورەکانی شێخی هاتە بن گوێم‌و گوتی: «کاک کەریم ئەوە کوردەو خەڵکی سەردەشتە. دوێنێ لە نەغەدە لەسەر گۆڕی کوژراوەکانی نەغەدە بە ناوی نوێنەری کوردەکانی نەغەدە وتاری دا».

ڕاوەستام هەتا لە سەگ وەڕەکەی بۆوە، چوو لە لای دەرکێ ڕاوەستا. مەجلیس دەھات بڵاوەی بکا. هەستام‌و چوومە پەنای گوتم:

- تۆ خەڵکی کوێی؟

- من موسوڵمانم.

- لەوەت لێ‌ناپرسم. دەزانم موسوڵمان نی‌ و قرت بە ئیسلامەیتەوە نیە، دەڵێم خەڵکی کوێی؟

- موسڵمانم‌و خەڵکی ئێرانم.

- سەگبابی موسوڵمان تۆ کەی نوێنەری کوردەکانی نەغەدەی کە دەچی لەسەر قەبران بە ناوی ئەو لێقەوماوانە وتار دەدەی؟
- ئەی.. کابرا تۆ بۆ جنێو دەدەی؟ جنێو بۆ موسوڵمان نەهاتوە.
- سەگباب، ئێستا لە تەویلەت دەکەم، جا ئەودەم پێت نیشان دەدەم کە ئیسلامەتی چۆنە.
- بەراستیتە، باوکم تۆ قسەی سوک دەکەی.
- قسەی سوک دەکەم و چاویشت دەر دێنم.

جەوادی فەرماندەی ژاندارمەری هەستی کرد کەوا بە توندی لەکابرای راسارم. گوتی: «ئاغای حیسامی مەگەر شتێک رووی‌داوە؟».
- بەلێ، ئاغای جەوادی زۆر شت رووی داوە. ئەو بێ‌شەرەفە ناموسوڵمانە کەس نازانێ سەگی کوێیە، لەگەڵ خۆتان دەیگێرن، بەناوی کورد قسەی پێدەکەن. ئێستا من دەیگێرمەوە هەتا بزانین لە کەیەوە بۆتە نوێنەری کوردەکانی نەغەدە.

جەوادی گوتی: «تکایە حەوسەلەت بێ، کاری گەورەتر لە پێشە».

دوایە جەنابی شیخی تەشریفی هەستاو گوتی: «کاک کەریم ئێرە ماڵی خۆتە خۆناکرێ لە ماڵی خۆت جنێو بە میوان بدەی با خەتاباریش بێ. تکایە لێگەرێ با بروا». ئێتر هیچم پێ‌نەکرا. من لە کۆنەوە لە خزمەت کاک سەید تەهادا ئیرادەتم هەبوە، ئێستاش هەر ئەو ئیرادەتەم لە جێی خۆیەتی.

پاشان دەرکەوت ئەو کابرایە خەڵکی سەردەشت بووەو ناوی رەحمەت بووە چۆتە قوم بۆتە شیعەو ئاخرەکەشی بە دەستی شۆرشگێرانی کورد بۆ بەهەشتی بەرێ کرا. ئایەتوڵا رەبیانی لەگەرانەوە بۆ تاران راپۆرتێکی ئاژاوەچیانەو پر لە درۆو نائینسانانەی لە رۆژنامەکاندا بلاو کردبۆوە. کومیتەی ناوەندی حیزبی دیموکرات ١٩٧٩/٦/١٨ لە بەیاننامەیەکدا تەواوی قسەکانی ئایەتولا رەبیانی شیرازی وەدرۆ خستەوە.

# وەزع بەرەو ئاڵۆزی دەچوو

حکومەت لە بیانو دەگەرا لەسەر ئەوە پێیدادەگرت کە ئەرتەش بێتەوە پادگانی مەهاباد. حیزبی دیموکرات‌و هێزەکانی دیکەش دژی هاتنەوەی ئەرتەش بوون بۆ پادگان. دوکتور قاسملو بۆ چاوپێکەوتنی وەزیری بەرگری‌و فەرماندەی گشتی ژاندارمەری سەفەرێکی تارانی کرد. پاش وتو ویژ بۆ نیشاندانی هەڵویستی ئاشتی خوازانە بەڵێنی دابوو کە چەند ئەفسەر دەتوانن بێنە مەهابادو بچن چاویان بە پادگان بکەوێ‌و بزانن کە وێران نەکراوە. هەر لەو کاتەشدا بو نیشاندانی هەڵوێستی ئەوان داوای پاسپورتی کردبوو. ماوەیەک چاوەروان بوو پاسپۆرتیان نەدابویە. دوای گەرانەوە لە تاران لە راپۆرتێکدا کە دای بە کۆمیتەی ناوەندی، دوکتور گوتی: «لەگەڵ ئەو رژیمە هیچ ناکرێ، حوسنی نیەتیان نیە، تەنانەت ئامادە نەبوون پاسپۆرتێکیش بدەن بە من». پێشنیاری کرد کە بۆ شێ کردنەوەی بارۆ دۆخی ئێستاو هەڵوێست گرتن لە ئاست سیاسەتی حکومەت، کومیتەی ناوەندی بە بەشداری هێندێ کادرو موشاویرو بەرپرسی کومیتەکانی شارستان کۆبوونەوەیەک پێک بێنێ. پێویستە وەبیر خرێتەوە کە هێندێ لە کادرو ئەندامی حیزبی بە موشاویر دیاری کرابوون. لەم بەینەدا رۆژێک پێنج شەش ئەفسەری ئەرتەشی ئێران هاتنە مەهابادو هاتنە دەفتەری حیزب. دوکتور قاسملو لە مەهاباد نەبوو. داوایان کرد لە سەر بەڵێنی دوکتور قاسملو بچن چاویان بە پادگان

بکەوێ. کاک حەمەدەمینی سیراجی لەگەڵیان چوو تاوێک لە نێو پادگان سورانەو لێ‌یاندا ڕۆیشتن. کاتێک دوکتور هاتەوە کاک حەمەدەمینی هەڵپێچا کە بۆچی ئەفسەرت بردوونە نێو پادگان. ئیتر برادەران بەسەری دا هاتن‌و گوتیان تۆ لە تاران قەولت پێ‌داون‌و لەسەر بەڵێنی تۆ هاتوون. چۆن لێرە دەڵێی، ئەدەبا چووبانە نێو پادگان!.

ڕۆژی ١٩٧٩/٦/١٤ کۆمیتەی ناوەندی حیزبی دیموکرات بە بەشداری کادری موشاویرو بەرپرسی ڕێکخراوەکان بۆ لێکۆڵینەوەی باروودۆخی وڵات‌و وەزعی پادگانی مەهاباد کۆبوونەوەی دەستی پێ‌کرد. من بە خۆشیەوە کورتەو پوختەی وتەی یەک بەکی بەشدار بوانی کۆبوونەوەم یادداشت کردوەو دەقەکەیان دەنووسمەوە.

پاش ئەوەی کە دوکتور قاسملو بە وتارێکی جوان‌و بە لێکۆڵینەوەیەکی بابەتی کۆبوونەوەی کردەوە، مەلا سمایلی حاجی وەدەنگ هات‌و گوتی:

– ئەگەر مەسەلەی ئێران بە هاتنەوەی حکومەت بۆ پادگانی مەهاباد چارەسەر دەکرێ، با بەکەیفی ئەوان بکەین. بەڵام وادیارە دەیانەوێ مەهاباد بگرنەوە، کەواتوو نابێ ڕێگا بدەین بێنەوە پادگان.

فەتاحی خولەس: «لام وایە مەبەستی حکومەت تەنیا هاتنەوەی پادگان نیە. مەبەستی سەرکوت کردنی جولانەوەی کوردە. دەیانەوێ پادگانی مەهابادو پیرانشارو پەسوێ بکەنە یەک».

یوسفی ڕیزوانی: «لام وایە پیلانە. بە هیچ وەجە نابێ بێڵین بێنەوە پادگانی مەهاباد».

کەریم حەداد: «مەبەستیان بێ‌دەسەڵات کردنی حیزبی دیموکراتە. ئەگەر بزانین میللەتەکەمان خۆ ڕادەگرێ‌و تەحەمول دەکا، بەشەریش بێ نابێ ڕێگا بدەین بێنەوە مەهاباد».

ڕەحیمی بەغدادی: «بە هیچ وەجە نابێ ڕێگا بدەین بێنەوە مەهاباد».

ئەمیری قازی: «سەرفی نەزەر لە نیەتی دەوڵەت یان کومیتەکان زوو

یان درنگ لەگەڵ ئەو دەزگایە توشی شەر هەر دەبین. بەلام ئیستا لەسەر پادگان شەر بە سەلاحی ئیمە نیە. ئەوان هەرلەدەدەن بینەوە پادگان. ئیمە توانای شەرمان نیە، ئەوان هەر دینەوە. داوای ئیمە نابێ بەسترێتەوە بە پادگان. ئیمە دەبێ لەسەر مەسەلەی گەورەتر دەرگیر بین. نابێ لەسەر پادگان موقاوەمەتی موسەلەحانە بکەین. دەبێ لەسەر خودموختاری‌و مافی گەلْ شەر بکەین».

هیمن: «ئیمە لەسەر هاتنەوە تەجروبەی تالمان هەیە. دەبێ حیزبی دیموکرات هەر لە ئیستاوە مەهابادیان بۆ چۆل بکات».

غەنی بلوریان: «پیویستە بنکەی نیزامی لەشاری مەهاباد بەرینە دەر. ئەوە خۆی مانۆرێکە لە باری سیاسیشەوە. دەبێ مەرکەزێکی جیاوازمان هەبێ. لە وەزعی ئیستادا نابێ بە خاتری مەسەلەی کوردستان شەر بکەین دەبێ بە خاتری ئیران شەر بکەین. وا فیکر نەکەینەوە کە لە کاتی دەرگیری‌دا عیراق پشتیوانیمان لی‌دەکا. دەبێ هیزەکانی خۆمان بۆ شوێنە ستراتیژیەکان بکێشینەوە».

حەمەدەمینی سیراجی: «بە گوێرەی بەرنامەی حیزب مەسائیلی ئەرتەشی لە ئیختیاری دەولەتی مەرکەزی دایە. ئیمە پادگان نەکەینە دەست ناریزو سەبەبی دەرگیری. ئیسرار لەسەر نەدانەوەی پادگانی مەهاباد هیچ فایدەی نیە».

ئەحمەدی سالحی: «مەبەستی دەوڵەت لە هاتنەوەی پادگان پێگەیەکە بۆ سەرکوت کردنی جولانەوەی رزگاریخوازی. تا ئەو رادەیەی ئیمکان هەبێ، نەهیلین بینەوە. ئەگەر بزانین دەرگیری تیدایە، نابێ دەرگیری بە وجود بینین».

عوسمانی ئەحمەدی: «هەموو لەسەر ئەو باوەرەین کە شەرمان لەپیشە. واباشە حیزب هەلویستی خۆی روون‌کاتەوە. با بچینە تیکۆشانی نهینی. هیزەکانی‌تر پیمان دەلین سازشکار، بەلام ئەی‌ناکا».

حەسەنی رەستگار: «پاشاری بکەین کە نەهێنەوە پادگان، بەلام ئەگەر هەر بێنەوە دەرگیری ساز نەکەین. شەر کردن لەسەر پادگان دەگەڵ دەوڵەت بە قازانجی حیزبی دیموکرات نیە».

سادقی شەرەفکەندی: «دەبێ کۆمەک لە هێزە دیموکراتیەکانی ئێران بخوازین. ئەوشەرە بخەینە دواوە. ئێستا وەختی شەر نیە. تێکۆشانی سیاسی دەست پێبکەین، لەگەڵ هێزە دیموکراتیەکان پێوەندی بگرین».

مەلا سیمایلی حاجی بۆ جاری دووەم: «ئەگەر هەر وایە با رێگا بدەین خەڵک پادگان هەڵوەشێنن. یا بچنە نێوی‌و تێدا دانیشن نەهێڵن سەرباز بێنە نێو».

ئەحمەدی قازی: «ئەگەر پاشە کشە بکەین هەم دەوڵەت چێ دەبێ‌و هەم رووحیەمان کز دەکا. موقاوەمەت‌و وتووێژی جیددی».

کەریمی حیسامی: «پێویستە رێگای وتوێژ نەبەستین. ئێستا شەر بە قازانجی ئێمە نیە. لە دنیای دەرەوە لەسەر ئەم حکومەتە باش بیر دەکەنەوە. باشترە هێزەچەکدارەکانی خۆمان لەشار بەرینە دەرو لە نێو شارەکاندا تێکۆشانی سیاسی بکەین. لەباری سیاسی‌و تەشکیلاتیەوە، خۆمان بە هێز بکەین. شەری نەغەدە نیشانیدا کە لە باری تەشکیلاتیەوە بێهێزین. لەباری نیزامیشەوە ئەو هێزەمان نیە کە بتوانین شار بپارێزین. دیسیپلین لەنێو پێشمەرگەو رێکخراوی حیزبدا لاوازە».

دوکتور قاسملو: «نەتیجەی قسەی برادەران ئەوەیە کە نابێ شەر بکەین. پێویستە هەموو فرسەتێکی هێمنانە بۆ وەدوا خستنی هاتنەوەی ئەرتەش بۆ پادگانی مەهاباد بەکار بێنین. تەبلیغ بکەین، وا نیشان بدەین کە موقاوەمەت دەکەین. کومیتەی ناوەندی نابێ مەهاباد بەجێ بیلێ».

کۆبوونەوە بە گشتی هاتە سەر ئەو باوەرە کە نابێ شەر بکەین. بەلام بۆ ئەوەی شەر نەکەین چ بکەین هیچ رێگایەک نەدۆزرایەوە. لەشکری ئێران لە رێگای ورمێ‌و میاندواوەوە هێزی کۆ دەکردەوە. ئێمەش پەیتا

پەیتا ناوی خەڵکمان دەنوسی‌و پێشمەرگەو خەڵکمان بۆ ئەم دوو ڕێگایە دەنارد بێ ئەوەی ڕێک‌و پێکی ئەرتەشی یان پارتیزانیمان هەبێ. ئێوارەیەک دەچوومە پادگان، کاک حامیدی گەوهەری خەلکی سواری ماشینان دەکردو بۆ جەبهەی دەنارد. کابرایەکی زەلامە نازانم سوار نەدەبوو یا چی کردبوو، کاک حامید شەقەزللەیەکی لێدا. من زۆرم پێ‌ناخۆش بوو. وەدەنگ هاتم گوتم: کاک حامید چۆن وادەبێ چ‌کاتی ئەوەیە. گوتی: «کورە لەگەڵی هەراسان بووم نازانم چی لێ‌بکەم». یەک دوو تانگمان تا زێنوی باراملوان دەناردو دەگەڕانەوە. سەرگورد عەباسی ڕەحمەتی ئێواران دەچوو لە لای ئەمیرئاباد‌و تالاو، هێزەکانی دەوڵەتی کە لە لای میراندواو بوون، وەبەر تۆپانی دەدان.

بە کورتی ڕوون نەبوو دەبوایە چ بکەین. پاسداریش بە تۆلەی تۆپەکانی سەرگورد عەباسی گوندەکانی سەرچنارو قەباگەندی‌و سەوزی‌و ئیدیکەیان وەبەر تۆپیان دەدا.

لە لایەکی دیکەش ڕاست لەو کاتەدا کە حیزبی دیموکرات لەسەر ئەو باوەڕە بوو کە شەڕ نەکاو لە ڕێگای هێمنانەوە مەسەلەی پادگان چارەسەر بکا، سەرهەنگ زەهیرنیژادو حەسەنی ئیمامی جومعەی ورمێ لە ڕادیۆ تەلەفیزیۆنی ئێران لەو پەڕی بێ‌شەرمی‌دا دژی حیزبی دیموکرات‌و میللەتی کورد بوختان‌و درۆیان بڵاو دەکردەوە. ڕۆژنامەکانی ئێرانیش هاوشان لەگەڵ ڕادیۆتەلەفیزیۆن ئەو درۆو بوختانانەیان دووپات دەکردەوە. بۆ نمونە درۆیەکی حەسەنی ئیمام جومعەی ورمێ نووسیبووی: «قاسملو کورەکەی ناو ناوە لینین». کە بەداخەوە هەر کوری نەبوو. یان نووسیبووی: «پاسداریان سەربڕیوەو جەرگ‌و دڵەکەیان کردۆتە کەباب». بەڕاستی تەنیا ئاخوندی عەجەم دەیتوانی ئاوا بە بێ‌شەرمی درۆ بهۆنێتەوە.

ئێمە لە مەهابادو لە پیرانشارو لە شنۆ دژی حەسەنی‌و زەهیرنیژاد

تۆمارێکی گەورەمان ئیمزا کۆ کردەوە پتر لە هەزارکەس ئیمزای کردبوو. ناردمان بۆ سەرۆک وەزیرو رادیۆو رۆژنامەکان. من وتارێکی دوورو درێژم دژی زەهیرنیژادو حەسەنی نووسیو رۆژنامەی ئایندگان بلاوی کردبۆوە.

## داوای پاسپۆرت

کاتێک دوکتور قاسملو لە تاران داوای پاسپۆرتی کردبوو، منیش هاتمە سەر ئەو بیرە کە بۆچی داوای پاسپۆرتێک نەکەم. چومە شارەوانی، کارمەندەکانی شارەوانی مەهاباد وەک پێویست بوو هەموو شتێکیان نوسیو ئامادەیان کردو گوتیان خۆمان دەینێرین بۆ ورمێ بەشی پاسپۆرت. دوای حەوتویەک زۆر بە تیرادیوی، بە هیوای وەرگرتنی پاسپۆرت چوومە ورمێ کە چوومە ئیدارەی شارەوانی بەشی پاسپۆرت، لە مەهاباد ژمارەیەکیان دابوومێ، ژمارەکەم دا بە کابرایەکو دوای ماوەیەک پەروەندەیەکیان هێناو لە پێش رەئیس دایاننا. کابرا تەماشای کردو پاش هێندێک ئەودیو ئەودیوی لاپەرەکان مات بوو. پاشان گوتی: «ئاغای عبدالکریمی حیسامی خۆتی؟»

- بەلێ خومم.

- بەداخەوە تۆ قەراری (ممنوع الخروج) یانی وەدەر نەکەوتن -ت لەسەرەو ناتوانی لە ئێران وەدەر کەوی.

- باشە ئەو قەرارە کەنگێ دراوە؟

- قەراری ئیدارەی ساواکە ساڵی ١٩٥٦.

- باشە، ئێستاش ئیدارەی ساواک ماوەو بریارەکانی هەر لە جێی خۆن؟

- ئیدارەی ساواک نەماوە، بەڵام هیچ بریارێکی تازە لەسەر هەڵوەشانەوەی بریارەکانی پێشوی ساواک بە ئێمە نەگەیشتوە.

- ئاخر ئێستا نە ساواک‌و نە شای ساواک‌و نە رژێمی پاشایەتی ماون. مانای ئەوەیە خەڵک بۆ لابردنی یاساو دابو شوێنی رژێمی پاشایەتی راپەریوەو شۆرشی کردوە. تۆ چۆن هێشتا بەیاساو بە فەرمانی ساواکەوە نووساوی؟

- ئاغای حیسامی ببەخشە من هیچ خەتام نیە. ئێمە فەرمانمان پێدراوە تا دەستوری تازەمان بۆ نەیە، قەرارەکانی پێشوو هەر وەک خۆی دەمێننەوە.

سێ کیژی جوانی ئازربایجانی لەوێ کاریان دەکرد. وادیار بوو کارمەندی تازەی ئەم ئیدارەیە بوون یا کارمەندی پێشوو بوون‌و دەرنەکرابوون. لە کابرای رەئیس وەخۆ کەوتن‌و گوتیان: «ئەوە ئابرو چوونە شۆرش کراوە، رژێم‌و ساواک گۆر بە گۆر چوون، تۆ هێشتا فەرمانی ئەوان جێبەجێ دەکەی، ئەدی ئەم شۆرشە یانی چی. خەڵک بۆچی خۆی بە کوشت داوە؟».

کابرای رەئیسیش زۆر لەسەر خۆ دەیگوت: «من هیچ دەسەلاتم نیە. سەربە مەرکەزم، هەرچی لەوێوە نەیڵێن من ناتوانم بیکەم». کچەکان دەیانگوت: «ئاغا مەرکەزی چی، فرێیاندە بێنە ئەم کاغەزە پیسانەی ساواک هەموو بسووتێنە. پاسپۆرتی ئاغای حیسامی بدە، تۆ مەگەر نایناسی». سوپاسی کیژەکانم کرد. بە کابرام گوت:

مانای ئەوەیە لەسالی ١٩٥٦وە قەراری ممنوع‌الخروجم لەسەرە.

- بەڵێ، بەداخەوە وایە.

- باشە، ئەدی ئەوە نیە خروجم کردوەو ورودیش. چوومە دەرێ لە ئوروپا بووم، ئێستاش هاتوومەوە، هەرکاتێ بخوازم دیسان دەچمە دەرو دێمەوە. تۆش لێرە ئەم بریارەی ساواک چاک بپارێزە. کچەکان لە چەپڵەیان‌داو گوتیان: «ئاغا ئەم ئیدارانە پاک نەکرانەوە».

کابرا گوتی: «من تیلگراف دەکەم بۆ مەرکەزو کەسبی تەکلیف

دەکەم».
- زۆر باشە من جارێکی دیکەش دێمەوە. یەک لە کچەکان گوتی: «هەر جوابێک بێتەوە من بۆ دەفتەری حیزبی دیموکرات لە مەهاباد دەنووسم».
سوپاسم کردن و گەرامەوە.
ئێستا کەباسی پاسپۆرت هاتۆتە گۆڕێ با بەیەکجاری ئەم حکایەتە ببڕمەوەو بەسەریدا باز نەدەم. پاش ماوەیەک چوومەوە ئیدارەی پاسپۆرت لە ورمێ. کابرا ژمارەیەکی دامێ و گوتی: «بەم ژمارەیە تێلگرافم کردوە جواب نەهاتۆتەوە». بێدەنگەم لێ کرد. شەری سێ مانگە بەسەردا هات دوای شەری سێ مانگە جارێک لە ورمێ لەگەڵ ئوستاندار باسم کرد. ئوستاندار نامەیەکی نووسی بۆ ئیدارەی پاسپۆرت کە پاسپۆرتم بدەنێ. کابرا لەگەڵ نامەی ئوستانداری جارێکی‌تر داوای کەسبی تەکلیفی لەمەرکەز کردبوو. دوای نامەی ئوستاندار جارێکی‌تر وەدوای کەوتم. کابرا نامەیەکی نیشان‌دام کە لە تارانەوە نووسرابوو: «قەراری ممنوع‌الخروج بۆ هەموو ئەو کەسانەی لەسەریانە، هەر وەک خۆی دەمێنێتەوە». لەو نامەیەدا پتر لە نیوەرۆکی شۆڕشی گەلانی ئێران حاڵی بووم. لەکاتی شەری سنەدا چوومە تاران. لەوێ بە هەڵم زانی چوومە ئیدارەی پاسپۆرت. دوای مەحتەڵ بوونێکی تەواو چوومە ژووری رەئیسی ئیدارە. سەرهەنگێک دانیشتبوو سلاوم کردو ژمارەی نامەی کابرای ورمێم دایە. بانگی کرد. ژمارەکەی دا بەکابرایەک و گوتی: «ئەم پەروەندەیە بێنە». کابرا رۆیشت و پەروەندەیەکی ئەستووری هێنا لەبەر دەمی دانا. تۆزێک تەماشای کردو گوتی:
- ئاغای حیسامی کێیە؟
- من، حیسامیم.
- بەراستی هەر بۆخۆتی... ئاغای عبدالکریم حیسامی تۆی؟
- بەڵێ... خۆمم. تا ئەودەم هەروا لەسەر پێی وەستابووم. گوتی:

«فەرموو وەرەدانیشە». دانیشتم گوتی: «پێم نالێی چۆن هاتویە تاران؟ مەحافیزت لەگەڵە؟».
- تاران وڵاتی خۆمەو هاتووم، موحافیزیشم گەرەک نیە.
- پێم سەیرە، ئەوەتا... لە وەزارەتی کیشوەرەوە نووسراوە ئەگەر بۆ پاسپۆرت موراجعە بکەی بتگرن. دەزانی چەمران ئێستا مەسئولی ئەم بەشەیە. پاشان گوتی: «ناوی ۳۷٤ کەسمان بۆ هاتوە کە ئەوانە حەقیان نیە لە وڵات وەدەر کەون. نابێ پاسپۆرتیان بدرێتێ. یەکیان تۆی، ناوی ئاغای قاسملوش لەگەڵیانە».
گوتم: زۆر سوپاس، باشتر بوو لەخۆمان گەیشتین. ئەمجارە خۆمان بەسەربەستی دەچینە دەرو دێینەوە. بانگی کرد چایان هێنا. گوتی: «دوو پرسیارم هەن. یەکەم مەبەستی ئێوە لە خودموختاری چیە؟ یانی ئەگەر کوردستان خودموختار بوو من ئەشێ بە پاسپۆرت بێمە مەهاباد؟».
- جەنابی سەرهەنگ چۆن شتی‌وا دەفەرموی. مەهاباد بەشێکە لە ئێران. ئێمە دەمانەوێ لەجیاتی ئەوەی مەعموری فارس‌و تورک لەکوردستان لەسەر خەڵک حکومەت بکەن با خەڵکی کورد خۆی چارەنووس‌و کاروباری خۆی بگرێتە دەست. با لەتاران مەعمورمان بەسەردا نەسەپێنن. دەمانەوی بە زمانی کوردی مەدرەسەو کتێب‌و رۆژنامە هەبێ. تۆ فەرموو هەر ئێستا وەرە مەهاباد، بزانە ئەوەی لێرە دەینووسن هەمووی درۆیە یان نا؟
گوتی: «ئێوە بۆ سیستمێکی وەک ئەمریکاتان ناوێ. لەوێ هەر ئەیالەتەی حکومەتی خۆی هەیە. مەرکەزیش سیاسەتی جیهانی‌و شەر بەرێوە دەبا. من لە ئەمریکا بووم. لە هێندێ ئەیالەت لیباسی پۆلیسیشیان جیایە».
گوتم: خۆ ئێمە کەمتریشمان داوا کردووە، وادەمانکوژن.
- پرسیارێکی دیکەشم هەیە. ئێستا لە سنە شەرە، ئەوەی لێرە دەینووسن

دەڵێن سێ‌یا پێنج پاسدار کوژراون ڕاستە؟
- نەخێر هەمووی درۆیە. ڕۆژێ واهەیە سەد پاسداریش دەکوژرێ، لە ترسی بیروڕای گشتی ناوێرن ناویان بڵاو بکەنەوە.
- ئێمەش لێرە هەر پێمان وایە. ئەوانە درۆ دەکەن. پاشان گوتی: تۆ ناتوانی شتێکی‌تر بکەی؟ سجیلێکی دیکە پەیدا کە، دەهەزارتمەن لە بانگی دابنێ، بۆ ئەوەی بەڵگە بێ کە تۆ لە تاران دەژی‌و کاسبی دەکەی. پاشان وەرە پاسپۆرتت دەدەمێ‌و تەواو دەبێ». سوپاسم کردو وەدەر کەوتم.

# چەکدار کردنی دەرەبەگی کورد

دوای شەری نەغەدە حکومەتی جمهوری ئیسلامی وەک هەموو دەسەلاتدارانی دووژمنی کورد، ویستی لە نێوخۆدا هۆزە بۆدار بتاشێ‌و لە کوردستان بە کورد دووژمنایەتی حیزبی دێموکرات بکات. دەستی کرد بە چەکدارکردنی دەرەبەگەکان بۆ ئەوەی بەگژ حیزبی دیموکراتیان‌دا بکا. دەڵێم: بەگژ حیزبی دیموکرات‌دا. چونکە بەراستی دەوڵەت حیزبی دیموکراتی بە هێزو بە تەرەفی خۆی دەزانی‌و حیسابی لەسەر دەکرد. رێبەرایەتی حیزبی دیموکراتیش تا رادەیەک بەوە لەخۆبایی بوو، شەرو کێشەی تەنیا داویشتە سەر ئەستۆی خۆی، بەومانایە کە هەر خۆی لەکوردستاندا بەهێز دەزانی. لەکاتێکا دەکرا هێزەکانی دیکەش یان کەسان‌و سەرۆک عەشیرەت‌و دەرەبەگی دیکەش بێنێتە نێو خەبات‌و بەشداری کاروباری وڵاتیان بکاو بە قەولی کاک حەسەنی قزلجی رەحمەتی «دەستیان بە زاخاکا». دەرەبەگی کورد بەشی هەرە زۆریان بۆ خزمەتی بێگانەو دووژمنایەتی لەگەڵ هێزی ئازادیخوای کورد سەری پێوە نەبووە. جا بە تایبەت ئەگەر مەسەلەی چەک‌و تالانیش هاتبێتە گۆرێ. مەنگورەکانی دەوروبەری مەهاباد خۆیان بە شەریکە بەشی تالان‌و برۆی سەربازخانە دەزانی‌و دەیانەویست حیسابیان لەسەر بکرێ‌و بەشداری کاروباری هەریمی مەهاباد بن. دیارە مەبەستی ئەسلیشیان وەدەست هێنانی هێندێ چەک‌و کەڵو پەڵی‌ترو گێرانەوەی دەسەلاتی ئاغایەتی

پێش ئیسلاحاتی زەوی شا بوو. هەرچەند مامە غەنی سەبارەت بە کپ کردنی هەراو کێشە، بەو مانایەش کە لەگەڵ برایم ئاغای نەوزەری خزمایەتی هەبوو، زۆری هەوڵدا ئارامیان بکاتەوە. وەک لە بیرم بێ، جارێکی ١٢ تفەنگیشی دا بە مەنگورەکان، بەڵام فایدەی نەبوو، ئەوان لە کیتکە بنکەی خۆیان دانابوو، دەیانەویست وەک زەمانی شکاکان باجی رێگا وەرگرن، مەنگورەکان بەوەش وازیان نەهێنا، چوون نیزیکەی ٢٢. تفەنگیان لە ژاندارمەری وەرگرت. ئاغاکانی زەرزاش بەدوای ئەواندا ١٢. تفەنگیان وەرگرتبوو.

ئاشکرایە لە هەلو مەرجێکی ئاوا ناسکدا، بەتایبەت کە حکومەت پێگەو پشتیوانی لە کوردستاندا نەمابوو، دەیویست لە رێی چەکدار کردنی ئەو خاوەن موڵکانە پێگەیەک بۆخۆی ساز بکاو بیانکاتە بەرهەڵستی حیزبی دیموکرات، ناچار دەبوایە پێشی ئەو چەکدارانە بگیرێ. نەک هەر حکومەتی ئێران، بەڵکو رژیمی بەعسی عیراقیش بۆ کوردستانی ئێران نەخشەیەکی ئەوتۆی هەبوو. ئەویش کرێخاو ئاغای خۆفرۆشی چەکدار دەکردن.

دەرەبەگی کورد کە چەکیان وەردەگرت. نەک هەر بۆ دژایەتی حیزبی دیموکرات بوو، بەڵکو بەر لە هەموو شت دەسەر رەعیەتو مسکێنی گوندیان دەکرد کە خەرجو مولکانەی دەسالی رابردووشیان بدەنێ. بریاردرا کە چەکەکان لە ئاغایانی مەنگور وەربگیرێنەوە. دیارە لەو کارەدا هێندێ توندرەوی کرابوو. حیزب چەکی قورسو تانکی بردبووە سەر مەنگورەکان کە رێگای سەردەشت مەهابادیان گرتبوو. پاشان لە کومیتەی ناوەندیدا لام وابە رەخنە لەو توندرەویە گیرا. هێندێ سەرلقو بەرپرسی پێشمەرگە لە ماڵی ئاغاکان شتیان هێنابوە دەرێ. نامەیەکی ئاغاکانی قولقتەپەم لە لایە کە نووسخەیەکیشیان بۆ دەفتەری سیاسی حیزبو بۆ کومیتەی ناوەندی بۆ کاک ئەمیری قازی ناردوە، شکایەتیان

لەبەرپرسێکی حیزبی کردووە کە تفەنگو خەنجەرو دووربینی لێ‌ئەستاندوون. بەداخەوە دەقی نامەکە لەدەست‌دا نیەو لە ولات پارێزراوە بەڵکو لە دووا رۆژدا بڵاو بکرێتەوە.

١٩٧٩/٦/٢٥ بۆ ئەستاندنەوەی چەکەکان لەبەری مێرگان لە گوندی قەلات سەید رەسو لەگەڵ مەنگوران تووشی شەر دەبێ‌و لام وایە یەک لە ئاغاکان دەکوژرێ. لە کێتکەو دەوروبەری مەهابادیش پێشمەرگە بلاوەیان پێ‌دەکات. ئاغاکانی مەنگور رادەکەن‌و دەچنە پادگانی پیرانشارو جەلدیان. لە دەفتەری سیاسی هاتبوونە سەر ئەو بریارە کە بۆ ئاشتکردنەوەیان هەنگاو باوێژرێ‌و کارێکی وا بکەین کە بێنەوە سەر جێ‌و رێ خۆیان. بە تایبەت لەشکری ٦٤ی ورمێ نەخشەی ئەوە بوو کە لە هەموو ناوچەکانی کوردستان چەک بلاو کاتەوە.

دەفتەری سیاسی بریاری‌دا من‌و مامە غەنی بچینە جەلدیان‌و پیرانشار، ئاغاکانی مەنگور دلخۆشی بدەینەوەو ئاشتیان کەینەو بیانبەینەوە سەر گوندەکانی خۆیان. وامان بە باش زانی دەپێشدا بچینە شنۆیە چاومان بە کاک مەسعود بارزانی بکەوێ. لە رێگای ئەوانیشەوە لەگەڵ لەشکری ٦٤ی ورمێ هەوڵ بدەین کە دەست لە چەکدارکردنی ئاغاکان‌و لە گیرەشێوێنی هەلبگرێ‌و با تووشی شەرو پێک هەلپرژان نەبین.

ئەودەم کاک مەسعود لەگەڵ کاک سامی‌و هێزێکی بارزانیان هاتبوونە ناوچەی شنۆو لەگوندی شاوانە بارگەو بنەیان بە عەرزی دادابوو. ئێمە وەک حیزبی دیموکرات پێمان‌وابوو هاتنەوەی بارزانیەکان بۆ مەلبەندی کوردستانی ئێران بۆ ئەو مەبەستەیە کە دەچنەوە کوردستانی عیراق‌و خەبات درێژە پێ دەدەن. لەو ئامانجەدا ئێمە هانیشمان دەدان‌و یارمەتیشمان پێ‌دەکردن. لەگەلێک شوێن لەبارەی جێگای حاوانەوەو خانوبەرە یارمەتیمان دەدان. نموونەی ئاوا زۆر بەدەستەوەن. یەک لەوان هاتنەوەی حەسۆمیرخان بوو. رۆژێک کاک ئەمیری قازی حەسۆمیرخانی

هێنا لای منو گوتی: «ئەوە بارزانیەکان وردە وردە دەیانەوێ بەرەو سنوری عیراق بگەڕێنەوەو بچنەوە ولاتی خۆیان خەبات بکەن. کاک حەسۆش ئەوە هاتوەو بەلاَم لەباری شوێنو جێگای حاوانەوە لە تەنگانەدان. پێم خۆشە وا بکەی لە خانوەکانی شیرکەت لەشاروێران یا لە خەلیفەلیان چەند خانویەکیان بدەنێ». هەرچەند حەسۆمیرخان ئەو پەری خراپەی لە پشدەر لەگەڵ برادەرانی ئێمە کردبوو، من وەک بەرپرسی تەشکیلاتی مەهاباد نامەم دایە لە شیرکەتی شاروێران خانویان دانێ.

ئێمە هەر بەو ئامالجەو خەیالە لە هاتنەوەی بارزانیەکان، یا بە قەولی ئەوەدەم (هێزەکانی قیادەی موقەت) پێشوازیمان دەکرد. بەلاَم بە داخەوە شەری پارەو شەری شنۆ دەریان خست کە بۆ یارمەتی حکومەتی ئیسلامی ئێران دژی حیزبی دیموکرات هاتبوونەوە ناوچەی کوردستان. بەڵگەی رەسمیو زیندووی حاشا لێنەکراوم لەم بوارەدا کەوتنە دەست کە لێرە بەدەستەوە نێنو لە ولاَت پارێزراون.

رۆژی ١٩٧٩/٦/٢٧ لەگەڵ مامە غەنی سوار بووین چووینە شاوانە. لە کن کاک مەسعود فراوینمان خوارد. دوای باسی بارودۆخی کوردستانو یەک بیرورا لەمەر ئاشتیو هێمنایەتیو پشتیوانی لە کۆماری ئیسلامی، هاتینە سەر ئەو باوەرە کە منو کاک سامی بچینە ورمێو لەگەڵ کاک ئیدریسی رەحمەتی بچینە کن فەرماندەی لەشکرو بە درێژی قسەی لەگەڵ بکەین. کاک سامی چەند پێشمەرگەیەکی لەگەڵ خۆی سوار کردو کەوتینە رێ. مامە غەنی بەجێ‌ما. لە گوندی بالانیش چەکەکانیان لە پشتی ماشیندا تاقەت کردو چووینە میهمانسەرای ورمێ کاک ئیدریس لەگەڵ چەند ئاغاو دەرەبەگی هەرکیو شکاک لەوێ بوو. پاش حەسانەوەو قاوە خواردنەوە، کاک ئیدریسمان تێگەیاند کە بۆچی هاتووین. گوتی: «هەستە با هەر ئێستا بچینە کن فەرماندەی لەشکر». ئیتر بێ‌ئەوەی تەلیفون بکا یا خەبەری بداتێ رابووین. لەبەر دەرگای

میهمانسەرا کە دەچووینە دەر ئاوری داوە بە کاک سامی گوت: «تۆ لە چی دەگەڕێی؟ تۆ مەیە». ئیتر کاک سامی گەڕایەوە. من ئەو جۆرە دەنگدانەم زۆر گران هاتە بەرچاو.

کاتێک چووینە ستادی لەشکری ٦٤، سەرگورد سادقی سەرۆکی ستادی لەشکر لەوێ بوو. سادقی منی نەدەناسی‌و کاک ئیدریسیش منی پێ‌نەناساند. زۆر بەگەرمی بەخێرهاتنی کردین‌و دایمەزراند. سادقی بە کاک ئیدریسی گوت: «تۆ نابێ خۆت بە عیراقی حیساب بکەی. ئێمە لە هاوکاری تۆ فرە مەمنونین. تۆ هەر لە خۆمانی». دیار بوو کاک ئیدریس دەیویست لەو باسە هەتلەی بکاو بیباتە سەر باسێکی‌تر. کابراش هەر لەسەر هاوکاری دەڕۆیشت. لەپڕ سەرهەنگ زەهیرنیژاد فەرماندەی لەشکر وەژوور کەوت. کەمنی بینی گوتی: «ئەوە ئاغای حیسامی چۆن هاتۆتە لەشکر». پاشان تۆقەی لەگەڵ کردین‌و بەخێرهاتنی کردین. سەرگورد سادقی کە ناوی منی بیست قوت بوو. گوتی ببوورە ئاغای حیسامی، جەنابی ئیدریس‌خان لە پێشدا تۆی موعەریفی نەکرد. دیار بوو زۆر شتی درکاندبوو کە پێویست نەبوو لە لای من بیدرکێنێ. لەگەڵ زەهیر نیژاد هاتینە سەر باسی چەکدارکردنی ئاغاکان‌و سازبوونی شەڕو کێشە لەکوردستان. گوتی من هیچ ئاگاداری چەکدار کردنی خاوەن مولکان نیم. ژاندارمەری ئەو کارەی کردوە. من لە ژاندارمەری دەپرسم». کاک ئیدریس بە درێژی لەسەر ئەمنیەتی ناوچە قسەی کردو گوتی: «ئێمەش بە نۆرەی خۆمان هەموو حەوڵ‌و تەقەلامان ئەوەیە کە لە کوردستان ئاژاوە ساز نەبێ‌و هەموومان لە حکومەتی ئیسلامی بەرێبەرایەتی ئیمام پشتیوانی دەکەین».

بە کورتی سەفەرەکەمان بێ ئەنجام بوو. وەلامی فەرماندەی لەشکر هەر ئەوە بوو: «لە ژاندارمەری دەپرسم» هاتینەوە میهمانسەراو لەگەڵ کاک سامی گەڕاینەوە بۆ شارانە.

ئێمە لەگەڵ مامە غەنی ساز بووین کە بچینە پادگانی چەلدیان و ئاغا مەنگورەکان ببینین. برایم ئاغای کا قادری لەوێ بوو لەگەڵ خزمان بیبەینە پیرانشار و ئاغاکانی دیکەش ئاشت کەینەوە. کاک مەسعود گوتی: «کەوایە منیش دێم و دەچین دڵخۆشیان دەدەینەوە. لەگەڵتان دێمە پیرانشاریش».

کاک مەسعود لەگەڵ ئەوە کە وای دانێین لەبەر خاتری مامە غەنی لەگەڵمان دەهات، بەلام مەبەستی سەرەکیشی خۆ تێهەڵقورتاندنی کاروباری ناوچەو ناکۆکی حیزب و ئاغاکان و نیشاندانی دەوری خۆی لەناوچەدابوو. چوونکە لە ساڵی ١٩٧٥وە دوای ڕۆیشتنی مەلامستەفای ڕەحمەتی، ئیدریس و مەسعود نەهاتبوونە پیرانشار. ڕێکخراوەکانی کۆمەڵەو چریکی فیدایی و هێندێ تاقمی سەر لێنشێواویش کە لە تاران ڕاونرابوون، لە کوردستان قورسایی کارو تەبلیغات و نووسینیان خستبوە سەر دژایەتی بنەماڵەی بارزانی و قیادەی موەقەت.

کاک مەسعود ساز بوو، لام وایە شەش ماشێنی پڕ لەبارزانی چەکدار کەوتنە ڕێ. چووینە پادگانی چەلدیان، برایم ئاغای کاقادری و عەلی باپیرئاغای کەوپەرو یەک دوو ئاغای‌تر لەوێ بوون. لەگەڵ سەرهەنگ شابازیان فەرماندەی ژاندارمەری تۆزێک باسی وەزعمان کردو ڕەخنەمان لە ژاندارمەری گرت، کە بۆچی ئەو چەکانە بلاو دەکاتەوە. پاشان داوامان لێکرد کە بانگی ئاغاکان بکا بێنە لامان، ئەوان لە ژوورێکی دیکە بوون. برایم ئاغاو عەلی باپیرئاغای هاتن. بە گەرمی بەخێرهاتنمان کردن. مامەغەنی کە ئاوالزاوای برایم‌ئاغا بوو، زۆری دڵخۆشی داوە، کاک مەسعودیش لەسەر یەکێتی و ئاشت بوونەوە جوان قسەی کرد.

عەلی باپیرئاغای دەستی پێکرد دژی حیزبی دیموکرات و گوتی: «ئێوە چەکی پادگانی مەهابادتان هەموو دا بەعیراق». گوتم: کا عەلی وەختی ئەو قسانە نیە، بەم قسانە لە لای ژاندارم خۆشەویست نابی. چەکی

پادگانی مەهاباد بە دەست پێشمەرگەوەبە بۆیە تۆ دەرپەڕیوی‌و هاتووی لە پەنای ژاندارمەدا دەژی. برایم ئاغا گوتی: «کاک کەریم ئێمە خەتابارین، دەبێ ببوورن ئەو شتە وای لێ‌هات. ئێمەش نەماندەویست بگاتە ئەو رۆژە».

تکامان لە برایم‌ئاغا کرد کە لەگەڵ ئێمە بێتە پیرانشارو مەنگورەکانی دیکەش رازی بکاو ئاشت بینەوەو بچنەوە سەر مولک‌وماڵی خۆیان. برایم ئاغا ئاغاکانی دیکەشی بانگ کردو دەست کرا بە نازو گلەیی‌و ئاشت بوونەوە. بەتێکرایی بریارمان‌دا کە پادگانی جەلدیان بەجێ بێلن‌و بچنەوە گوندەکانی خۆیان. غەنی بلوریان نامەیەکی بۆ سەید رەسوی بابی گەورە نووسی‌و پاشان چووینە پادگانی پیرانشار. ئاغاکانی دیکەشمان چاو پێکەوت‌و بریاردرا هەر ئەو رۆژە پادگانی پیرانشار بەجێ بێلن. ئێمە دەچووینە پیرانشار کاک مەسعود لەگەڵمان هات بۆ پیرانشارو چووینە فەرمانداری. کەخەبەر بڵاو بۆوە مەسعود بارزانی هاتووە کۆمەڵەو فیدایی‌و دەستەو تاقمی دیکە خەڵکێکی یەکجار زۆریان کۆکردبۆوەو بازاریان داخستبوو دژی هاتنی مەسعود بۆ پیرانشار مێتینگ‌و کۆبوونەوەیان ساز کردبوو. ئێمە لە ژووری فەرمانداری بووین، دوکتور کەمال یەکێک لە کادرەکانی قیادە موقەت کە پێشتریش لەگەڵ ئێمە پێوەندی هەبوو، لە شەری نەغەدەش بریندار ببوو، هاتە ژووری‌و بانگی کردم بچمە دەرێ. دوکتور کەمال گوتی: «ئەگەر نەیەی‌و ئەم خەڵکە ئارام نەکەیەوە، لەوانەیە ئاژاوە ساز بێ‌و وەزع تێک بچێ. خەڵکێکی زۆر کۆبۆتەو بازار داخراوەو دژی کاک مەسعود شوعار دەدەن».

چوومەوە ژووری‌و بە مامەغەنیم گوت: وەزعی شار ئاوایە چ بکەین؟

– بچۆ بە خەڵک بڵێ کاک مەسعود میوانی ئێمەیەو بەخێرهاتنی دەکەین. خۆشت هەرچی دەیزانی بیلێ‌و بڵاوەیان پێ بکە». کە چووم عالەمێکی زۆر کۆ ببۆوە. هێندێ کەس بە نێویاندا دەگەران‌و هانیان

دەدان کە بۆ پێش فەرمانداری بێن. چوومە سەر بەرزایی رۆخی شەقامو لەپێشدا بەخێرهاتنی خەڵکم کرد. لەبارەی یەکێتیو باروودۆخی کوردستانو سیاسەتی حیزبەو دەستی ئاژاوەنانەوەی کاربەدەستانی حکومەت قسەم کرد. پاشان گوتم: ئەمڕۆ ئێمە بۆ یەکێتی خەڵک لە کوردستان هەوڵ دەدەین. ئاغا مەنگوڕەکانمان هێناوەتەوە ئاشتمان کردوونەتەوەو دەچنەوە سەر موڵکو ماڵی خۆیان. کاک مەسعود بارزانی لەگەڵمان هاتووەو میوانی ئێمەیە. نامانەوێ هیزێکی ئازادیخوازی کوردستانی لە بزووتنەوەی رزگاریخوازی کورد جیا بکرێتەوە. بە ناوی حیزبی دیموکرات تکا لە خوشکو برایانی بەرێز دەکەم کۆبوونەوە کۆتایی پێبێننو بڵاوەی بکەن.

خەڵک بە هاواری بژی حیزبی دیموکرات پێشوازی لەقسەکانم کردو بڵاوەیان کرد. هاتمەوە فەرمانداریو کاک مەسعودمان بەرێکرد گەڕایەوە بۆ شاوانەو منو مامەغەنیش گەڕاینەوە بۆ مەهاباد. رۆژی دوایی بڵاوکراوەیەکی رێکخراوی فیدائیانی خەڵک لەگەڵ هێرشێکی توند بۆسەر قیادەی موقەتو بارزانیەکان نوسیبووی: «کەریمی حیسامی، مەسعود بارزانی هێناوەتە پیرانشارو گوتوویە میوانی ئێمەیە»!.

# چەکدار بوونی زەرزاکان‌و هەرای شنۆیە

دوای هەرای مەنگوران‌و چەک کردنی ئاغاکان، دەولەت وازی لە سیاسەتی چەکدارکردنی دەرەبەگی کوردو ئاژاوەنانەوە نەهێنا. ئەمجار ئاغاکانی زەرزای چەکدار کرد. سولەیمان‌خانی زەرزا ١٢٠ تفەنگی برنۆی لە ژاندارمەری ورمێ وەرگرتبوو بەسەر ئاغاکانی زەرزادا دابەشی کردبوو. ئەوانیش هەر دەست لە جێ لەسەر رەعیەتەکانیان کردبوو کە دەبێ خەرج‌و باج‌و مولکانەی دەسالەی رابردوو بدەن. وەرزیرەکانی مەلبەندی شنۆ لە هەموو گوندێکەوە روویان کردبۆوە تەشکیلاتی حیزب. کومیتەی تەشکیلاتی شنۆ گورج چەکداری کۆ کردبوونەوەو شنۆی گەمارۆ دابوو. لەسەر ئاغاکانیان کردبوو ئەگەر سبەینێ تا سەعاتی دوازدەی نیوەرۆ چەکەکان نەدرێنەوە بە تەشکیلات، تالان‌و کوشتاری ئاغاکان دەست پێدەکەین. لە هەموو مەلبەندی شنۆ هەر کەسێکی چەکی هەبوو رووی کردبوە شارو وەزعی شاری شنۆ شلەژابوو. رۆژی ١٩٧٩/٦/٣٠ سەعات پێنجی بەیانی زرەی تەلیفون رای‌پەراندم. مامە غەنی بوو بانگی کرد: «کاک کەریم هەر ئێستا بگە دەفتەری حیزب منیش ئەوە بۆ وێ دەچم. وەزعی شنۆ ئالۆزە. ئاغاکانی زەرزا دەورە دراون. سولەیمان خان نیوە شەو دەرپەریوەو ئێستا ئەوە لێرەیە. ئەگەر نەگەیە شنۆ لەوانەیە خوێنێکی زۆر بڕژێ».

هەستام لە بێشدا ریشم تاشی‌و چوومە دەفتەری حیزب. پێشمەرگەیەکم نارد کاک حوسێنی بەخشی‌و مەلا سەید ئەحمەدی سەعدەیی بانگ کات. کە چووم سولەیمان‌خانی زەرزاو ئاغایەکی‌تر لە دەفتەری حیزب بوون. مامە غەنیش گەیشتێ. سولەیمان‌خان گوتی: «ئێمە فەقیرین، ئەو ئاغایانە هیچیان نیە. ١٢٠ تفەنگم لە ژاندارمەری وەرگرتوە کە بە ناوی پارێزەری سنور هەر ئاغایەی مانگێ ٥٠٠ تمەن وەر بگرێ. ئێستا دەورەێ مالەکانمان دراوە، ئەگەر نەگەنێ دەبێتە فرتەنەو خوێن دەرژێ. کاک کەریم وەرە چەکەکان وەربگرەوە با ئەم ئاگرە بکوژێتەوە.

بریارماندا بچمە شنۆ تفەنگەکان وەرگرمەوە. گوتم: تەلیفون بۆشنۆ بکەن کەوا من کەوتوومە ڕێ‌و دەست رابگرن. حوسێنی بەخشی‌و سەید ئەحمەدی سەعدەیم هەلگرت‌و کەوتینە ڕێ. من لەگەلْ سولەیمان‌خان سواری ماشێنی ئەوان بووم‌و حوسێنی بەماشێنی مەلا سەید ئەحمەدی بە دووای ئێمەدا. مارف‌ئاغا کە ماشێنی داژوا، ئەوەندە بە پەلە بوو نەیدەزانی چۆن داژوێ.لە نەغەدە تێ‌پەرین.لە پێچەکانی گوندی ئاغچەزێوە دیتم ماشێن بەرەو کەندالی چۆم دەرواو لەسەر هەلْدێرگەیە کە بچینە نێو گادەرو تەرت‌و توونا بین. دەنگم دا کورە هەلْدێراین. کابرا لە تاوان بە خێرایی ١٢٠ کیلۆمیتر بەرەو چیا بای‌داوە. ئەمجارە پێشی ماشێنی دەکەندالی رۆخی جادە کوتاو ماشێن وەسەر پشت‌٠گەراو کوژایەوە. مەلا سەید ئەحمەدو حوسێنی بەخشی گەیشتنێ. بە زەحمەت ئێمەیان هێنا دەرێ. من و شۆفێر ساغ بووین، بەلام سولەیمان‌خان پشتی زەحمەتی دیبوو خۆی رانەدەگرت. ماشینەکەمان راست کردەوە هەلْ نەدەبوو. من‌و سولەیمان‌خان سواری ماشێنی مەلا سەید ئەحمەدی بووین‌و رۆیشتین. حوسێن بەجێ‌ما کە لەگەلْ مارف‌ئاغا ماشینەکەی بگەیێنێتەوە شنۆ. گەیشتینە نێو شار وەزع ئالۆز دەهاتە بەرچاو. چەکدار لە هاتوچۆدا بوون. خەلک لە مزگەوت کۆببۆوە، کاک یوسفی ریزوانی لە ئێویان بوو

قسەی بۆ دەکردن‌و گۆتبووی چارەروان بن ئێستا کاک کەریم دەگاتێ.
یەکسەر چوومە مزگەوت‌و لە بلیندگۆ داوام لە خەلک کرد ئارام بن. گوتم: هیچ کەس حەقی نیە دەست درێژی بکاو ئاژاوە بنێتەوە. ئاغاکان چەکەکان دەدەنەوە، ئەم مەسەلەیە دەبێ بە هێمنی چارەسەر بکرێ.
ئەندامێکی کۆمەلە لام وایە کاک موحسنی کوری مامۆستا مەلا سالحی بوو هاتە پشتی میکرۆفۆن‌و قسەی سوکی بە ئاغاکان گوت. یەک دوو ئاغا هەستان وەلامیان دایەوەو دەهات وەزع بشێوێ. من هەستام گوتم: نابێ لە شنۆیە ئاژاوەو شەر ساز بێ. ئێمە رێگا نادەین. سێ‌چوار چەکداری کۆمەلە لە مزگەوت بوون. هەستان وەدەر کەوتن. ئێمە لەو باس‌و قسانەدا بووین خەبەریان هێنا کە پێشمەرگە مالی عیسمەت‌خانی زەرزایان دەورە داوەو لەوانەیە ببێتە شەر. وەدەر کەوتم کە چووم سەید وەفا نارێک کە خۆی بەکادری حیزبی دەزانی مالە عیسمەت خانی گەمارۆ دابوو. چوومە ژووریێ دوو تفەنگی لە لابوون لێم وەرگرتەوەو سەید وەفام ناردەوە بۆ رێکخراوە.
ئاغاکانی زەرزا کە کەوتبوونە تەنگانە چووبوونە شاوانە لای کاک مەسعود بارزانی. من لە تەشکیلات بووم نامەیەکی کاک مەسعودم بۆهات. نووسیبووی: «دوای سلاو کاک کەریم وادیارە وەزعی شنۆ ئالۆزە. چونکە ئێمە لەم ناوچەیەین، باش نیە وەزع تێک بچێ. لەبەر ئەوە وام پێ باشە جارێ دەست لە ئاغاکان مەدەن. پاشان من قسەیان لەگەل دەکەم‌و مەسەلەی تفەنگەکانیش چارە سەر دەکرێ».
من گورج لە وەلامدا بۆ کاک مەسعودم نووسی: «ئەم مەسەلەیە پێوەندی بە ئێمەوە هەیە. دەفتەری سیاسی بریاری داوە ئەو چەکانە وەربگرینەوە. تکایە ئێوە دەست لەکارو باری ئێمە مەدەن یا خۆمان ئەو مەسەلەیە چارە سەر بکەین».
پاشان چوومە کن سولەیمان خانی پشتی‌ژانی دەکردو راکشابوو.

سولەیمانخان گوتی: «من ناردوومە هەموو چەکەکان کۆ بکەنەوەو بیانهێننە ئێرە. تکام ئەوەیە هەتا شەو دەست راگرن. ئێمە ئابڕومان دەچێ‌و لە نێو خەڵکدا سووک دەبین. شەو ماشین بنێرەو تفەنگەکان بەرەوە یا ئەو هەرایەش بکوژێنەوە».

من دەمویست بە هێمنی چارەی مەسەلەکە بکەرێ. لە تەشکیلاتیش برادەری وا هەبوون لایەنگری توندو تیژی بوون. بە سولەیمان خان-م گوت بنێرە تفەنگەکان کۆبکەنەوە شەو دێم دەیانبەمەوە. لە ماڵی سولەیمان خان گەرامەوە خەبەریان هێنا کەوا عیسمەتخان‌و سمایلخانی زەرزا رایانکردوەو چوونە ورمێ. برادەرانی رێکخراوی شنۆ لایان وابوو کە درۆ دەکەن، خەریکن بۆ بەرەرەکانی خۆیان ئامادە بکەن. خەبەرێکی دیان بۆ هات کە گۆیا عیسمەتخان‌و سمایلخان چوونە لای حەمەدەمین چیچۆ کە بەهاواریانەوە بێ. برادەرانی کومیتەی شار دانیشتین بریارماندا چەکدارەکان کۆبکرێنەوەو لە دەوروبەری شار لە شوێنی پێویست‌و جێگای بەرگری خۆ قایم بکەن‌و ئامادە بن. هێندێ پێشمەرگەش بنێرینە دەرەوەی شار سەر رێگای ورمێ- شنۆ. نامەیەکم بۆ کاک مەسعود بارزانی نووسی‌و کاک نەبی قادری نامەکەی برد. بۆ کاک مەسعودم نووسی کە خەبەرێکی ئاوامان زانیوە. ئێمە پێشمەرگەمان ئامادەیەو بۆسەر رێگاشمان ناردووە. پێم خۆشە تۆش خەبەر بدەی بە حەمەدەمین چیچۆ کە بیر لە هاتنی شنۆ نەکاتەوە.

کاک مەسعود لە وەلامی نامەی مندا نووسیبووی: «کاک کەریم بۆ ئەوەی کیشەکە گەورەتر نەبێ. باشترە مەسەلەکە بە خۆشی چارەسەر بکرێ. ئێمە دەتوانین پاش چەند رۆژ ئەم چەکانە وەربگرینەوەو هیچ هەراشی لێ‌ساز نەبێ». دەقی نامەکانی کاک مەسعود لەگەڵ سەنەدو بەڵگەی دیکە بەداخەوە لێرەدا بەدەستەوە نین‌و لە ولات پارێزراون.

لە لایەکی‌تر لەگەڵ هەرای شنۆ لە جەلدیانیش هەرا ساز ببوو،

رەحمانی کەریمی دەگەڵ هێندێ پێشمەرگە چووبووە سەر کاک عەولای جەلدیانێ. هێندێ بارزانیش لەوێ بوون پارێزەریان لە کاک عەولا دەکرد. کاک عەولای قادری نامەیەکی بۆ من نووسیبوو داوای کردبوو کە کارێکی وابکەم پێشمەرگە بکشێنەوەو با شەرو کێشە ساز نەبێ.

من نامەیەکم بۆ کاک رەحمانی کەریمی نووسی‌و کاک نەبی قادری نامەی بردو چوە جەلدیان. بۆم نووسیبوو کە کارێکی وا نەکا لەوێ لە پەنا پادگان شەرو کێشە ساز بێ. لەدەوری جەلدیان بکشێتەوە.

شەو لەگەڵ چەند پێشمەرگە چووینە ماڵی سولەیمان‌خانی کە تفەنگەکان وەرگرینەوە. پاش چاخواردنەوە گوتم: کوا تفەنگەکان لە کوێن. با پێشمەرگە بیانبەنە نێو ماشێن. سولەیمان‌خان گوتی: «هێشتا هەموویان نەهێناونەوە، تۆش رەزعی ئێمە لەبەر چاو بگرە». لەو قسانەدا بووین عبدالمهیمینی برازای مەلا مستەفاو حەمید ئەفەندی کادری چەکداری بارزانیەکان هاتنە ماڵی سولەیمان‌خانی. لەگەڵ هاتنی ئەوان یەک دوو قولە ئاغای زەرزا وەدەنگ هاتن‌و گوتیان: «کاک کەریم ئێمە ئەو تفەنگانەمان بۆ دوژمنایەتی حیزبی دیموکرات وەرنەگرتوە. ئەو هەرایە بەخۆرایی ساز بووە. ئەگەر لە لای ئێمەش بن هەروا بزانە بە دەست پێشمەرگەی خۆتانەوەن». گوتم: تازە لەوەی دەرچوە، ئەو تفەنگانە لە حکومەت وەرگیرابوون بۆ دژایەتی خەلک، من لەبەر خاتری سولەیمان‌خان هاتم کە بە بێ شەرو خوێن رێژی مەسەلەکە تەواو بێت. بێجگە لە وەرگرتنەوەی تفەنگەکان هیچ رێگای دیکە نیە.

حەمید ئەفەندی هەڵی دایەو گوتی: «ئێستا ئەم هەرایە چیە؟ ئەم خەڵکە چی دەوێ؟ وەڵاهی من بم پەنجا کەلاک لەم شارە دەخەم». بە توورەییەکی کەجارویار بەسەرمدا دێ دەرهەڵ بووم‌و گوتم: «حەمید ئەفەندی شاش هەر فەرمایشتی‌وای دەفەرموو. نەک هەر پەنجا کەلاک بە هەزاران کەلاکی خست. ئەمەش چارەنووسیەتی کە رەنگە ئاگادار بی.

پاشان بە چ حەقیک تۆ ئیجازە بە خۆت دەدەی دم لەوکارە وەربدەی. ئەوە مەسەلەی ئێمەیە تۆ حەقت نیە قسەی لیٚ بکەی». عبدالمهیمن وەدەنگ هات‌و گوتی: «کاک کەریم تۆ نارەحەت مەبە ئەمە ئیشی خۆتانە، ئێمە تەنیا بۆ دیتنی تۆ هاتووین‌و کارمان بە هیچ نەداوە».

بە سولەیمان‌خان-م گوت: من پتر دانانیشم، ئەگەر تفەنگەکان حازر نین من دەڕۆم. ئیتر ناشتوانم پێشی خەلک بگرم کە بریاریان‌داوە ئەو تفەنگانە بستیننەوە. سولەیمان‌خان گوتی: «پێی ناوی بیٚنن ئەو تفەنگانە بدەنەوە». تفەنگەکانیان لە ژوورێکی دیکە هێنانە دەرو خستیانە نێو ماشین‌و لە تەشکیلات. تەحویلی کاک مرادی قادریم دان.

بەیانی دەوری سەعات هەشت لە تەلیفونخانە خەبەریان هێنا کەوا چەند تانگ‌و چەند ئوتوبوسی پر لە پاسداریٚ نەغەدە خەریکن بەرەو شنۆ بکەونە ریٚ. تاویک پی‌چوو دیسان لە تەلیفونخانە هاتن گوتیان: لە ورمیٚوە بە پادگانی جەلدیان گوترا کە چەند تانگ‌و پاسدار بۆ شنۆیە بنێری‌و لەگەلٚ تانگی نەغەدە یەکتر بگرنەوە. هاتمە ڕێکخراوی حیزب لەگەلٚ کاک مرادی قادری کە بەرپرسی نیزامی بوو، وەبرادەرانی‌تر بریارماندا بۆ ئەوەی شار ئالۆزی نەکەویتە نێو، پێشمەرگە لەشار بچنە دەرو لەدەورووبەری شار لە شوێنی پێویست ئامادە بن. ناردم شیخ عبدالرحمانی کوری شیخ مارفی کە بەخشداری شنۆیە بوو هاتە تەشکیلات. پێم‌گوت: «خەبەریکی ئاوامان پی‌گەیشتوە. با پێکەوە بچینە نەغەدە بەلکو فەرماندەی ژاندارمەری رازی بکەین کە تانگ و پاسدار بۆ شنۆیە نەنێریٚ». شیخ عبدالرحمان پێشنیاری کردو گوتی: «بۆچی لەگەلٚ ئوستاندار قسە ناکەی؟ ئەویش تی‌بگەیێنە کە وەزعی شنۆ ئارامەو با ئەو دەستوور بدا تانگ‌و موجاهید نەیەن بۆ شنۆیە.» چوومە تەلیفونخانەو لەگەلٚ ئوستانداری ورمیٚ پێوەندی گیراو پێم‌گوت: «وەزعی شنۆ ئارامە. بیستومانە لە نەغەدەو لە جەلدیانەوە تانگ‌و پاسدار دەنێرن

بۆ شنۆیە. کاریکی چەوتە شەری لیٚ پەیدا دەبیٚ. ئیٚمە ئامانەوی لە شنۆیە شەر ساز بیٚ».

ئوستاندار گوتی: «من ئاگام لە شتیوا نیە. هەر ئیٚستا بە فەرماندەی ژاندارمەری دەلیٚم. تانگو پاسدار بۆ شنۆیە نەنیٚریٚ. تۆ خۆشت بچۆ نەغەدەو لەگەلٚ فەرماندەی ژاندارمەری قسە بکە. من دژی ساز بوونی شەرو کیٚشەم». هەرچەندی لە تەلیفونخانە هەولٚماندا نەمانتوانی بە تەلیفون لەگەلٚ نەغەدە پیٚوەند بگرین. ناچار بریارمدا خۆم بچمە نەغەدە. لەگەلٚ شیخ عبدالرحمانی دوو بە دوو سواری جیبی تازەو جوانی ئەو بووینو کەوتینە ریٚ. لە زینویٚ پیرناسری بە دیوی گوندی قەلاتاندا تووشی دوو تانگو چوار ئوتوبووسی پر لە لاتو سەر سەری چەکداری قەرەپەپاخی نەغەدە بووین کە بەرەو شنۆ دەهاتن. دووای شەری نەغەدە هەرچی رەشو رووتو دزو سەر سەری عەجەمی نەغەدە بوو بە ناوی موجاهید چەکیان لە ژاندارمەری وەگرتبوو، هیٚزی غەیرە نیزامی بوون.

لە پیٚش تانگەکان ماشینمان راگرتو هاتمە خوارو دەستم بەرز کردەوە. فەرماندەی تانک هاتە خواریٚ تۆزقەمان کردو خۆم پیٚناساند. پیٚم گوت: ئیٚستا لەگەلٚ ئوستاندار قسەم کردوە، وەزعی شنۆ ئارامە هیچ پیٚویست نیە تانگو چەکدار بچنە ریٚ. تکا دەکەم بگەریٚوە با شەر ساز نەبیٚ. منیش ئەوە دەچمە نەغەدە لەگەلٚ فەرماندەی ژاندارمەری قسە دەکەم.

کابرای ئەفسەر لە وەلامدا گوتی: «خۆت دەزانی ئیٚمە مەعموورین. منیش وەک تۆ دژی شەرم. بەلام ئەمرم پیٚکراوە. تۆ مەچۆ نەغەدە، چونکە فەرماندەی ژاندارمەری ئەم مەلبەندە لە جەلدیانە، لەویٚوە بە نەغەدە گوتراوە کە تانک بۆ شنۆ بنیٚریٚ. بریاریش وایە فەرماندەی ژاندارمەری خۆشی لەگەلٚ تانگو موجاهید لە جەلدیانەوە بیٚت بۆ شنۆ لەویٚ ئیٚمە یەکتر بگرینەوە. لە ئیستلاحی ئیزامیدا ئەمە پیٚی ئیٚژن (گازئەنبوری) باشترە بچیە جەلدیانو فەرماندەی ژاندارمەری لەم هەنگاوە

پەشیمان کەیەوە. من قەولت پێدەدەم لە گوندی (گوندە وێڵە) هەورازتر ناچم. لەسەر ناوی گوندە وێڵە رادەوەستین تا ئەمری دیکەی فەرماندەم پێدەگات».

سوپاسی کابرام کرد. لەپر دیتم کاک سولەیمانی قادری کوری کاک حەمەدی سەروکانی(کاپیتان‌قادری) پەیدا بوو. کاک سولەیمان بەیانی لەشاری شنۆ دەچێتە تەشکیلاتی حیزب. لەوێ پێی دەڵێن کە فلان کەس چۆتە نەغەدە. ئیتر سواری ماشین دەبێ‌و بە دوای مندا بەرەو نەغەدە. ئێمە لەم باس‌و خواسەدا بووین گەیشتێ. نامەیەکم هەر لەوێ بۆ فەرماندەی ژاندارمەری نەغەدە نووسی‌و داوام لێکرد کە تا لە جەلدیانەوە خەبەرت پێدەگات با تانگ‌و موجاهید نەچنە شنۆ. وەزعی شنۆ ئارامە با شەر ساز نەبێ. نامەکەم دا بە کاک سولەیمان کە بیبا بۆ نەغەدە. من لەگەڵ شیخ عبدالرحمان بامان داوە بە کوێرە رێی حەسەن نووران‌و دیشەمس‌و قەرە سەقەڵو سەلگیزو دنخەو سەردەرێندا رێگامان بری‌و چووینە نەڵۆس. لە نەڵۆس ئەندامانی شۆرای گوندی‌و رێنخراوی نەڵۆسم کۆکردەوە. وەزعەکەم تێگەیاندن گوتم: تەواوی خەڵکی گوندی ژن‌و پیاو‌و گەورە‌و بچوک پێویستە بچنە سەر جادەی شنۆ- جەلدیان‌و لەسەر رێگا دابنیشن. پێشی ئەو تانگانە بگرن کە قەرارە بێن بۆ شنۆ. هەرچی پێشمەرگەو خەڵکی چەکداریش هەیە لە ئەدیو لە شوێنێ قایم خۆ مات کەن‌و ئامادە بن. رۆیشتین بۆ چەپەراوێ. لە گوندی چەپەراوێ شورای گوندی‌و برادەرانی ریکخراوو خەلک کۆبوونەوە پێم گوتن کە وردو درشتی گوندی بچنە سەر جادەو دانیشن‌و رێگا بەر مەدەن. من کە قسەم بۆ خەڵک دەکرد پیرێژن‌و پیرەپیاوو هێندی گەورە کچیش کە تەمەس دەرویش بوون‌و چوبوونە ماڵی شیخ مارفی، دەوری شیخ عبدالرحمانیان دابوو، دەست‌و باسکیان ماچ دەکردو بە قوربانی دەبوون. شیخ عبدالرحمانی لاوی جوانچاک بە حاڵ لە دەست ژنان نەجاتی دەبوو. ناچار کەوتینە

ڕێو لەگوندی سۆفیان لە پێش ڕێکخراوی حیزب ڕاوەستاین. سۆفیان شارە دێیەو. ٢٠٠ ماڵ زیاترە. لەگەڵ ئەندامانی شورای گوندو ڕێکخراوی حیزبی مەسەلەکەم هێنا گوڕێو گوتم: لەوانەیە ئێستا تانگ بەرەو شنۆ بێن. پێویستە هیچ کەس لە نێو گوندی نەمێنێو لەسەر ڕێگا دابنیشن.

کاتێک گەیشتینە پادگانی جەلدیان دوو تانگ لەپادگان هاتبوونە دەرو ئامادەی حەرەکەت بوون. چوار ئوتوبووسیش پر کرابوون لە لاتو سەر سەری عەجەمی سندوس، ئامادە ڕاوەستابوون. لە پێش پادگان دابەزیمو پرسیاری فەرماندەم کرد. بە تەلیفون پێیان گوت کەریمی حیسامی هاتوە. گوتبووی با بێتە لام. شیخ عبدالرحمان نەهاتو لە ماشینەکەش نەهاتە خوارێ. کە چوومە نێو پادگانو دەفتەری فەرماندە، سەرگورد شەهبازی فەرماندەی پادگان وەک سەگ بە گژم داهات: «ئەو هەرایە چیە؟ بۆ ئاگرتان کردۆتەوە، ئەم لەشکرەتان بۆ لە شنۆیە کۆکردۆتەوە. خەبەرم هەیە کە شەش هەزار چەکداری حیزبی دیموکرات شاری شنۆیان گەمارۆداوەو دەیانەوی ئاغاکانی زەرزا کە چەکیان لە ژاندارمەری وەرگرتووە قەتل‌عام بکەن».

گوتم: ئێوە هەراتان ناوەتەوە، دەتانەوێ شەڕ ساز کەن. ئێوە ئاغاکانتان چەکدار کردووە تا سیستەمی ئەرباب ڕەعیەتی زیندوو کەنەوە. شنۆ گەمارۆ نەدراوە. لەشکری حیزبیش لەوێ نیە. ئێمە تفەنگەکاغان وەرگرتۆتەوە، ئێستا لە دەفتەری ڕێکخراوی حیزب دانراون. فەرموو لەگەڵ من وەرە شنۆ تا بزانی خەبەرێکی بۆتۆ هاتووە درۆیە.

- من دێم بۆ شنۆ، بەڵام بە تانگو بە چەکدارەوە دێم. تانگەکانیش ئامادەن.

- پێویست نیە تانگو چەکدار لەگەڵ خۆت بێنی. با کێشە ساز نەبێ. فایدەی نەبوو. تا ئێمە هاتینە دەر تانگو ئوتوبوس کەوتبوونە ڕێ. سەرگورد سواری ماشێنێکی ڕەنجوێر بوو منیش چوومەوە خزمەت شیخیو

سوار بووین کەوتینە ڕێ. تانگەکان لە پێشەوە تەپەو تۆزێکیان سازکردبوو نەدەکرا وەپێشیان کەوینەوە یا نزیک لێیان باژووین. زۆر لە دوایە بەجێ مابووین. کاتێک ئێمە گەیشتینە سۆلیان تانگەکان ڕاوەستابوون. پتر لە هەزارکەس ژنو مێرو گەورەو بچووک لەسەر جادە دانیشتبوون. ژنێک‌و پیاوێک هەر یەکەی منداڵێکیان لەسەر دەستی بە لووتی تانگەکانەوە نابوو. تانگ ڕاوەستابوون. سەرگورد دابەزیو چووە پێشێ. خەڵک کردی بە هەرا گورج گەڕایەوەو هاتە لای ئێمە گوتی: «ئاغای حیسامی پیادە بە بزانە ئەم خەڵکە بۆ لێرە کۆبۆتەوە؟».

گوتم: دابەزم بڵێم چی؟ من پێم گوتی با ئەو تانگ‌و چەکدارە نەیەن. هەتا تانگ‌و چەکدار نەگەڕێنەوە من دانابەزم. خۆت چۆن عیلاجی دەکەی بیکە.

سەرگورد دەنگی تانگ‌و ژاندارم‌و عەجەمی سندووسی‌دا وەگەڕێن بۆ پادگان. ئوتوبوس‌و تانگ گەڕانەوە. سوار بوو کەیکەوێتە ڕێ. بەرەو شنۆ. خەڵک پێشی ماشێنەکەیان گرت‌و گوتیان: «تا کاک کەریمی حیسامی نەیە ناهێڵین تێپەڕێ». سەرگورد هاتەوە لامان. ئێمە لەگەڵ شێخ عبدالرحمان کشابووینەوەو دوورتر وەستابووین. هات گوتی: «پیادە بە وەرە بزانە ئەم خەڵکە چی گەرەکە. ناهێڵن بە تەنیاش بچم بۆ شنۆ، ڕۆژ درەنگە من ئەشێ بگەڕێمەوە».

من دابەزیم‌و شێخ دیسان نەهاتە خوارێ. چوومە نێو خەڵک‌و لێم کۆبوونەوە. لە خۆشیان کوڵی گریانم دە ئەوکێ ماو هەرچی کردم قسەم بۆ نەکراو زمانم نەگەڕا تەڵەمێکی شێواو هەستێکی هونەرمەندانەی شارەزای دەوێ کە ئەم دیمەنە بێنێتە سەر کاغەزو بینەخشێنێ. خەڵک چاری دەزاری من بڕیبوو، منیش لە خۆشی فیداکاری ئەم خەڵکە کوڵی گریانم دەئەوکی مابوو زمانم نەدەگەڕا. بە زەحمەت توانیم ئەندە بڵێم: «سوپاستان دەکەم، ئەو فیداکاریەی ئێوە بێگومان لە مێژووی خەباتی

میللەتی کوردا تۆمار دەکرێ. من بێجگە لەوە کە لە کانگای دڵەوە سوپاستان بکەم ئێستا هیچی دیکەم پێ ناگوترێ. تکایە ڕێگا بدەن بۆ بڕۆین». دەهات کە بکەوینە ڕێ، یەکێک لە پەنجەرەی دەفتەری حیزبەوە کە لەسەر ڕێگا بوو هاواری کرد: «کاک کەریم من گیراوم». سەیرم کرد کاک سولەیمانی قادریە کە نامەم پێدا ناردبوو بۆ نەغەدە. کاک سولەیمان نامەی بردبوو دابووی بە فەرماندەی ژاندارمەری نەغەدەو گەڕابۆوە بە دوای مندا کە بێتە پادگانی جەلدیان. ڕێکخراوی حیزب لە سۆڤیان بە هەڵە وادەزانێ: کە ئەوە خەبەری شنۆیە بۆ جەلدیان دەبا. هەرچەند دەیناسن‌و لەم گوندە مامۆستا بووە، بەڵام چوونکە خزمی کاک عەولای جەلدیانێ بوو دەیگرن. کاک سولەیمانم هێنا دەرو بەرەو شنۆ کەوتینە ڕێ.

گەیشتینە راست گوندی چەپەراوی، خەڵک لەسەر ڕێگا دانیشتبوون. دابەزیم سوپاسم کردن‌و گوتم: تانک‌و موجاهید گەڕاونەوە. لە راست گوندی نەڵۆس پتر لە هەزارکەس ژن‌و منداڵ‌و پیرو لاو لەسەر جادە کۆببوونەوە. سەرگوردی ژاندارمەری حەبەسابوو. دابەزیم سوپاسی خەڵکم کردو چووینە شارو راست چووینە مزگەوتی جامیعە. بە بلیندگۆ داوا لە خەڵک کرا لە مزگەوت کۆوە بن. سەرگورد داوای کرد کە تفەنگەکان بدەینەوە بە خۆی. گوتم: دەبێ لەگەڵ کومیتەی ناوەندی قسە بکەم. تەلیفونم کرد بۆ مەهاباد مامە غەنی گوتی: «لە کومیتەی ناوەندی باسمان کردووە، هاتووینە سەر ئەو بڕیارە کە تفەنگەکان بدەینەوە بە حکومەت‌و کیشەکە هێدی بێتەوە». سەرگورد لە مزگەوتێ هەستاو قسەی کرد. پاشان من لەسەر سیاسەتی شەڕخوازانەی حکومەت‌و گیرەشێوێنی حەسەنی ئیمام جومعەی ورمێ‌و کردەوەی دزێوی ژاندارمەری بە درێژی قسەم کرد. شایانی سرنج بوو ئەو کاتەی ئێمە لە مزگەوت بووین کاک مەسعود بارزانی هاتبوە شنۆو لە بەخشداری دابەزیبوو. بە کاک یوسفی ڕیزوانیم گوت: چەکەکان تەحویلی پیاوی سەرگورد بداتەوەو

رەسیدیان لێوەرگری. هەرای شنۆیە بەم چەشنە کۆتایی پێهات. بەڵام هاتووچۆی بارزانیەکان بە چەکەوە بۆ نێو شار خەڵکی بێزار کردبوو. کۆمەڵێک خەڵک هاتنە ڕێکخراوی حیزبو سکالاٌیان بوو. نامەیەکم بۆ کاک مەسعود نووسیو داوام لێ کرد کە بارزانی با دەست لە کاروباری شنۆ وەرنەدەن. بەڵام ڕووداوەکانی دوایی دەریانخست کە نەک هەر دەست تێوەردان، بەڵکو لە جیاتی ژاندارمە لە شنۆیە خەڵکیشیان کوشت.

وەزعی شنۆ ئارام بۆوە بەڵام ڕۆژنامەکانی تاران ڕۆژ بە ڕۆژ وتاری ئاژاوەچیانەیان دەنووسیو خەبەری درۆیان بڵاو دەکردەوە. چەند ڕۆژ دوای هەرای شنۆ ڕۆژنامەکانی تاران نووسیبوویان: لە شنۆ ئالای حکومەتیان هێناوەتە خوارێو ئالای کوردستانیان هەڵکردووە. دوو هەڤاڵدەری گۆڤاری تاران مصور بە پەلە خۆیان گەیاندە مەهابادو داوایان لە دەفتەری حیزب کرد کە بیان نێرن بۆ شنۆ تا بزانن ئالای حکومەتی ئیسلامی لەوێ ماوە یان نە؟

لە گوندی حەسەن نوران یەکێتی جوتیارانی شنۆ کۆبوونەوەیەکی گەورەی ساز کردبوو داوایان کردبوو کە بچم بەشداری بکەم. هەڤاڵدەرەکانی تاران مصوریشم سوار کردو چووینە حەسەن نوران. وێنەیەکی زۆریان لە کۆبوونەوەی جوتیاران هەڵگرتو لەگەڵ چەند کەس وتووێژیان کردو چووینە شنۆیە. دیتیان ئالای ئێران لەسەر تیلگرافخانەو ئیدارەی بەخشداری دەلەرێتەوە. ڕەسمیان هەڵگرتو گەڕاینەوە بۆ مەهاباد. لە تاران بە درێژی چەند وتاریان بڵاو کردبۆوەو ڕۆژنامەکانیان وەدرۆ خستبۆوە.

# شەری مەریوان

دوای ئارام بوونەوەی شنۆ، رۆژی ١٩٧٩/٧/١٣ بۆ ئەوەی لە دەرەوەی حیزبی دیموکراتیش تێکۆشانی سیاسی بۆ هێندی کردنەوەی وەزعو هێمنایەتی دەست پێکرابێ، ٦٣کەسمان لەخەڵکی شنۆو پیرانشارو سندوسو لاجانو شارۆیران کۆ کردەوەو ناردمانن بۆ تاران کە ئەگەر بتوانن بچنە کن خومەینیو دەگەڵ کاربەدەستانی کۆماری ئیسلامیش قسە بکەن. من قادری خالپدیم وەک چاوساغو قسەکەر پێناساندنو لەبەر دەرکی بارەگای حیزب بەرێمان کردن.

کاربەدەستانی کۆماری ئیسلامی نەیاندەویستو نەیاندەهێشت کوردستان ئارام بێتەوەو گەلی کورد بێشەرو کێشە ژیانو خەباتی سیاسیخۆی درێژە پێبدا.

١٩٧٩/٧/١٢ شەری پاوەو مەریوانیان سازکرد. خەبەرمان بۆ هات کە پێشمەرگەکانی قیادە موقەت بەسەرۆکایەتی ناله هەورامی رێگای مەریوانیان گرتووەو ناهێڵن یارمەتی کوردەکان بگاتە پاوەو مەریوان.

دەفتەری سیاسی بریاریدا کە بچمە کن کاک مەسعود بارزانیو سامی عبدالرحمان لەگەڵیان باس بکەم کە ئەوە کارێکی دۆستانە نیەو لەگەڵ قەولو قەراری دۆستایەتی رێک ناکەوێو دەبێ پێشی ئەم کارانە بگیرێ.

کاک مەسعود لە شنۆیە نەمابوو، ناچار چوومە پیرانشار. ئەودەم هێزێکی بارزانیەکان لەبەری مێرگان لە نیزیک گوندی کەوپەر لە دۆڵی ئاوخواردە

لە خێوەتاندا بوون‌و کاک سامی بەرپرسیان بوو. دیارە پتر بۆ پێشگری لە هاتنی هێزی یەکیەتی نیشتمانی بۆلای شنۆو ناوچەی پیرانان چووبوونە وێندەرێ. لە پیرانشار لەتاحی خولەس بەرپرسی ڕێکخراوی حیزبی دیموکراتیشم هەڵگرت‌و چووینە دۆڵی ئاوخواردە. کاک سامیم دیتەوە. لە بن خێوەت‌و لەگەڵ شوتی خواردن باسی باروودۆخی وڵاتمان کردو گلەییم لێ کرد. کاک سامی گوتی: «ئەوە سیاسەتی ئێمە نیە، لەبەرامبەر حیزبی دیموکراتدا ئێمە لایەنی حکومەتی ئێران ناگرین. بەیانی من نامەو زەلامێکی خۆمان دەنێرم، بەس پێویستە ئێوە ئەم زەلامەی ئێمە بگەیێننە کن نالە هەورامی».

هەڵوێستەکەم زۆر بە دڵ بوو، گوتم: چاوەڕوان دەبم. هەر بگاتە مەهاباد بەرێی دەکەین. من هەر ئەو ڕۆژە گەرامەوە بۆ مەهابادو چاوەڕوانی زەلام‌و نامەی کاک سامی بووم بەڵام ئێستاش نە نامە هات‌و نە زەلام‌و نە سیاسەتیشیان گۆڕا. ئێمە کۆپیەی تێلگرافێکی ڕەسمی فەرماندەی گشتی ژاندارمەری ئێرانمان کەوتە دەست کە دەنووسێ: «ئەو چەکدارانەی بە سەرۆکایەتی نالەهەورامی لەشەری پاوە یارمەتی ژاندارمەیان داوە هەر یەکەی ٥٠٠ تمەن پاداشیان بدرێتێ. ئەم بەڵگەیە لەلای من لە وڵات پارێزراوە.

دەفتەری سیاسی بڕیاریدا کە مەلا ڕەسولی پێشنماز بەسەرۆکایەتی پۆلێکی پێشمەرگە بچێ بۆ پاوەو مەریوان. کاتێک مەلا ڕەسول دەگاتێ‌و دەزانێ کەوا پێشمەرگەی قیادەموەقەت ڕێگایان گرتووە، لەبەر ئەوەی نایەوێ شەڕی کورد بکا، دەگەرێتەوە. لە گەرانەوەدا لەگەڵ جاشان تووشی شەرێکی لابەلا دەبێ‌و بەداخەوە عەلی برای شەهید دەکرێ‌و مەیتەکەشی دەکەویتە دەست پاسداران.

نامەوێ باسی ئەوە بکەم کە لە ڕێگای ئوستاندارو فەرماندارو تەلیفون بۆ ئەملاو ئەولا بۆ ئوستانداری زەنگان‌و هی‌تر چەندە هەوڵمدا تا

مەیتەکەمان ئەستاندەوەو هێنایانەوە مەهاباد. لە دەروازەی شارەوە تا سەر قەبران خەڵک لە پێشوازی ئەو مەیتەدا بوون‌و بەراستی تازیەدار بوون. لەسەر قەبران شین‌و گریانی ژنان عاسمانیشی وەگریان خستبوو. وەک بەرپرسی تەشکیلاتی مەهاباد‌و ئەندامی کومیتەی ناوەندی لەسەر قەبران لە وتاری خۆمدا گوتم: «ژنی کورد هەق نیە رەشپۆش بێ‌و بۆ شەهیدان شین بگێڕێ. چونکە شەڕێکی ئەم حکومەتە بەسەر ئێمەی‌داسەپاندووە، هەموو رۆژێ شەهیدمان بۆ دێتەوەو دەبێ هەر لەسەر قەبران بین. تازە شیوەن‌و شین‌گێران بۆ کورد نابێ».

# شەری ناوچەی ورمێ

١٩٧٩/٧/١٨ ژاندارمەری ورمێ کەبەراستی بۆ شەرهەڵگیرساندن ئاژاوەی دەناوە بە نیازی گۆیا پاکسازی بەرەو ناوچەی برادۆستو سێرۆ-سەر سنوری تورکیە وەرێ دەکەوێ. تاهیرخانو جانگیرئاغای دەری لەگوندی حەسار لە تازلو پێشی پاسداران دەگرن. شەرێکی توند دەقەومێ، پاسدارو ژاندارمەیەکی زۆر دەکوژرێن. کوردەکان داوایان لە حیزبی دیموکرات کرد کە یارمەتیان بۆ بنێرێ. کومیتەی ناوەندی پاش لێکۆلینەوە بریاریدا کە بچم بۆ ورمێو لەگەڵ ئوستاندار قسە بکەم. پێشنیاری ئێمە ئەوە بوو کە شەر بوەستێو لەشکرو پاسدار بگەرێنەوە بۆ نێو شار. ئێمەش داوا لە کوردەکان بکەین بکشێنەوە. رۆژی ٧٩/٧/١٩ چوومە ورمێ. پاش وتووێژ لەگەڵ ئوستاندار بەڵێنیدا کە بە تەلیفون بە فەرماندەی لەشکر بلێی شەر رابگرێ. پاشان لەسەر کشانەوەی هەر تکلا قسە بکەین. لە ئوستانداری دەهاتمە دەر کوری حەمەدەمین چیچۆ دەهات بۆ ئوستانداری. گوتی: باوکم دەچوو بۆ سێرۆ. ژاندارمە گرتوویانە. ئەگەر بە ئوستاندار نەلێی تازە بەری نادەن. گەرامەوە بۆ کن ئوستاندارو پێم گوت: «ئێمە لە لایەک دەمانەوێ وەزع هێدی بێتەوە، ژاندارمەش پتر ئاگری شەر خۆش دەکا. ئێستا حەمەدەمین چیچۆیان گرتوەو تکایە خەبەر بدە بەری بدەن». گوتی: «هەر ئێستا تەلیفون دەکەم کە ئازادی بکەن». بەلام هەرچی گوتی درۆ بوو. شەر شەش رۆژی

خاباند، کومیتەی ناوەندی حیزبی دیموکرات لەو شەڕەدا چاوەڕوان مابەوەو هیچ هەنگاوی ناویشت. ئیتر من ئاگام لێ‌نەبوو کە چۆن ئەو شەڕە کۆتایی هات. بەڵام درەنگ‌تر کە چاوم بە جانگیرئاغای دەری کەوت باسی ئەو شەڕەی بۆ گێرامەوە کە یادداشتم کردوە. جانگیرئاغا گوتی: «کوردەکان شاری ورمی‌یان خستبوە مەترسیەوە. من بە نێو بەگزادەکانی مەرگەوەڕو تەرگەوەڕدا دەگەڕام کە هانیان بدەم ئەوانیش لەلای (بەند)ەوە شار پەلامار بدەن. حکومەت فشاری بۆ هاتبوو، وای لێ‌هات کە چەمران‌و فەلاحی فەرماندەی گشتی ژاندارمەری ئێرانیان نارده ورمێ. حکومەت هەر بەوەش وازی نەهێنا. دەستەو داوێنی ئیدریس‌و مەسعود بارزانی بوو. ئەوان هاتنە مەرگەوەڕو بەگزادەکانیان پەشیمان کردەوە کە لەشەڕدا بەشداری بکەن. پاش ئەوەی کە حیزبی دیموکرات یارمەتی پێ نەکردین لە کۆبوونەوەیەکدا کە ئیدریسیش بەشداری کرد بڕیارماندا شەڕ رابگرین. بەو شەرتەی ئەرتەش یا ژاندارمە بچێتە سێرۆو ئێمەش چەکدار بێنینەوە. دیارە ئیدریس‌و مەسعود لەم شەڕ راگرتنەدا بە قازانجی حکومەتی ئیسلامی دەورێکی گرنگیان هەبوو».

رۆژی ۱۹۷۹/۷/۱۹ سەرهەنگ زەهیر نیژاد فەرماندەی لەشکری٦٤ لە تەلەفیزیونی سەرانسەری ئێران ریزە وتارێکی پڕ لە درۆو بوختان‌و شەڕلاتانی دژی حیزبی دیموکرات بڵاو کردەوە. بۆ بەرپەرچ دانەوەی وتاری زەهیر نیژاد ئێمە ناچار بووین رۆژی ۱۹۷۹/۷/۲۲ لە هەموو شارەکانی کوردستان دژی قسەکانی زەهیر نیژادو تەلەفیزیونی تاران خۆ پێشاندان ساز بکەین. من وتارێکی دوورو درێژم لەم بارەوە بۆ رۆژنامەی ئایندەگان نووسی کە بڵاوی کردبۆوە.

رۆژی ۱۹۷۹/۷/۲۳ شورای شاری مەهاباد بە سەرۆکایەتی مامۆستا مەلا رەحیمی عباسی سەفەری تارانی‌کرد کە بەڵکو چاوی بە رێبەرانی کۆماری ئیسلامی بکەوێ‌و لەبارەی هێمنایەتی وڵات وتووێژ بکا. رۆژی

١٩٧٩/٧/٢٤ ئەرتەش بەیاننامەیەکی هەرەشەو راساتی بلاو کردەوە کە بەتەواوی بۆنی شەری لیٚ دەهات. لەوکاتەدا هەلٚبژاردنی مەجلیسی خیبرەگان لە سەرانسەری ئیران لە کایەدا بوو. رۆژی١٩٧٩/٨/٤ نەتیجەی هەلٚبژاردنی مەجلیسی خیبرەگان بلاو کرایەوە. دوکتور قاسملو لە ئازەربایجانی رۆژئاوا بە ١١٥٣٠ دەنگ بە نوێنەری مەجلیسی خیبرەگان هەلٚبژێردرا. کومیتەی ناوەندی لەسەر چوونو نەچوونی دوکتور قاسملو بۆ تارانو بەشدار بوونی لە یەک دوو دانیشتندا باسی کرد. لە ئەنجامدا گەیشتە ئەو بریارە کە دوکتور بچێتە تارانو بەشداری بکا. لە بارەی هێندیٚ پاراستنو ئاگاداریدا تەگبیرکرا. دوکتور قاسملو لەم کاتە ئالۆزەدا ئامادەیی خۆی بۆ چوونی تاران راگەیاند. دوو رۆژ پێش ئەوەی کە دوکتور سەفەر بکا. خومەینی لە کۆبوونەوەی مەجلیسی خیبرەگاندا پرسی: «کوا قاسملو لێرەیە؟... خۆزیا لێرە بایە نەمدەهێشت بگەرێتەوە». ئیتر بەم قسانەو لەم بارو دۆخەدا چوونی دوکتور بۆ تاران هەلەیەکی روونو ئاشکرا بوو.

رۆژی ١٩٧٩/٨/٦ کومیتەی ناوەندی نامەیەکی دوورو درێژی سەبارەت بە پیلانی لەشکرو شەر هەلایسێنەری کاربەدەستانی دەولەت بۆ خومەینی نووسی. بەلاٚم حکومەتی ئیران، بە تایبەت خومەینی دیار بوو بریاری شەریان داوەو نامەو پارانەوەش کاری تیٚنەدەکردن.

## جیژنی ٢٥ گەلاوێژ ساڵرۆژی دامەزرانی حیزبی دیموکرات.

تەشکیلاتی مەهاباد بریاری‌دا کە پاش ٣٣ ساڵ بە ئاشکراو بە ئازادی یادی دامەزرانی حیزبی دیموکرات بکاتەوەو ئاهەنگ بگێڕێ. کومیتەیەکی ئامادەییمان بۆ پێک هێنانی ئاهەنگ دیاری کرد. رۆژی ٢٥ گەلاوێژ لە پێش خانەی جەوانان ئاهەنگی لە دایک بوونی حیزب دەست پێکرا. کۆری لاوان بە سرودی ئەی رەقیب ئاهەنگی کردەوە. مامە غەنی وتاری کومیتەی ناوەندی خوێندەوە. وتارو شیعرو گۆرانی سابلاغی هێنابوە جۆش. چەند هەئالدەری بێگانە لەوێ بوون‌و رەسمیان هەڵدەگرت. هەر چەندی بلێی ئاهەنگێکی رێک‌و پێک بەرێوە چوو. لە بیرم ناچێ دوکتور رەحیمی قازی هاتە لام‌و گوتی: «کاک کەریم بە دل پیرۆزبایت لێ دەکەم. مەگەر لە ولاتانی سوسیالیستی دەنا لە هیچ کوێ مەراسمی ئاوا بەرێوە ناچێ». ئێمە لە مەهاباد جێژنی دامەزرانی حیزبمان دەگرت‌و هەرلمان دەدا لە رێگای ئاشتی‌و هێمنانەوە مەسەلەی خودموختاری چارەسەر بکەین. بەلام رژیمی خومەینی رۆژ بەرۆژ زیاتر هێرشی دەهێناو شەری پێ‌دەفرۆشتین. هەتا رۆژی ١٩٧٩/٨/١٩ خومەینی دژی میللەتی کورد فتوای خەزای دار حیزبی دیموکراتی بە حیزبی شەیتان ناوبرد. بە دوای فتوای خومەینی‌دا ٧٩/٨/٢٣ پەلاماری ئەرتەش بۆ سەقز دەست پێکرا. کومیتەی ناوەندی کەریم حەدادی لەگەل پۆلێک پێشمەرگە بۆ

سەقز نارد، بەلاّم بێ ئەوەی بگاتە شەڕو بەرەبەرەکانی گەڕایەوە.
کومیتەی ناوەندی حیزبی دیموکرات بۆ چارەسەر کردنی باروودۆخی تازە ڕۆژی ٧٩/٨/٢٣ کۆبوونەوەیەکی پێک هێنا. مەلا محەممەدی جوانرۆیی وەک بەرپرسی نیزامی راپۆرتێکی دوورو درێژی لەبارەی بارو دۆخی هێزەکانمانو چەکو ئیمکانی بەرگریو بەرەبەرەکانی پێشکێش کرد. پاش باسو لێکۆڵینەوەیەکی زۆر کومیتەی ناوەندی گەیشتە ئەو بڕیارە کە لەشار بچێتە دەرو چاپخانەو کتێبخانەو بەڵگەو کەلوپەلی پێویست رابگوێزرێن. مەلا محەممەدی جوانرۆیی بەرنامەی دامەزرانی جەبهەو دابینکردنی چەکو قۆرخانەو دابەشکردنی پێشمەرگە لە شوێنی پێویست دەست پێبکا.
من پێشنیارم کرد. کە تەشکیلاتی مەهاباد نابێ شار چۆل بکا من لەشار دەمێنمەوە. ئەگەر هەموو ئەندامانی کومیتەی ناوەندی بچنە دەرێ، هەم ورەی خەڵک کز دەبێو هەم ئابرومان دەچێ. برادەرانی کومیتەی ناوەندی پێشنیاری منیان پەسند کردو بەرپرسایەتی سیاسی هێزی پێشمەرگەیان پێئەسپاردم. رامان دانا برادەرانی کومیتەی ناوەندی لە ماوەی چەند رۆژدا یەک یەکو دوو دوو لەشار وەدەر کەون. بەلاّم دیاریان نەکرد بۆ کوێ بچنو لە کوێ کۆ ببنەوە. دەست کرا بە راگواستنی چاپخانەو کتێبخانەو سەنەدو بەڵگەی حیزبی. ئەوەتکە بە شپرزەییو نالەباری راگوێزرابوون کە کتێبخانەی حیزب دنیایەک کتێبی بەنرخو نایابی تێدا کۆ کرابۆوە بێسەرو شوێن چوو، تەنانەت سالی ٨٤یش نەدۆزرابۆوە. چونکە تەنیا مەلا عوسمانی میراوەیی (جەلالی رەحمەتی) رایگواستبوونو کەسیتر نەیدەزانی بۆ کوێ ناردراون. جەلالیش شەهید بوو، کتێبخانەش بە نانو ئاودا چوو.
مەسەلەی چەکو کەلو پەلی نیزامیو ئازوخەی سەربازخانەش هەر بەم دەردە چوو. رۆژانە چەند ماشێن کەلو پەلی نیزامی ئازوخە بۆ دەرەوەی

شار دەناردرا. بەلاّم هەر ئەوەندە بوو لە شار وەدەر دەکەوت ئیتر جێگای پاراستن‌و راگرتنی دیار نەبوو. نمونەیەکی داخدار دەگێرمەوە کە لەگەڵ خۆم سەروکاری هەبوو.سەرگورد عەباسی رەحمەتی کابرایەکی عیراقی بە ناوی نەقیب محەممەد هێنابوو لەسەر تانگ کاری دەکرد. گۆیا ئەفسەری ئەرتەشی عیراق بووەو پێشتر هاتۆتە ئێران‌و بۆتە پەنابەر. رۆژێک لە جەبهەی کۆسە کەریز لەگەڵ تانگی حکومەت تووشی شەر دەبێ‌و لەپڕ گوللە تۆپی تانگی لێ‌دەبڕێ. کابرا گەراوە نێو شار تورەو هەراسان داوای گوللە تۆپی‌کرد. مەلا محەممەد گوتی: «من هیچ ئاگام پێ نیە، سەید رەسو رایکوێزتوون». سەید رەسو لە دەست دانەبوو، دەی چ بکەین چار چیە؟ بە پەلە ماشینێکم نارد بۆ گوندی سەیدئاوا لای سەیدتەهای بەرای سەید رەسو. بەڵکو جێگای گوللە تۆپان بزانێ. ماشین گەرابەوە بێ‌گوللە تۆپ‌و بێ‌نەتیجە. لەپڕ خوداو راستان سوفیەکی پێشمەرگەی ریش درێژ، کەوا رەسمی لە نێو پێشمەرگەکان‌دا دیارە خەڵکی گوندی سۆغانلوی هات گوتی کاک کەریم من بە گوللە تۆپان دەزانم، لەگەڵ سەید رەسوی بردوومانن بۆ لای کێلی هەورشینان. سۆفی‌و پێشمەرگەو ماشینم ناردو گوللە تۆپیان هێنانەوە.

نمونەی ئاوا زۆر بەدەستەوەن بە پێویست نازانم باسیان بکەم. نەکا پاشان کاک حەمەدەمین بلێ هەر دەیەوی لاپەری کتیبەکەی پێ‌زیاد بکات. بێ تەمرینی لەسەر چەکی مۆدێرن‌و لێ‌نەزانی یەکێک لەو هۆیانە بوو کە حکومەتی ئێرانی بۆهاتنی مەهاباد چێ‌تر دەکرد.ئێمە موشەکی تاومان هەبوو لە پادگانی مەهاباد بەجێ مابوو. ئەودەم لە هەموو رۆژهەلاتی نێوەراست تەنیا ئێران خاوەنی ئەو موشەکە بوو کە هەشتیان لە مەهاباد بە میرات بە ئێمە گەیشتبوو. دیارە بەکار هێنانی دەزگای ئەلیکترۆنی موشەکی ئاوا شارەزایی دەوێ. موشەکێکیان بردبۆە جەبهەی کۆسە کەریزەو بە تانگیانەوە نابوو. دەیانگوت مووشەک وەک فیشەکە

شێتە کەس نەیزانی روو لە کوێ دەکا. یان ئارپیچی، باسم کرد کە لە نەغەدە نەمانتوانی بەکاری بێنین‌و تانگێک بشکێنین. لە جەبهەی شارویران بە دیوی گزڵئاو، چۆمەلاتێدا مەلا رەسول بەرپرسی پێشمەرگە بوو. لە بناری شێخ مارفی تانگی دێتە سەر ئەویش خۆی چۆکی لەبەردا دەداو سێ ئارپیچی پێوە دەنێ هیچیان نائەنگێوێ، خوداو راستان تانگ دەگەرێتەوە. ئەوە خۆی یەکێک لە هەڵەی هەرە گەورەی فەرماندەو بەرپرسە نیزامیەکانی حیزبی دیموکرات بوو کە سەبارەت بە رەشیدی‌و فیداکاری راستەو راست خۆیان پێش هەموو کەس دەچوونە مەیدان‌و بەر گوللەی دوژمن. کاک هەژار (جاوید فەر) کاک کەریمی عەلیار، سەروان حاتەم، ئومەر قەبتەران، عەلی پیرزتی، قادری قادری، برایم شێخ خالی‌و هی‌تر هەموویان بەم جورە شەهیدکران. لەکاتێکا هونەری فەرماندە رێبەرایەتیە نەک خۆ بەکوشت‌دان. هێنانەوەی ئەم چەند نموونەیە بۆیە بوو کە بەراستی پێشمەرگەکانی حیزبی دیموکرات‌و هێزەکانی دیکەش بە فەرماندەوە لە قارەمانەتیدا بێوێنە بوون. بەلام هێشتا لە بەکار هێنانی چەکی مۆدێرن‌و لە تاکتیکی شەری پارتیزانی‌دا شارەزایی تەواویان نەبوو.

لەسەر بریاری کومیتەی ناوەندی ئەندامانی کومیتەی ناوەندی تاق‌و جووت لەشار وەدەر کەوتن. رۆژی ٧٩/٨/٢٧ دوکتور قاسملو مەهابادی بەجێ هێشت. لە ئەندامانی کومیتەی ناوەندی تەنیا مەلا سمایلی حاجی لەکن من مایەوەو ئەندامانی کومیتەی شاریش هەموویان لە مەهاباد بوون. لەم بەینەدا ٢٨ لاوی خەڵکی قەسری شیرین کە بە سەرباز گیرابوون لە سنەوە دەیانبەن بۆ پادگانی ئازەرشار. لە بۆکان پێشمەرگە گلیان دەدەنەوە. نیزیکەی حەوتوویەک هەموو رۆژی خەڵکی قەسری شیرین لە مزگەوت کۆدەبوونەوەو مەلاو ریش سپی‌و دایک‌و باوکی سەربازان بە تەلیفون هەراسانیان دەکردین‌و داوای ئازادکردنیان دەکرد.

خەبەرم دا بە برادەرانی بۆکان سەربازەکانیان هێنانە مەهاباد. بە تەلیفون لەگەڵ دایک‌و بابیان قسەیان کردو پاش چەند رۆژ تەحویلی فەرماندارم دان‌و بەرێمان کردن تا میاندواو، نەیاندەویست بگەرێنەوە بۆ قەسری شیرین. رۆژی ٧٩/٨/٢٨ هەڤاڵدەری ئاسوشیتێت پرێس لەتارانەوە تەلیفونی کردو بارو دۆخی شاری پرسی. گوتم: شار ئارامەو خەبەرێکی‌وا نیە کە بەکارتان بێ. لەو کاتە شپرزەو ئالۆزەدا مەسەلەی کویخا شەریف‌و عەلاخانی شەهیدی-یش ببوە مەسەلەی رۆژ. سەید رەسوی بابی گەورە وەک پیاوان کوێخا شەریفی قاتڵی سمایلی شەریف‌زادەی گرتبوو هێنابویە مەهاباد لە پێشدا لە سەربازخانەو لەبەر دەستی خزمان راگیرابوو. من چەندجار پێشنیارم کرد کە کویخا شەریف وەک قاتڵی کاک سمایل ئیعدام بکرێ. عەولاخانی شەهیدیش لەگەڵ کویخا شەریف گیرابوو دایان بەشارەوانی. چەند ئاغای بانەو هێندێ کەسی مەهابادی‌و کاک سەعدی موهتەدی هەوڵیان دەدا کە عەولاخان ئازاد بکرێ. من تەمدەتوانی بریاری وابدەم. ئاخرەکەی چووبوونە لای دوکتور قاسملو، دوکتور نامەیەکی بۆ نوسیبووم کە عەولاخان ئازاد بکرێ. بەلاْم ئیتر عەولاْخان درابوو بە شارەوانی‌و دەبوایە دادستانی شۆرش بریاری ئازادبوونی بدا. ناردم سەید هاشمی ئەفسەری شارەوانی هات‌و تکام لێ‌کرد با عەولاخان ئازاد بکەین. گوتی: «ناوی چۆتە دەفتەر من ناتوانم ئەوکارە بکەم. دوو رێگای هەیە، یا دەبێ دادستان حکومی ئازادی بدا، یا پێشمەرگە بنێرە یەک دوو تەقە بکەن‌و بێنە نێو زیندان‌و بە زۆری بیهێننە دەرێ».

یەک دوو جار بە تەلیفون تکام لە دادستان کرد کە کارێکی وا بکا عەولاخان ئازاد بکرێ. بەلێنی دەداو نەیدەکرد. منیش لەبەرخاتری مەحمود حەلەبی باوکی کە کۆنە حیزبی‌و کۆنە دۆست‌و کۆنە جیرانم بوو. هیچم پێ‌نەدەگوت. کاک سەعدی رەحمەتیش هەموو رۆژێ دەهاتە دەفتەرو داوای ئازادی عەولاخانی دەکرد بە ناچاری پێشمەرگەم نارد

دادستانیان هێنا. گوتم: دیارە تۆ گاڵتە بە ئێمە دەکەی ئەو کابرایە ئێمە گرتوومانە، ئێمەش دەمانەوێ ئازادی بکەین. تۆ بۆ خزمەت بە حکومەت ناتەوێ بڕیار بدەی. ئێستا دەتنێرم بۆ زیندانی چیا با تامی حەبسێ بچێژێ. دەژوورێکیان کردو دەرگایان لەسەر داخست. زۆری پێ‌نەچوو کاک برایمی شیرزاد ئەندامی شورای شارو دۆستێ بەڕێزی هەموو لایەک هاتەو تکای کردو دادستانی بردەوە. ئێمە عەولاخانو کوێخا شەریفمان نە پێ‌سزادراو نە پێمان ئازاد کران. بەڵام دەولەت هاتەوە ئەو تاوانبارانەی ئازاد کرد. چا بوو برایانی کۆمەلە وەک شۆڕشگێران لە پاشان کوێخا شەریفی تاوانباریان بە سزای خۆی گەیاندو کوشتیان. یان مەحموودی جەفایی ساواکی بەناو بانگ برادەرانی ئێمەی گرتبوو ئازاری دابوون دوای شۆڕش گیراو هێنایانە مەهاباد. ئێمە هیچمان لێ‌نەکرد، بەڵام حکومەتی ئیسلامی ئەو ساواکیەی ئازاد کردو بردی لە تاران کاریشی پێ‌ئەسپاردو کاروباری کوردە عیراقیەکانی لەتاران بەڕێوە دەبرد. یا مەلا محەمەدی گا پیسی. ئەم ساواکیە لە زیندان ڕووبەڕوو شاهیدی بە درۆی لەسەر برادەرانی حیزبی دابوو. پاش ڕوخانی ڕژێمی‌شا یان پێشتر چووبووە قوم ببوە شیعە. هاتبوە لە کوردستان دەسوڕاوەو تەبلیغاتی بۆ حکومەت دەکرد. گیراو هێنایان تەحویلی زیندانیاندا. ئەو برادەرانەی کە لە زیندان شاهیدی لەسەردابوون، هاتن بەرەو ڕووی بوونو قامکیان لە چاوی بڕی. حکومەتی ئیسلامی هەولێکی زۆری‌دا بۆ ئازادکردنی، لەبیرم نەماوە چۆنو بۆچی بەرهەڵاکرا. با لێرەدا هەر حیزبیش تاوانبار نەکەم کە لەو کارانەدا لێ‌براو نەبوو. شورای شاری مەهاباد بە ڕەسمیو بە قانونی خاوەن دەسەڵات بوو هەرچی کردبای دەیتوانی بیکا. برادەرانی کومیتەی ناوەندی لایان وابوو کە دەبێ شورا سزای ئەو تاوانبارانە بدا. ئێمە بیانو نەدەینە دەست حکومەت کە بڵێ حیزبی دیموکرات حکومەت دەکات. لەکاتێکا لەسەر کوێخا شەریفو مەلای گاپیسی من لەسەر نیعدام

کردنیان سوور بووم‌و قسەم نەچووە سەر.

شەوی ٧٩/٨/٢٩ ئەرتەش لە محەمەدیارەوە گوندەکانی کۆنە دێ‌و گردی یاقوبیان لەشارویران وەبەر تۆپاندا لە نیوەشەودا بریندارو کوژراوو هەلاتوو گەیشتنە مەهاباد. بریندارەکانمان ناردە شیروخورشیدو هەلاتوو لیقەوماوەکانیش بلاوکران، رۆژی دوایی عەجەمی سندوسی تۆکەسی خەلکی کۆسە کەریزەیان گرتبوو، خەلکی کۆسەکەریزێ هاتنە دەفتەری حیزب‌و سکالایان بوو. نامەیەکم بۆ ئوستاندار نووسی‌و پاشان ئازادکرابوون. بۆ شەوێ پێشمەرگەی گوێکتەپە مەلای گوندیان بە ژن‌و مال‌و منداڵەوە گرتبوو هێنایانە دەفتەری حیزب. دەیانگوت لە مزگەوتی گوتوویە ئەگەر حکومەت بێتەوە لەسەر رێیە قوربانی دەکەم. برێکم مەلا نسحەت کردو ناردمەوە. بەلام پاشان هەلاتچووە ورمێ‌و بوو بە هاوکاری دەولەت.

من ئیتر شەوو رۆژ لە دەفتەری حیزب دەمامەوە. لە هەمووی زەحمەت‌تر وەلامدانەوەی تەلیفونی خەلکی شار بوو. وەک باران پرسیار دەبارین: «وەزع چۆنە؟... خەلک چۆنە؟ خەلک چ بکا؟... پێشمەرگە زۆرە یان کەم؟...». مەلا سمایلی حاجی‌و کاک ئومەرو کاک سەید حەسەنی هاشمی لەگەل کورەکانی یەکیتی لاوان هەمیشە لە دەفتەری حیزب بوون‌و دەوروبەریان چۆل نەدەکردم. دەفتەرێکمان لە پیش پادگان دانابوو، ئەوانەی دەیانویست ببنە پێشمەرگە دەچوون ناوی خۆیان دەنووسی‌و دەچوونە نێو پادگان‌و برایانی مەسئول جێگاو رێگایان پێ‌نیشان دەدان. دوای ئەوەی کە ئیتر گومانمان لەوەدا نەما هێرش بۆسەر مەهاباد دەست پێ‌دەکرێ، داوام کرد کومیتەی شارستانی تەشکیلاتی مەهاباد کۆبێتەوە. دوای باس‌و هەلسەنگاندنی بارو دۆخی رۆژ، بریار درا کە ئەوەندەی ئیمکان هەبێ ئەندامانی کومیتەی شارستان لە شار وەدەر نەکەون. ئەگەر لە مالی خۆیان نەبن دەتوانن جێ‌گۆری بکەن. تەلیفونی هەموو برادەرانم وەرگرت‌و

هێندێ ژمارە تەلیفونی دیکەش کە قەرار بوو ئەگەر لە ماڵی خزیان نەبن هێندێکان لەوێ بدۆزمەوە. ٢١ ژمارە تەلیفونم وەرگرت. بڕیارمان دا ئەگەر هاتو لەشار وەدەر کەوتین، لە کزنە دێو لە وزێندەرێ دوورتر نەڕۆین. ڕۆژی دوایی وەدەر کەوتن لە کزنە دێ یەکتر بگرینەوە.

ڕۆژی ٧٩/٨/٣٠ لەگەڵ کاک ئومەرو مەلا سمایلو کاک سەید حەسەنی هاشمی لەدەفتەری حیزب دانیشتبووین وەلامی تەلیفونی خەڵکمان دەداوەو چاوەڕوانی کارەسات بووین. تەلیفون زەنگی لێدا. کە هەڵم گرت، دەنگی ناسکی کیژێک بوو. (جا ئێستا ئەگەر ئەو باسە بنووسم لەوانەیە هێندێ لەو کەسانەی گزیا قەت لەگەڵ ژن نەدوانو هەموو کاری چەپەلیان لە ژێر پەردەو چارشێودا کردووەو غیرەتی ئەوەیان نەبووە پێ لە ڕاستی ژیانو کردەوەی خزیان بنێن، ڕەنگە بڵێن دەبوایە ئەوەندەی نەنووسی) تەلیفون هەڵگرتو گوتی: کاک کەریمی حیسامیم دەوێ.

- فەرموو. لەسەر تەلیفونە.

- ئێوە پێشمەرگەی کچ رادەگرن؟ من دەمەوێ ببمە پێشمەرگە.

- کچو کور لای ئێمە فەرقی نیە. هەر کەسێک چەک هەڵگرێ دەتوانی ببێتە پێشمەرگە. لە پێش پادگان دەفتەرێکمان داناوە ئەوانەی دەیانەوێ چەک هەڵگرن دەچن ناوی خزیان دەنووسنو پاشان برادەرانی مەسئولی نیزامی جێگاو ئەرکیان بۆ دیاری دەکەن. تۆش بچۆ لەوێ ناوی خۆت بنووسە.

- من ناچم، لەوێ ناوی خۆم بنووسم، من تیرئەندازی دەزانم.

- نابێ، ئەگەر نەچی مانای ئەوەیە ناتەوێ ببیە پێشمەرگە.

- من دەمەوێ ببم بە پێشمەرگەی تۆ.

- من پێشمەرگەم نیە. هەموو پێشمەرگەی حیزبین. ئەگەر لە نێو شار منت دیبێ، دەزانی قەت پێشمەرگەم لەگەڵ نەگەراوە.

- دەتوانم بێمە دەفتەر؟
- بۆ ناتوانی. فەرموو. ڕۆژانە دەفتەر پڕ لە خەڵکە.
برادەراتی لەوێ دانیشتبوون لەم وتووێژە قوت بوون‌و گوێ‌یان هەڵخستبوو. زۆری پێ‌نەچوو لە خوارەوە هاتن گوتیان کچێک هاتوە دەیەوێ بێتە لات. ڕێگای بدەین؟
- با بێ. ماڵ‌و خرا نەبێ. چۆن ڕێگای کچ نادەن. کچ وەژوور کەوت، کچێ چی مانگی چاردە، گورج‌و گۆڵ، وریا، ژیرو جوان‌و لەدەستان خۆش، هاتە پێشێ دەستی لە دەستی من ناو خۆی لە کاک ئومەرو مەلا سمایل نەگەیاند. داتیشت‌و گوتی: «من بووم تەلیفونم کرد. هاتووم ببمە پێشمەرگە.
- زۆر بەخێر هاتی دەفتەرمان لەبەر دەرگای پادگانە، فەرمور بچۆ ناوی خۆت بنووسە. ڕاست لەو کاتەدا تەلیفون زەنگی لێدا. خانمێکی هەڤاڵدەری نیوزویک بوو لە تارانەوە پرسی:
- ئەمڕۆ وەزع چۆنە لە مەهاباد؟
- ئەمڕۆ وەزع ئارامە، هەوا یەکجار خۆشە، لە دوێنێ خۆشترە.
- ڕاستی دیارە فرە سەر حالی، چۆن لە مەهاباد وەزع ئارامە. یانی شەر نیە؟
- نەک هەر شەڕ نیە بەڵکو ئێستا کیژێکی زۆر جوانیش لە پەنام دانیشتوەو دەیەوێ ببێتە پێشمەرگە.
- لە تۆ خەبەر وەر ناگیرێ.
- بەڕاستی خەبەر هەر ئەوەیە پێت دەڵێم، ئەگەر باوەر ناکەی فەرموو خۆت وەرە ئێرە. مەلا سمایل گوتی: «چاکت پێ‌گوت». ئەو بێدەنگ بوو، ڕووناک وەدەنگ هات‌و گوتی:
- من تیرئەندازی دەزانم، دەمەوێ ببمە پێشمەرگەی تۆ.
- زۆر سوپاس من پێشمەرگەم لەگەڵ نیە.

- باشە، تەلیفونم بۆ بکە.
- دەزانی سەرم چەند شلوقە، تەلیفونیشت نازانم.

هەستا، هاتە پێش مێزەکەی منو قەڵەمی هەڵگرتو ژمارە تەلیفۆنێکی نووسی، گوتی: «بەڵێ رووناکم دەوێ». دەستی دەدەستی نامو رۆیشت. بەداخەوە قەت نەمتوانی تەلیفونی بۆ بکەم.

ئەو رۆژە، بە قەولی برادەرانی کوردی عیراقی (تەعلیق) دەست پێکران. مەلا سمایل کە تا ئەودەمی واقی ورمابوو چاوی لێ دەرپەڕیبوون گوتی: «دەجا وەرە تۆ ئەو خولایە، کورە وەڵاهی بەختت هەیە. باهم لەساوی پاک بۆت دەبارێ. پێشمەرگە.. بەڵێ پێشمەرگە!».

کاک ئومەر هەزارجار یادی بەخێر گوتی: «کورە خۆ پێم وابوو ئاقلی، ئاخر پیاو چۆن پێشمەرگەی وای نابێ؟!».

راستە وەزع بەرەو ئالۆزی دەچوو. ئێوارەی ئەوی رۆژێ واتە شەوی ٧٩/٨/٣. مەلا محەممەدی جوانرۆیی کە قەت نەخۆی دەنووستو نە دەیهێشت من تارێک چاوم گەرم کەم، نیوە شەو تەلیفونی کردو گوتی: «گیرمەبە وەرە بۆ پادگان». کات دوای نیوەشەو بوو، هەستامو چوومە پادگان. کە چووم دیتم پێشمەرگە براکوردەکانی عیراق هاتوون. دیاربوو دوکتور داوای کردبوو. حیزبی سوسیالیست تاردبوونی وابزانم ئەودەم حیزبی یەکگرتووی سۆسیالیست بوو، چونکە دوکتور مەحمود حاتبوە نێوی. مەسئولەکانیان بریتی بوون لە جەلالی حاجی حوسێنو سەید سەلیم. نیزیکەی ٥٠ پێشمەرگەیەکیان لەگەڵ بوو. نانو چایان بۆ ساز کردن. جەلال دەستی پێکرد کە لە سولەیمانی چی کردوەو لە تۆپ شارەزایەو هیچ هێزێک خۆی لەبەر ناگرێو وایکرد پێم وابوو تانگیش دەشکێنێ. بەراستی بە قسەکانی جەلالی حاجی حوسێن هیوایەکی تەواوم هاتە دڵی. زیاتر بەم خەیاڵەش کەوا پتر لە ١٥ساڵ برادەرانی کوردی عیراق لە شەرو هەرادا بوونو خاراون. جێگای هومید بوو. بە مەلا

محەممەدم گوت: ئێمە لە جەبهەی میاندوار تیپی ١٠٥مان هەیە. چیاکانی تالاو زۆر قایمن‌و دەتوانن نەهێڵن دوژمن لەشامات بێتە پێش. بریارماندا جەلالی حاجی حوسێن‌و سەید سەلیم بچن بۆ جەبهەی میاندواو، واتە لە ئەمیرئابادو بەردە رەشان دامەزرێن. تیربارێکی دژی هەوایش لەسەر کەلکی بەگزادان دامەزرێنن. پەلێکی پێشمەرگەمان هەبوو بە سەرۆکایەتی غەفوری خوارزای ئەحمەد تۆفیقی. لە ئەمیر ئاباد ئەویش یارمەتیان بداو هاوکاریان بکا. هەر بەو شەوە مەلا محەممەد سواری کردن‌و ئازوخەو کەلوپەلی پێویستی بۆ ئامادە کردن‌و بردنی بۆ شوێنی دیاریکراو. بەیانی زوو گەرایەوە گوتی: «لە شوێنی پێویست دامەزراندوون وورەیان بەرزە».

رۆژی ٧٩/٩/١ لەشارەوە دەست کرا بە تەلیفون‌و پرسیاران، پتر خەڵک پرسیاریان لە جەبهەی میاندواو دەکرد. لەوەلامدا دەمگوت جەبهەی میاندواو زۆر قایمە، هێزی تازەمان بۆناردوە عەجەم ناتوانن لەخەتی میاندواو بێتە پێش. بڕواشم بە قسەکانی خۆم هەبوو. چوونکە جەلالی حاجی حوسێنی وای نەکردبوو کە گومانم بێنێ.

شەوی ٧٩/٩/٢ خەبەری کوشتاری قارنێ هات. عەزیزی کوری کاک عەولای جەلدیانێ رەپێش پاسداران دەکەوێ‌و دەیانباتە قارنێ‌و دەست بە کوشتار دەکەن. مەلای گوندی قورئانیان دەباتە تکایە. بەلام پاسداری حکومەتی ئیسلامی قورئانی پی پێنگیش نیە. مەلای قورئان لەسەر دەستیش سەر دەبڕن. ئەو رەسمانەی کە لێرەدا دەیانبینن نموونەی جینایەتی حکومەتی کۆماری ئیسلامین لە کوردستان.

شەو درنگ هەڤاڵدەری رۆیتر تەلیفۆنی کردو وەزعی شارو جەبهەی پرسی. خەبەری کوشتاری قارنێم دابەو گوتم. شار ئارامە. بەلام دەوڵەت خەریکە پەلامار بێنێ. ئێمە دیفاع دەکەین‌و پێشمەرگە ئامادەی بەرگری‌یە.

# پێشنیارو ئیبتیکاری خەڵک.

ئەوانەی سیاسی‌و خۆ بە زۆرزان دەزانن، یا بە قەولی کاک حەسەنی قزلجی دم هەراش‌و قوتن، کۆمەلاتی خەڵک بە هێندناگرن‌و تەنانەت بە نەزانیشیان دادەنێن. بەلاّم هەر ئەم خەڵکە رەمەکی‌و ناسیاسیانە هێندی‌جار ئەوەندە ژیرو خاوەن بیرو بە ئیبتیکارن کە سیاسیە دم هەراشەکان هەر بیریشی لیٚ ناکەنەوە. لە رۆژەکانی ئاخری ئوت‌و هەوەلی سێپتامبری ١٩٧٩ شەر قونی دەدەرکیٚ نابوو، خەڵک ترسی ریٚ نیشتبوو. کورەکانی یەکیتی لاوان لە هێندیٚ شوێنی نێوشار لەسەربان‌و لە کۆلانان خەریکی سازکردنی مەتەرێزان بوون. لە خانەی جەوانان شەوو رۆژ شێعرو درۆشم‌و سرودی شۆرشگێری بلاّو دەکرانەوە. لەم دوو رۆژەدا، خەڵکی شار دەستە دەستە دەهاتن‌و پێشنیاری جۆربەجۆریان دەکرد کە هێندێکم یادداشت کردوون:

١- چەند هاونیشتمانێک هاتن گوتیان: «کاک کەریم ئێوە لە دوو جەبهەوە شەرتان پیٚ‌ناکریٚ. ناتوانن هەم لە رێگای ورمی‌و هەم لە رێگای میاندواو پێشی ئەرتەش بگرن. مەهەندیسەکانی سەدی مەهاباد بدۆزەوە، نەخشەی بەتلو جۆگەی ئاویان لەلایە. با ئاو بەردەنە دەشتی وسوکەند، ئەو دەشتە نەرمان‌و زەوی‌و زارە دەبێتە قوروو لیتە، تانگ لەو قوروو لیتاوە دەرناچن‌و ناتوانن بۆ شار بێن. ناشتوانن بە رژدو چیای پشت وسوکەند هەڵگەرێن».

٢- چەند کەس هاتن گوتیان: «بەرقی شاری ورمی‌و ئەم شارانەی

ئەولای بەشارویران‌دا تێدەپەری. بنێرە با لەچەند جێگا مەخزەنەکان بتەقێنن. سیمەکانی بەرق هەڵبرن. ورمێ‌و شارەکانی ئەولای لەتاریکایی‌دا دەمێننەوە».
٣- چەند کەس هاتن گوتیان: «خەڵک دەنگ بدەن با سەربازخانە ویران بکەن‌و داری لەسەر بەردی نەهێلن».
٤- دەستەیەکی‌تر هاتن دەیانپرسی: «ئەو هەموو تانگ‌و تۆپی پادگان چیان بەسەرهات؟».
بە کورتی دڵسۆزی‌و هاوکاری خەڵک بە گوێرەی سەلیقەو بۆچوون‌و توانا لەورۆژانەدا خۆی دەنواند. برادەرێکی تیشتماتپەروەر هات ٢٠ خشابی کلاشینکۆف‌و سندوقێکی فیشەک هێنا. فرۆکەکانی کۆماری ئیسلامی رۆژانە بەسەر شاردا دەگەران‌و بەڵام تەقەیان نەدەکرد.
رۆژی ١١ی خەرمانان، ١٩٧٩/٩/٢ لە بلیندگۆی خانەی جەوانانەوە رامان گەیاند کە خەڵکی شار لە ساڵۆنی فەرمانداری کۆبنەوە. تا لەبارەی وەزعی شارو چۆنیەتی بەرگری بارو دۆخی ئێستا راوێژ بکەین. ئەندامانی شورای شار مامۆستاکانی ئاینی بە گشتی، ریش سپی‌و تاجرو بازاری‌و کرێکار، مامۆستاو ژنانی شار بەشداری تەواویان کردبوو. ساڵۆن پر ببوو، جێگای خەڵک نەدەبۆوە. کاک برایمی شیرزاد کۆبوونەوەی بەرێوە دەبرد. هەستام دوای بەخێر هێنان‌و سوپاس بۆ هاوکاری‌و دڵسۆزی خەڵک گوتم:
«ئێمە شەرخواز نین. حیزبی دیموکرات هەوڵ‌و تەقەلایەکی زۆری داوە کە تووشی شەر نەبین‌و مەسەلەی کورد لە رێگای ئاشتی‌و هێمنانەوە چارەسەر بکرێ. بەڵام حکومەتی ئیسلامی شەرمان پێ دەفرۆشێ. پەلاماردانی پاوە، سەرەتای هێرشی سەرانسەری بوو بۆسەر کوردستان. حیزبی دیموکرات خۆی لە خەڵک بەجیا نازانێ. هەر بۆیەش ئەمرۆ داوام لە هاونیشتمانانی بەرێز کردووە کە لێرە کۆبینەوە بزانین چ بکەین. پێم خۆش بوو خەڵکی گوندەکانی ناوچەی مەهابادیش لەم کۆبوونەوەیەدا بەشدار

بان. بەلام بەداخەوە ئەم باروودۆخە رێگا نادات».

دوای قسەکانی من دوو کەس هەستان بە ئاخافتنی بێ‌مەسئولیەت مەسەلەی سوننی‌و شیعەیان هێنا گۆڕێ‌و کاتی کۆبوونەوەیان گرت.

مامۆستا مەلا کەریمی شاریکەندی هەستاو گوتی: «موبارەزە شکلی زۆرن. شەر تاقە شکلی خەبات نیە. من لام وابوو رێگاکان ئازاد بکەین. ئەگەر بوو بەشەر با لە چیاکان شەر بکەین. حیزب با تیلگرافیک بۆ خومەینی بنیرێ‌و بڵێ بۆ حوسنی نیەت رێگا چۆل دەکەین با لەشکر بێتەوە پادگان. ئەگەر پاسدارو ئەرتەش دەست درێژیان بۆ خەڵک کرد ئەو دەم شەر دەکەین. با هێزی چەکداری پێشمەرگە بچنە چیاو ببنە پشتیوانی ئێمە لە نێوشار. ئەودەم ئەوانیش ناوێرن دەست لەشار بدەن».

لە نێو قسەکانی‌دا مامۆستا مەلاکەریم یەک دوو پلاریشی دەمەلا شیخ عیزالدین گرت. بەدوای قسەکانی مامۆستادا، هەستام گوتم: «لام وایە کاتی زیندووکردنەوەی کۆنە حیسابان نیە. هەرچی بێ ئێستا مامۆستا شیخ عیزالدین لە چیایە. باشترە ئێمە لێرە تەگبیر لە وەزعی ئێستا بکەین».

مامۆستا مەلا کەریم لە وەلامی قسەکانی مندا کە هەستم کرد پێ‌ناڕەحەت بوو گوتی: «پێم‌وایە ریشەی ئەم رووداوانە دەبێ بدۆزینەوە. هیچ رۆوداوێک کوت‌و پڕ سەر هەڵنادەن. ئێمە نەمانتوانیوە بە باشی لەگەڵ رووداوەکان بڕۆین‌و یا بەردەستیان بکەین».

بە دوای قسەکانی مامۆستادا برادەرێک بەناوی (ئەحمەدی داودی) هەستاو گوتی: «من دوێنێ لە تەورێز هاتومەوە. شەش‌سەد تانگ لە میاندواو بەرێز راگیراون‌و ئامادەی حەرەکەتن. جا لەگەڵ ئەوانە شەر چۆن دەکرێ؟ باشترە رێگایان بۆ بەردەن‌و حیزب‌و پێشمەرگەش با لەشار وەدەر کەون. بابم شەر لەگەڵ ئەو لەشکرە ناکرێ».

خەڵکەکە بێدەنگ بوو. کاک‌برایمی شێرزاد هەستاو گوتی: «زۆرکەس

بیروڕای خۆیان دەربڕی. وادیارە کەس نەماوە قسە بکا، ئێستا قسەی ئاخری ماوەتەوە بۆ کاک کەریم‌و بڕیارەکەش بەدەست ئەوانە».
هەستام گوتم: «لە پێشدا لە خزمەت مامۆستا مەلا کەریم داوای لێبوردن دەکەم. هەستم کرد کە قسەکانی منی لە دڵی گران هات. بەڵام من بێجگە لە هەوڵدان بۆ یەکێتی مەبەستی دیکەم نەبوو. پڕ بەدڵ جارێکی دیکەش سوپاسی مامۆستاکان دەکەم کە بە دەستە جەمعی تەشریفیان لەم کۆبوونەوەیەدا ئامادە بوون. سوپاسی خەڵکی بەشەرەفی مەهابادو هەموو بەشداراتی کۆبوونەوە دەکەم. بەر لەوەی بێمە سەر قسەی ئاخری وەک کاک برایم فەرمووی، با سوپاسێکی ئەو تانکانەی میاندواویش بکەم کە کاک ئەحمەدی داودیان نەخواردوەو ڕێگایان داوە بگاتەوە مەهابادو ئەو خەبەرەمان بۆ بێنێتەوە. بەڵام ئەویش دەبێ خێرێکی بکا کە وا هاسان نەجاتی بووە. بوو بە پێکەنین‌و چەپلە لێدان.
پاشان گوتم: پێشنیارم ئەوەیە کە مامۆستاکان تەشریفیان بچێتە تێلگرافخانەو بە تەلیفون لەگەڵ قوم‌و مەلاکانی تاران قسە بکەن. ئەوە خۆی ڕێگایەکە. دەکرێ لە تێلگرافخانە مانیش بگرن. بەڵام خۆتان دەزانن حیزبی دێموکرات دەیان‌جار ڕای‌گەیاندووە کە شەڕخواز نیە. ئێستا کە کۆماری ئیسلامی شەڕمان پێ‌دەفرۆشێ من لێرەدا بە ئاشکرا ڕادەگەێنم ئێمە مەهاباد دەکەینە ستالینگراد. بوو بە چەپلەڕێزان. کۆلان بە کۆلان‌و ماڵ بە ماڵ شەڕی تێدا دەکەین. داوا لە خەڵکی بەشەرەفی شار دەکەم لەو خەباتە پیرۆزەدا پشتیوانیمان لێ بکەن. ئێمە شەڕخواز نین شەڕمان بەسەردا سەپاوە. پاشان گوتم: با ئەوەش ڕابگەێنم کە فانتۆمەکان شەو دێنە سەر شار، دیواری دەنگ دەشکێنن‌و دەنگەکەش زۆر بە سامە. بەڵام بۆمباران ناکەن لەو بارەوە ترس نیە. پەنجەرەکان بکەنەوە با شووشەکان نەشکێن. جارێکی‌تر سپاستان دەکەم. خەبەری فانتۆمەکان برادەرانی بەشی ئیزامی پێ‌یان ڕاگەیاندبوون.

کۆبوونەوە بڵاوەی کرد. ئێمە چووینەوە دەفتەری حیزب وەزع ئارام‌تر بوو، خەڵک کەمتر هاتوو چۆی دەکرد. کاک سەید حەسەنی هاشمی‌و کاک ئومەرو مەلا سمایل هەمیشە لە دەفتەر بوون. لەتارانەوە هەڤالدەرەکان پەیتا پەیتا دەیانپرسی‌و جوابمان دەدانەوە. چوومە پادگان مەلا محەمەد خەریکی سوک کردنی پادگان‌و ڕاگواستنی کەلوپەل بوو. سەعات یەکی شەو چوومەوە چاوێک گەرم بکەم. سەعاتی پێنجی بەیانی بەدەنگی فانتۆمەکان وەخەبەر هاتم. بەسەر شاردا دەسورانەوەو دیواری دەنگیان دەشکاند. بە پەلە وەدەر کەوتم بۆ دەفتەری حیزب. برادەرانی نیزامی تانگێکیان ناردبوە لای سی‌ئاشان‌و لە مەیدانی مەلاجامی وەستابوو، دەیویست تەقە لە فانتۆمەکان بکا. پێم گوت: بچێتەوە پادگان ئەوان بۆمباران ناکەن، ئێمە بۆچی تەقەیان لێ بکەین؟ تانگەکە گەڕاوە بۆ پادگان کە چوومە پادگان مەلا محەمەدی جوانڕۆیی گوتی: هەروا خەریکم ئێرە سووک بکەم. جارێ هیچ خەبەر نیە. سەعاتی ١١ هەموومان لەبەر دەرگای دەفتەری حیزب ڕاوەستابووین. خەڵک لە دەورەمان کۆببۆوە، فانتۆمێک هاتەسەر دەفتەرو لەسەر پادگان دەسوراوە. کوڕێکی مێرمنداڵ لام وایە هەر دوازدە سێزدەساڵ دەبوو، دەمانچەیەکی سەگتریتی پێ‌بوو، هەر هەڵیکێشا دەمانچەو فانتۆمی وەبەر دەمانچان دا. ئێمە هەموو واقمان وڕما. مەلا سمایل غاری دایە زللەیەکی لێداو دەمانچەکەی لێ‌ئەستاند. پاشان دەمانچەکەمان وێ‌داوە. لەسەرێ تەلیفون زەنگی لێدا، هاتن گوتیان بانگت دەکەن. کە چوومە سەر کاک سولەیمانی چیرە بوو لە کومیتەی نیزامیەوە تەلیفونی دەکرد:

- کاک کەریم چ دەکەی؟ خۆ ئەوە ئەرتەش گەیشتە نێو شار.

- کوڕە چۆن شتی‌وا دەبێ؟ ئەدی ئەو هێزەی ئێمە چی لێ‌هاتوە؟

- نازانم چی لێ‌هاتوە! بەڵام ئەرتەش ئەوە لە دەروازەی شارە. من ئەوە دەڕۆم، گیر مەبە وەدەر کەوە.

هاتمەوە خوارو گوتم: دەڵێن لەشکر گەیوەتە نێوشار. ئێمە لەو قسانەدا بووین تۆپێکی ٦.١٠مان بۆ جەبهەی میاندواو ناردبوو، دیتمان ئەوە ہاڵی گرتوەو دەگەڕێتەوە بۆ پادگان. دەستمان هەڵێنا کە ڕایگرێ بزانین چ باسە. ڕانەوەستا هەر ئەوەندەی گوت: لەشکر هات. تێپەری بۆ پادگان. لام وایە حەسەن بێ کەسی ڕەحمەتی لەسەر بوو.

برادەران گوتیان چ دەکەی بۆ ڕاوەستاوی؟ با لە شار وەدەر کەوین. خەڵکەکە بڵاوەی دەکرد. شوکرەو جەماڵی پێشمەرگە لەندوێریکیان پێبوو مەلا سمایلو کاک سەید حەسەنو سۆفی ریش درێژی پێشمەرگە لەگەڵ ئەوان سوار بوون، منو کاک نومەرو وسێن مەراغەییو عەزیزی کوری سواری ماشینی کاک نومەر بووینو سەعاتی ١٢ ڕۆژی ١٢ی خەرمانان ٣ی سیپتامبری ١٩٧٩ لەشاری مەهاباد وەدەر کەوتین. گەیشتینە پشت تەپی دوو کیلۆمیتری شار. لەبەر دەرکی ماڵێک ڕاوەستاین، ژنو پیاوو گەورەو بچووک وەک مێرو لەشار دەهاتنە دەرو بەرەو پشت تەپو قەرە چەلانو وزیندەرێ ڕێیان داگرتبوو. چووینە حەساری ماڵەکەو گوتم: «کورینە ئێمە هەروا بە هاسانی شارمان بەجێ هێشت بێ ئەوەی بزانین لەشکر چ دەکا؟ ئێمە دەمانتوانی لەشاردا بمێنینەوە، لەماڵاندا خۆ حاشار دەینو ئاگامان لە وەزع هەبێ. ئێستاش دوور نەکەوتووینەوە با بگەڕێینەوە بۆ شار».

ئێکرا گوتیان کورە گەڕانەوەی چی؟ شار ئەوە چۆڵ دەبێ تۆ دەگەڕییەوە چ دەکەی؟ کاک نومەر دیسان بە قسە خۆشەکانی گوتی: شوجاعانی فیراری ئەوە لەسەردەشت ئاوا بوون، تۆ تازە دەچییەوە نێو شار؟ (شوجاعانی فیراری) لەقەبێک بوو کاک نومەر دابووی بە ئەندامانی کومیتەی ناوەندی، گۆیا ناوی فیلمێک بووە.

گوتم: کەوایە تکایە ئێوە لێرە بن من سەرێکی شار دەدەمەوە با بزانم ئەندامانی کومیتەی شار لە کوێن. لە نێو شار ماون یا ڕۆیشتون؟

هەموویان دژی گەرانەوەم بوون. گوتم دەچمەوە، هەر دەچمەوە ئێوە چاوەروانم بن. ئەگەر نەهاتمەوە ئیتر خۆتان دەزانن. بە شوکرەو جەمالی بەشەرەفم گوت: سوار بن با بچینەوە شار. پیاوانە ماشینیان هەلکردو گەراینەوە. لەسەر شەقامی نیزیک مەیدانی حەیوانان کە پاشان بوو بە (مەیدانی خومەینی) خەلکێکی زۆر راوەستابوو. کە چاویان بە من کەوت لێم هالاْنو پرسیم لەم مالانە کێ تەلیفونی هەیە؟ مالێکیان نیشان دام پێم‌وایە مالی ئاغاکانی گەرێزە بوو. کورەکان ماشێنیان لە پەنایەک راگرتو چوومە مالەکە هەر ئاوەدان بێ. دەستم کرد بە تەلیفونان. برادەرانی کومیتەی شار یەکیش نەمابوو. بۆ چەند مالی دیکە تەلیفونم کرد کە قەرار بوو هێندێکیان لەوێ بن، کەسم وەگیر نەکەوت. کۆنە دۆستێکی سالانی ٤٩-٥٠ هەبوو تەلیفونم بۆ ئەو کرد. تەلیفونی هەلگرت:

- ئەیرۆ ئەوە لە کوێی؟
- لێرە لە نێو شارم، دەتەوی لە کوی بم؟
- جا چۆن لە نێو شاری، ئەوە نیە دەلێن ئەرتەش هاتۆتەوە؟
- با ئەرتەش بێتەوە بەمن چی؟
- ئەیرۆ چۆن... کەس نەتبینێ، وەرە مالی ئێمە. کەس فیکری مالی ئێمە ناکات، گیر مەبە،
- نایەم هەر ویستم بزانی لە شار نەماوم وەدەر دەکەوم.

یەک دوو ئەیرۆی دیکەو قسەی خۆشی کردو تەلیفونم داناو وەدەر کەوتم. سوار بووین خوا حافیزیم لە خەلکەکە کرد کە لە دەوری ماشین کۆ ببوونەوە. چووینەوە پشتەپ.

برادەران گوتیان: «با لەگوندی وەدەر کەوین لەو قەتپالە لە بن ئەو گیشە گەنمو ویتجانە دادەنیشین». ماشینی کاک نومەرمان لە حەساری مالی برادەرەکە بەجێ هێشت. من بەلگەو نووسراوەی حیزبیم هێنابوونە

دەر. دامن بە کابراو پێم گوت: لە خۆم بەدەر یا بە نامەی من نەبێ نەیاندەیەوە بە هیچ کەس. کاک ئومەر گوتی: «بۆ بەتەمای هەر زیندوو بیڕو بێیەوە ئەوانە وەرگریەوە؟» هێندێکی دیکەش پێکەتین. عەزیزی کوری وسێن مەراغەیم ناردەوە نێو شارو چەند رەمزو قەراری پێوەندیم لەگەڵ دانا. لە پشتەپ وەدەر کەوتین، ئەمجارە هیلیکۆپتەر دوو دوو دەهاتن‌و بە سەر رێگاو خەڵکی راکردوودا دەسوورانەوە، بەڵام تەقەیان نەدەکرد. فانتۆمەکان چەند بۆمبایان بە دەوروبەری پادگان دادار یەک دوو عەنبار ئاگریان گرت. ئیتر پێوەندیمان لەگەڵ مەلا محەمەدی جوانرۆیی‌و برادەرانی بەشی نیزامی براو نازانم بۆ کوێ چوون.

ئێمە تاوێک لەبن گیشە رێنجە دانیشتین‌و پاشان هەڵکشاین بۆ بن دارەکانی سەرووی پشتەپ. خەڵکێکی زۆر لەو بن دارانە کۆ ببۆوە. چوومە نێویان دڵخۆشیم دانەوەو گوتم بگەرێنەوە بۆ نێو شارو هیچ باس نیەو ماڵی خۆتان بەجێ مەهێڵن. ماڵیان ئاوەدان بێ بە قسەکانی من تۆزێک هاتنەوە سەرخۆ، وردە وردە هێندێکیان بەرەو شار گەرانەوە. ئێمە دانیشتین تەکبیر بکەین چ بکەین‌و بچینە کوێ؟ برادەران گوتیان: «کومیتەی ناوەندی کادرو بەرپرسی حیزبی بە گشتی روویان دەلای سەردەشت کردووە. ئێمەش با بۆ ئەولا بچین‌و ئەندامانی کومیتەی ناوەندی بدۆزینەوە.

گوتم: ئێمە لە کۆبوونەوەی کومیتەی شار بریارماندا شار بەجێ نەهێڵین. ئەگەر وەدەریش کەوین لە کۆنەدێ کۆوە بین. ئێستا رەنگە زۆربەی برادەران لەوێ بن. ئەگەر لەویش نەبن دەیاندۆزینەوە پێویستە لەگەڵ شار پێوەند بگرین. بەسەر سەنگی ملیان راکێشا. سۆفی ریش درێژ گوتی: «کاک کەریم ئەگەر ئیجازە بدەی من دەرۆم‌و دەچمەوە گوندەکەی خۆم». خوا حافیزی لێکردین‌و ملی رێگای داگرت.

شەو بەسەر داهات، فانتۆم دەسورانەوە، نورئەفکەنیان هەڵدەدار بە

جارێک وڵات ڕووناک دەبوو. لە نیزیک وزیندەریٚ تووشی جیٚ خەرمانێک بووین. خەرمان هەڵگیرابوو، بەڵام کایەکە هەر مابۆوە. گوتمان بەر نیوەشەوەی لە حاجی حەسەنی وەژوور کەوین هەر زراویشی دەچیٚ. با لە نێو ئەم کایە بخەوین‌و بەیانی بچینە وزیندەریٚ. شەو هەموومان خۆمان لە کایی خزاندو لێی نووستین. بەیانی کە هەستاین پتر لە سەعاتێک هەر خەریک بووین خۆمان بتەکێنین. بە تایبەت من راتگ‌و چۆخەم لەبەردا بوو، خاوێن هەر نەدەبوومەوە. ڕۆیشتین تازە تاو هەڵدەهات چووینە وزیندەریٚماڵی حاجی حەسەنی قازی. گورج نان‌و چا سازکرا هاتینە دەر دیتمان هەروا خەڵکە لەشار وەدەر دەکەوی‌و بەرەو مەنگوران ڕێیان داگرتووە.

پاش نان‌و چا خواردن شۆڕ بووینەوە بۆ کۆزنەدیٚ. جێژوانی کۆبوونەوەی ئەندامانی کومیتەی شار. گەیشتینە نیزیک گوندی تەماشام کرد پێشمەرگەکانی کوردستانی عیراق بە سەرۆکایەتی جەلالی حاجی حوسێن‌و سەید سەلیم ئەوە لە نێو باخی حاجی عەولا لێی کەوتوون. پرسیم کاک جەلال لەکوێیە؟ گوتیان: «وا لەو بن دارە نووستوە» ئەدی ئێوە چۆن گەیشتوونە ئێرە؟ تۆپ‌و دۆشکە چی‌یان لیٚ‌هات؟

- کاکە تۆ چی ئەڵێی. بەخوا نەماتوانیوە گوللەیەکیش بتەقێنین. کۆپتەر لەسەرمان بوو، خوا هەڵناگریٚ نەیویست تەقەمان لیٚ بکا. ئەگینا یەکیشمان دەر نەدەچوو. جەلال‌و سەید سەلیم هاتنە لام هیچیان نەبوو بیلێن. ئەوەندە نەبیٚ گوتیان: «ئێمە حەساوینەوە، دەگەڕێینەوە بۆ لای برادەرانمان».

چووینە نێو گوندی ماڵی حاجی عەولای، چ بچین حەسارو ژووری باخ‌و بن‌دیوارو کۆلانی گوندی پڕە لەخەڵک‌و دواییشی نەپساوەتەوەو هەروا دێن. بەڵام یەک ئەندامی کومیتەی شاریش لەویٚ نیە. نانێکی باشمان خوارد، مەلا سمایل گوتی: «من دەڕۆم دەپەڕمەوە بۆ بەری ماسوی‌و

سوراخێکی مەلا محەمەدی جوانرۆیی‌و برادەران دەکەم». سەید حەسەن گوتی: «دەڵێم جاریٚ لێرە بم تا خەبەرێکی منداڵەکان دەزانم». ئێمە لەو قسانەدا بووین کەریم بێژەنی ئازاو جوامێر پەیدا بوو. نامەیەکی مەلا محەمەدی جوانرۆیی هێنابوو. مەلا محەمەد نووسیبووی: «من‌و سەرگورد عەباسی هاین لە گویجکەدەریٚ. تکایە گیر مەبە بگە ئێرە». بە کاک ئومەرم گوت: با برۆین. کاک قاسمی کوری حاجی عەولای کیسەخەوێکی ئەفسەری لە رادە بەدەر باشی هێناو گوتی: «بیدە بە کەریمی با هەڵی‌گریٚ، لەو دێهاتە پێخەفی خاوێنت وەگیر ناکەویٚ» سوپاسی دەکەم. بەراستی ئیتر پێویستم بە پێخەف‌و منەتی نوێن نەمابوو. شەوانە دەچووم دە کیسە خەوو لە کێچ‌و ئەسپیٚ‌و مارو مێرو لە ئەماندا بووم.

رۆژی ٧٩/٩/٤ لەگەڵ کاک ئومەرو حوسێن مەراغەیی‌و کەریم بێژەن‌و دوو پێشمەرگە بۆلای مەلا محەمەدی جوانرۆیی کەوتینە ریٚ. لە گوندی بیرەم لاماندا. خەڵک لێمان کۆ بۆوە. (بەیرەم ئەو گوندە بوو کە من لێی هاتبوومە سەر دنیا) تۆزێکم قسە بۆ خەڵک کرد. پەلێکی پێشمەرگەمان لەویٚ هەبوو. گوتم لێرە بمێننەوە تا خەبەرتان دەدەمیٚ. لەویٚ گیر نەبووین بەرەو گوندی بەرەجۆ. لە نێوان بەیرەم‌و بەرەجۆ تووشی دوو کەسی قۆچاخ بووین یەکیان تاپرێکی لەشانی‌دا بوو، ئەوی‌تریان تەورداسێکی بەدەستەوە بوو. کە ماشینی پێشمەرگەیان دیت. راوەستان‌و گەش بوونەوە. ماندوو نەبوونیان لێی کردین‌و گوتیان: «ئۆخەی شوکر پێشمەرگە ماوە، ئێمە ئەوە بە هاواری خەڵکی مەهابادەوە دەچین، دەڵێن شار چۆڵ‌کراوە. لە دڵسۆزی ئەم خەڵکە، حیکایەتی شێخی جامی-م وەبیر هاتەوە لە باسی یوسف‌و زولیخادا دەڵیٚ: «کاتێک یوسفیان لە مەیدان راگرتبوو، بیفرۆشن‌و هەراجیان دەکرد، کڕیار بە زێڕو درهەم لە سەر یەکتریان زیاد دەکرد. پیرێژنێکیش چەند گوریسی هۆندبوونەوە، هاتبوو لە

ریزی کریاران ویستابوو. جامی لە شیعرەکەیدا دەلیٚ:

شنیدم کز غمش زالی برآشفت تنیده ریسمانی جند می‌گفت
همین بس گرچه بس کاسد قماشم که در سلک خریداران باشم.

ئەم دوو کوردە زەحمەت کیش‌و دلٚبریندارەش کە خەبەری هاتنەوەی ئەرتەشیان زانیبوو، بە تاپرو تەوەرداسەوە بۆ یارمەتی خەلٚکی ساباڵاخ کەوتبوونە ریٚ. کاک نومەر دەیگوت: «بۆ تالانیٚ دەچن».

گوتم براکیان باشترە ئیوە لە نیو گوندی خۆتان لەگەلٚ خەلٚکی ئاوایی یارمەتی بەو مالاٚنەی مەهابادی بکەن کە رایان کردووەو جیگایان نیە. نان‌و پیخوریان بۆ کۆبکەنەوە، جیگایان بۆ بدۆزنەوە، ئەگەر پیشمەرگە هاتن یارمەتیان بکەن. خەبات خۆ هەر شەرە تفەنگ نیە. گوتیان: «بە قوربانی زارت بین ئەگەر وایە ئەو مەلا گویلکەی ئیمە تیٚبگەینە».

- خەلٚکی کوین؟
- خەلٚکی بەرە جۆین.
- مەلای گوندی کی‌یە؟
- میرزا برایمی عەولا مەرجانیە.

گوتم ئەوە دەچم میوانی مەلای دەبم. کاک نومەر گوتی: «بەو حالە هەرچی توشی بین‌و ئەوەندە قسەی لەگەلٚ بکەی شەو هەر لە مەزرایە دەبین».

دەگەلٚ ئەو میرزا برایمە کە ئیستا بیووە مەلا برایم، بە مندالٚی لە گوندی بەیرەم لەکن میرزا رەسولی پیکولە پیکەوەمان خویندبوو. ئەو لە ئیمە گەورەتر بوو. لیک هەلٚبرابووین، ئەو ریگای مەلایەتی بۆ بەریٚ چوونی ژیان گرتبووە پیش. بەلاٚم بیجگە لە فاتیحەو پیش‌نویژی چی‌تر فیر نەبیبوو. منیش توشی ئەم چارەنووس‌ر بەزمەبیووم کەوا لە بیرەوەریەکانمدا دەیخویننەوە. مەلاٚ برایم سالٚی ۱۹٦۷ رەگەلٚ بزوتنەوەی رزگاریخوازی کەوتبوو. دوای شکانی بزوتنەوە گیرابوو، کەوتبووە بەر ئازارو

ئەشکەنجەی ساواک، پاشان ئازاد کرابوو لە گوندی بەرەجۆ مەلایەتی دەکرد.

گەیشتینە نێو گوندی. ماڵی مەلام پرسی. نیشانیاندایناو چووین لەبەر دەرکێ دابەزین. کچێکی رەش ئەسمەری قەڵەو دەتگوت لادیوارە لێمان وەدەر کەوت. پرسیم مامۆستا لە ماڵە؟

- نەخێر لە ماڵ نیە. لە نێو دێیە.

- لە دوای بنێرە بێتەوە. ئەدی بۆ ناڵێی فەرموون، خۆ ماڵەکەتان بە قور نەگیراوە، زوو نانو چایەکمان بۆ ساز کەن. کچ لە قسەکانم واقی ورما، خۆی دەژووری کوتاوە. ئێمە چووین لە وەتاخێ دانیشتین. ئەمجار مەلا ژن هات، بەخێرهاتنی کردین گوتم:

- جەنابی مەلا لە کوێیە؟... هەر وەک جاران بێ‌ناقڵە؟

- جا ئەوە خۆتان دەزانن، ئەری بۆ نەزانم کێ‌مان میوانە؟

- زانینی بۆ چیە، هەر کەس میوان بێ خۆ نانوچایەکی هەر دەدەنێ. من فلان کەسم.

- ئەیرۆ رەبی بەخێر بێی، بەقوربانت بم، دەبا باسکت ماچ کەم. مەلا چەندەت باس دەکا. کتێبی تۆی بە قاچاخی وەگیر کەوتبوو هەر بە شەو دەیخوێندەوە. ئەگەر لەسەر رادیۆ قسەت دەکرد مەلا دەگریا، دەیگوت پێکەوەمان خوێندوە.

مەلا ژن چۆوە ژوورێو مەلا برایم هاتەوە. پێیان گوتبوو کێ‌میوانە. هەر لە دەرەوە را دەستی پێ‌کرد:

- دەک خولاً بەخێرت نەهێنێ، هاتیەوە ئێرەشت تێکدا. جا بزانە لە چ وەختێکدا لێم میوان دەبی. لەگەڵ ئەو قسانە وەژور کەوتو دەستی کردە ئەستۆمو دەستی کرد بە گریانو گوتی: «ئەری بۆ وامان لێ‌هات؟ دور شەوە خەو لە چاوم ناکەوێ. ئەو خەڵکە چی بەسەر دێ؟

- ئەو شینو گریانەی ناوێ، خەڵکیش چی لێ بەسەر نایبە، بە

گونی‌مەلای دا دەرین. دڵت نەتزقێ شەر دەکەین کوردستانیان لێ دەکەینە جەهەندەم. ئێوەش لەسەر بەرماڵێو لە کولجی مزگەوت بە مڵی شکاوتان هەر دوعامان بۆ بکەن.

ئەمجار کەوتینە چاک‌و چۆنی‌و قسەی خۆش‌و یادی سەردەمی منداڵی. گوتم: «رۆژی گریان نیە. خۆت مەکە جلۆ پەلاس، خەڵکی گوندی کۆزە کە، چەند کەسی چالاک دیاری بکەن بۆ راپەراندنی کارو باری پێشمەرگە. ئەگەر پێشمەرگە هاتن پێداویستیان هەبوو، یارمەتیان بدەن. ئەم خەڵکەی رای‌کردووە، ئەگەر بێنە ئێرە. جێگاو خواردەمەنیان بۆ دابین بکەن. لەسەد نوێژ خێری پترە».

دەستی کرد بە پرسیاری سەبرو مەلاپانەر قسەی خۆش. نانێکی باشیان ساز کردبوو، ناغان خواردو کەوتینە رێ. لە گوندی میرەدێ لەسەر رێگا لەبەر دەرگای ماڵێک راوەستاین داوای دۆمان کرد بخۆینەوە. میرەدێ پر بوو لە ماڵە ساپلاغی. نازانم چۆن بەو دووڕۆژە ئەو هەموو عالەمە گەیشتبووە ئەم گوندە. لەبەرامبەر ئەو ماڵەی دۆیان بۆ ئێمە دەهێنا شێری ئاو هەبوو، ژنی لێ‌هالاببوون. لە نێو ژنەکان یەک بانگی کرد: «ئەری ئەوە کاک کەریمی حیسامی نیە؟» کەریم بێژەن گوتی: «بەلی راست خۆیەتی». غاری‌دا هاتە پێش. گوڵخاتر، کیژی وەستا عبدالخالقی ئاسنگەری خەڵکی نەغەدە. بەخێرهاتنی کردم‌و پرسیم: «لێرە چ دەکەی؟

– هەڵاتووین، خزمان هەیە لێرە. فەرموون لادەن، ماسیمان هەیە، ئێستاسازی دەکەین.

– سوپاس وەختی لادان نیە، ئێستا لەبەرەجز ناغان خواردووەو دەبێ بڕۆین.

– نابێ، بەقوربانت بم دەبێ هەر لادەن.. ئامینیش لێرەیە.

– ئامین بۆ لێرەیە شوی نەکردوە؟

– ناوەڵا شوی چی. ئەوەی ئامین دەیەوی هێشتا لە دایک نەبووە. هەر

دەبێ لادەی. ئامین بزانێ بیرەدا هاتووی لات نەداوە چەند نارەحەت دەبێ.

کاک ئومەر دیسان هەزارجار یادی بەخێر لەسەرە خۆ گوتی: «بەخولای نارۆی. دەبچۆ ئامینیش ببینە». بوو بە بێکەنین. گوڵخاتر گوتی: «فەرموون دەبێ هەمووتان بێن چایەک بخۆنەوە». ئاچار چووین بۆ ماڵەکە. گوڵخاتر لەبەر دەرگا بانگی‌کرد: «کچێ ئامین وەرە ئەوەتا کاک کەریم لێرەیە» گەیشتینە بەر دەرگا ئامین دەهاتە دەر. دیتن‌و تێک هەڵەنگوتن‌و تێک روانینمان هەزار بیرەوەری لێ‌دەباری. ئامین وەختی‌خۆی کیژێکی لە رادە بەدەر جوان بوو، بە تەما بووم بیخوازم، بەلام زیندان‌و دەربەدەری دووری خستبوومەوە. نەمزانی ئەو کیژە جوانە بۆ ماوەتەوەو شوی نەکردووە. چاک‌و خۆشیمان کردو چایکمان خواردەوەو کەوتینە رێ.

کە چووینە گوێجەکەدەرێ، چ بچین، ئەم گوندە ببووە بنکەو پێگەیەکی گەورەی تێزامی. بە دەیان لۆری کەلوپەلی عەسکەری لەوی هەلرژابوو. مەلا محەمەد لە پادگانەوە هەرچی توانیبووی ناردبوویە گوێجەکەدەرێ.سەرگورد عەباسی رەحمەتیش لە کێتکە بنکەی دانابوو ئەویش هات. بەیانی نامەیەکی دوکتور قاسملو هات. نووسیبووی: «کاک کەریم لە هەر جێیەک بێ، ئەگەر بۆ چەند سەعاتێش بێ پێویستە سەرێکمان لێ بدا». ئیتر زانیمان کە دوکتورو برادەرانی دەفتەری سیاسی لە کوێن. دانیشتین. پاش لێکۆلینەوەو باسی بارو دۆخ هاتینە سەر ئەو بریارە: کە کەلوپەلو ئامرازی عەسکەری هەرچی لەوێیە. بۆ لای سەردەشت‌و کاوڵان‌و کوران بەرێ بکرێ. پێشمەرگە هەرچی ئامادەبەو هەرچی لەمەودواش دەگاتێ، لە کێتکەو لە گوێجەکەدەرێ بێننەوە تا من لەلای دوکتور دەگەرێمەوە.

رۆژی ٧٩/٩/٥ درای نیوەرۆ درەنگ لەگەل کەریم بێژەن‌و مەلاقادری

لاچینی بەرەو سەردەشت کەوتمە رێ. تاریک‌دا هاتبوو گەیشتینە سەردەشت. چووینە رێکخراو، مەلا حەسەنی رەستگار بەرپرسی رێکخراوی سەدەشت بوو، بەلام لەوێ نەبوو. ملی رێگامان گرت بۆ بێوران. لە نیزیک بێوران تەماشام کرد سندوقە گوللەو قورخانەو کەلو پەلی نیزامی بێ‌خاوەن‌و بێ سەرپەرشت لە بن داران‌و لەمبەرو ئەوبەری جادە فرێ‌دراون. شۆفیر هێناویانن نەکەس هەبووە وەریانگرێ، نە ئەوانیش زانیویانە چی‌یان لێ بکەن، لەو دەشتە هەلیان رشتوون. هەرچی بەرپرس‌و کادری سیاسی‌و نیزامی بووە لە مەهاباد هاتۆتە دەرو تێ‌تەقاندووە بۆ سەردەشت‌و لەویشەوە بۆ بێوران‌و لەویش گیر نەبوون بۆ بنوخلێف.

ئێمە رێگای بن‌وخلێف شارەزا نەبووین. پێمان وابوو ئەویش وەک بێوران لەسەر جادەیە. بە رقەی رێگادا دەمانکوتا. شەوە، نە چرایەک نە ئاوەدانیەک. لەپر گەیشتینە سەر سنور. ئەودەم زانیمان ئەوە جادەی ئەرتەشی زەمانی شا بووە بۆ بەردەپانی سنوری عیراق. حکومەتی ئێران وەختی خۆی لەوێوە قەلادزەو پژدەری تۆپباران کردووە. راوەستاین کەمێک دوورتر دیتمان لە پێش ئێمە چەند ماشێن وەستاون. دابەزیم لێ‌یان چوومە پێش. دەبینم ئەوە حەسەنی بلوریان‌و یوسفی ریزوانی‌و یەک دوو کەسی‌تر خێزان‌و کچەکانی غەنی بلوریان‌و ژن‌و منداڵی یوسفی ریزوانی‌و یەک دوو ماڵی دیکە بۆ عیراق دەبەن. ئێتر ئاگرم گرت. زۆر بە توندی بەسەریاندا هاتم گوتم: کێ گوتوویە ژن‌و منداڵ بۆ عیراق بەرن. ئەگەر کادرو بەرپرسی حیزبی ژن‌و منداڵ راگوێزێ، ئەدی خەڵکی‌تر چ بکا؟ خەڵک چمان پێ دەلێ؟ دەبێ ئێستا بگەرێنەوە.

ئێمە گەراینەوە بە لارێیەکدا کە ماشێن بە حال دەردەچوو. لە دوور روناکاییەک پەیدا بوو. کە چووین تاقە مالێک لەو کێوە چرای دایسا. لێمان وەدەر کەوتن، رێگای بن‌و خلێف‌مان پرسی. کابرا گوتی: «رێگای

ماشێن نیە. بەم شەوە ڕێگای پیادەش دیار نابێ، باشترە ئەمشەو لێرە بن. بەیانی بەکتان ماشینەکە بەرێتەوە، ئەوانی دیکەش بە پێیان بچنە خواریێ دەگەنە بن‌ورخلێف.

شەو لەو مالە ئاوەدان‌و بەرێزە ماینەوە. وای ئەم خەڵکە زەحمەتکێشە چەندە فیداکارو دڵسۆزو بە ئەمەگە. لەبەرانبەردا بەشێ هەرە زۆری ڕێبەرە سیاسیەکانیش لە ناست ئەم خەڵکە چەندە بێ‌وەفاو قەدر نەزان‌و لووت بەرزن. بەیانی زوو نان‌و چایەکمان خوارد. کەریم بیژەن ماشینەکەی بردەوە بۆ بێوران. من‌و مەلا قادری لاچینیش بە لاریدا داپەرینە خواریێ‌و لەپر لە دۆڵێکی قوڵدا بن‌ورخلێف وەدەر کەوت. چووینە خوار، هەر لە پێشەوە چایخانەیەکی گەورەوو دەورویەری مزگەوت هەر زمەی دەهات. پر بوو لە هەلاتووی لای مەهاباد. نازانم ئەو هەموو خەڵکە چۆن گەیشتبوونە ئەم کەژو کێوە. چەند کەس لە ئەندامانی کومیتەی شارستان لە چایخانەکە بوون. کە چاویان بەمن کەوت هاتنە پێش. گوتم: «ئێرە کۆنە دێیە؟ بریاروا نەبوو لە کۆنە دێ کۆبینەوە؟» خەریک بوون دەست بکەن بە هێنانەوەی شێرو رێوی. گوتم: لێرە باسی هیچتان لەگەڵ ناکەم، لە کۆنە دێ قسەی لەسەر دەکەین. ئیتر لەسەریان رانەوەستام، چوومە لای برادەرانی دەفتەری سیاسی لەگەورە ماڵێکی گوندی. کە چووم مامە غەنی‌و کاک حەمەدەمین‌و کاک ئەمیری قازی لەوێ بوون. دوکتور چوو بووە مزگەوت هاتەوە. هێشتا قاوڵتیان نەخواردبوو. نانمان خواردو دەورەمان چۆڵ بوو دەستمان کرد بە قسان. گوتم: «بە خۆرایی گەیشتوونە ئێرە. لە دەورو بەری مەهاباد جێگای قایم هەبوو، دەکرا بمێننەوە. ئەو هێزەی هاتۆتە شار ئەوە نیە کە مەیدانی بۆ چۆڵ بکرێ. بێجگە لەوە ئەو هەموو عالەمە بۆ لێرە کۆبۆتەوە. هەرچی هات ڕوودەکاتە ئێرە، ئێوە دەبێ دەورەتان چۆڵ بێ. ئەو هەلاتوو بەرەلایانە وەدەر بنێن با بڕۆنەوە بۆ جێگای خۆیان. ئەو کەسانە لە دەورەتان بن کە پێویستە هەبن.

دوکتور وەزعی شاری پرسی. ئەوەندەی دەمزانی بۆم باسکردن‌و گوتم: پێویستە نەخشەی بەرەوەکانی بکێشرێ. بۆم دەرکەوت هێشتا نەهاتبوونەوە سەرخۆو جارێ هیچ نەخشەیان نەبوو. ئەوەندە نەبێ. بریاریان‌دا من بگەڕێمەوە بۆ دەوروبەری مەهابادو هەموو رۆژێ برادەران لە وەزعی شارو ناوچە ئاگادار بکەم.

پاشان بە مامە غەنیم گوت: بۆچی خێزان‌و منداڵەکانت بۆ عیراق دەنێری؟ ئەوەکارێکی زۆر ناحەزە. خەڵک چمان پێ دەڵێ؟ گوتی: ئاگام لێ نیە. حەسەن وای کردوە. لەکاتێکا کاک حەمەدەمین دەیگوت مامە غەنی خۆی ناردونی‌و نامەشی لەگەڵ نوسیون کە ئاگاداریان بکرێ.

ئیتر من رانەوەستام‌و گەڕامەوە. لەسەر بستوێ بن‌و خلێف هێندێ ماشین راگیرابوون. نەمزانی سویچم لە کێ وەرگرت یا کێ هات بمگەیێنێتە بێوران، بەلام کەوتینە رێ زۆر نەرۆیشتین ماشین پەنچەر بوو هیچمان بۆ نەکرا، بەجێمان هێشت بە پێ‌یان‌و بە لارێدا کەوتینە رێ. رەحمانی حاجی ئەحمەدیش لەگەڵ من دەهاتەوە. بەلام نەمزانی ئەو بەرپرسەی تەشکیلاتی نەغەدە بۆ گەیوەتە بن‌و خلێف‌و ئێستا دەچێتە کوێ‌و بۆچی دەوروبەری رێبەرایەتی چۆل دەکا؟ لە بێوران لێم بزر بوو، پاش ماوەیەک لە ئاشی پشکاوێ دیتمەوە.

ئێمە دەهاتین‌و فانتۆمەکان بەسەرماندا دەسورانەوە دوورتر لە ئێمە یەک دوو راکێتیان لە کۆنە پۆستێکی ژاندارمەری داو ئاگرو دووکەڵ بەرز بۆوەو بەسەر ئێمەدا دەگەڕانەوە. لە پەنا دارێک راوەستاین. مەلا قادری لاچینی خۆی دەبن پنچکە گەڵێو گوێنێ رادەکرد. بۆم دەرکەوت ئادەمیزاد ئەگەر ترسا لە کەروێشکیش چووکتر دەبێتەوە. دەنگم دا گوتم: لەو نێودارانەدا کێ ئێمە دەبینێ، تۆ بۆچی‌واخۆت دەبن ئەو درەوانە رادەکەی؟

هاتین تووشی بیستانێک‌و خەرمانێکی بوورین لاماندا. دیسان میوانی زەحمەتکێشی بەشەرەفی کورد. گورج چای سازکرد تەماتەو خەیاری

هێنا، ماستاوێکی خەستو ساردی دروست کرد. نانی وا بەتامو چێژ هەر لە لای ئەم زەحمەتکێشانە دەست دەکەوێ. برای جوتیار دەستی‌کرد بە پرسیارانو منیش وەڵامم دەداوە. ئاخرەکەی گوتی: «خودا بۆخۆی دەزانێ کەیفی خۆیەتی».

گوتم: «شێتێک بە نێو شاردا منداڵی کەوتبوونە دوو. بەردیان پێدا دەدا، سەگیان تێ‌بەردابوو ئەویش رایدەکرد. کابرایەک تووشی بوو. لێی پرسی تۆخودای دەناسی؟ شێتە گوتی: «بۆنایناسم ئەوەی منداڵی وەدوا خستووم، سەگی تێ‌بەرداوم، ئەو پەندەی بەسەر هێناوم، خودا خۆیەتی». ئێستا ئەو خودایەی تۆ دەڵێی خۆی دەزانێو کەیفی خۆیەتی هەر ئەو تووشی ئەم رۆژەی کردووین». زۆر پێکەنیو بەخۆشی ماڵئاوایمان لێ‌کرد. هاتینە قاوەخانەی بێوران. کەریم بێژەن لەوێ چاوەروان بوو. سواربووین هاتینەوە سەردەشت. شەو چووینە ماڵی میرزا کەریمی زاوای وسێن مەراغەیی. دەست بەجێ جلەکانیان بۆ شوشتمو چوومە حەمامو هاتمەوە سەر خۆ. بەیانی رۆژی ٧٩/٩/٧ لەسەردەشتەوە گەرامەوە بۆ گوێچکەدەرێ. کە چووم مەلا سمایلو سەید حەسەنی هاشمیو کاک نوەمرو سەرگورد عەباسیو مەلا محەمەدی جوانرۆیی‌و کەریم خالدارو هێندێ سەرپەلو پێشمەرگە لەوێ کۆ ببوونەوە.

پێش من جەلالی حاجی حوسێنو کادرێکی حیزبی سۆسیالیست بە ناوی ملازم کەمال کە یەک دوو ساڵ پێشتر لە مەهاباد بوو لەگەڵ برادەرێکی دیکەیان بە ناوی شوان هاتبوونە گوێچکەدەرێ. پێش ئەوەی باسەکەمان لەسەر باروودۆخی رۆژ دەست پێ‌بکەین، داوامان لە برادەرانی کوردی عێراقی کرد کە ئیجازە بدەن ئێمە کۆبوونەوەی خۆمان دەست پێ‌بکەین. ئەوان چوونە دەرو، ئێمە دەستمان کرد بە هەڵسەنگاندنی وەزعو دۆزینەوەی رێگای تێکۆشان. پاش هێندێ وتوویژ روویان دەمن کرد کە رای خۆم دەربڕم. گوتم: لەباری تەشکیلاتیەوە ناتوانم لێرەدا باسی هیچ

بکەم. ئەوەی پێویستە لەسەری ساغ بینەوە بەشی نیزامیو پێشمەرگەو پاراستنی چەکو چۆلەو کەلو پەلی عەسکەرییە. هەر وەک لەگەڵ برادەرانی دەفتەری سیاسی باسکراوە، کاک سەرگورد عەباسی لەگەڵ هێزی خۆی پێویستە لە کێتکە بمێنێتەوە. مەلاسمایل حاجی لەگەڵ چەند پێشمەرگەیەک بە (داغەدا) بپەڕێتەوە بچێتە سێلەکەو ماسوداوای. مەلا رەسول دەگەڵ کاک سەید حەسەن بچنە کاولانو کورانو لەم ناوەبە بن. مەلا محەمەد تا ئێرە سووک دەکا هەر لێرە بێو پاشان بپەڕێتەوە بۆلای دەفتەری سیاسی، منیش دەچمەوە دەوری مەهاباد، جێگای خۆمتان پێڕادەگەیەنم .کە لە کوێ دەمێنمەوە. بە گشتی ئەم بڕیارە پەسند کرا. پاشان لە سەرگورد عەباسیم پرسی: «جەلالی حاجی حوسێنو ملازم کەمالو شوان لێرە چ دەکەنو بۆ هاتوونە ئێرە؟» سەرگورد گوتی: «ئارپیجی‌یەکو پێنج تفەنگم داونێ دەچنەوە بۆلای شار، ئەوانەی جاشو پیاوخراپن تەمبێیان دەکەن».

گوتم: کاک سەرگورد کارێکی باشت نەکردوە: دەبوایە راوەستی تا من دێمەوە. پاشان بۆچی برادەری کوردی عێراقی بچێ لە مەهاباد جاش تەمبێ بکا؟ ئێمە بۆچی هەر لە ئێستاوە رشەی جاش دەخەینە سەر زارو زمانان! بێجگە لەوە ئەگەر جاشو پیاو خراپ لە مەهاباد هەبێ، بۆچی خۆمان تەمبێی ناکەین؟. برادەران تێکرا پشتی قسەکانی منیان گرت. گوتم: کاک جەلالو ملازم کەمال بانگ کەن بێنە ئێرە. کە هاتنە ژوور پرسیم: «کاک جەلال ئێوە چ دەکەنو پێشمەرگەکانتان لە کوێن؟

گوتی: «ئێمە هێندێ لە پێشمەرگەکان لەگەڵ سەید سەلیم دەنێرینەوە بۆلای سەرکردایەتی. لەگەڵ کاک سەرگورد قسەمان کردوە، منو ملازم کەمالو شوان لەگەڵ یەک دوو پێشمەرگەی بەکار دەچینەوە لای مەهاباد. خەڵک دەناسین دەزانین کێ جاشەو لەگەڵ حکومەت هارکاری دەکا. شەو لێی وەژوور دەکەوین یا دەیکوژین یا پارەی لێی دەستێنین.

لەمەودوا پێشمەرگە پێویستی بە پارە دەبێ».

گوتم: «کاک جەلال بەکەم، لێرە وەک بەرپرسی حیزبی من بریار دەدەم. دووەم ئێمە لە مەهاباد جاشمان نیە. هەر لە ئێستاوە ناوی جاش بەسەر خەڵکدا نابڕین. کەسیش ناکوژین، پارەش لەکەس ناستێنین. بێجگە لەوە ئێمە خۆمان خەڵک باشتر دەناسین، دەزانین کێ دەبێ تەمبێ بکرێ. خۆت دەزانی ئێستا بۆ ئێمە چەک لە پارە پێویستترە. تکایە ئەو چەکانەی وەرت گرتوون بیاندەنەوە. لەجیاتی ئەوەی بچنە مەهاباد بچنە رێگای نێوان بانەو سەردەشت کە بیستوومانە ئەرتەش خەریکە بەرەو سەردەشت بێ. یارمەتی بە ئێمە ئەو کارەیە».

جەلال گوتی: «ئێمە دەبێ بگەڕێینەوە بۆلای سەرکردایەتی». چەکەکانغان وەرگرتەوە، بەلام تفەنگێکیان هەر برد. نامەیەکم بۆ دوکتور قاسملو نووسی کە بە برادەرانی کوردستانی عیراق رابگەیێنێ: زۆر سوپاسیان دەکەین لەمەو دوا با یارمەتیمان بۆ نەنێرن.

ئەوان رۆیشتن، خەریک بووین پەلێک پێشمەرگە لەگەڵ کەریم خالدار بنێرین بۆ رێگای نێوان بانەو سەردەشت. خەبەریان هێنا کە ئەرتەش گەیشتە نێو سەردەشتو پردی رەبەتیش گیراوە. ئەمجار دەبوایە گورج‌تر ئەو پێگەیە سووک بکرێ.

لەشەری کۆسەکەریزێ نەقی ئەحمەدی برای حاجی بایزی گیرابوو. حاجی بایز هاتبوو تکای دەکرد کەوا بکەین براکەی لەگەڵ چەند پاسدار بگۆڕینەوە. نامەیەکم بۆ ئاغای فازیلی جێگری فەرمانداری مەهابادو نامەیەکیش بۆ مامۆستا مەلا رەشیدی قەرنی‌زادە کە لەگەڵ دەولەت یەک بوو نووسی‌و داوام لێکردن کە بکەونە وتووێژ بۆ گۆڕینەوەی چەند پاسدار لەگەڵ نەقی ئەحمەدی برای حاجی بایزی.

دوو کیژی مەهابادی مامۆستای قوتابخانە رایان کردبوو. بانگم کردن رازیم کردن بگەڕێنەوە نێو شارو لەشاردا کاربکەن. هەر یەکەی ناوێکی

«ساختە»م بۆ دانانو نارنکی ساختەی خۆشم بۆ نووسین کە پێوەندیان پێوە بکرمو بڵێم چ بکەن. وەک هەوەڵین ئەرک پێم ئەسپاردن کە هەوڵ بدەن تایپێکی نووسینو هێندی کاغەز لە ئیدارەی فەرهەنگ یا مەدرەسەکان بێننە دەرێ بۆ کۆنە دێ. گوتم: بەیانی بچنە گیتکە سواری ماشینی سەردەشت بنو بچنەوە نێوشار. وسێن مەراغەیشم لەگەڵ هێندێ نیشانو رەمزی پێوەندی بەرێ کردەوە بۆ مەهاباد.

نیوەشەو تێپەری‌بوو برادەران خەریک بوون بڵاوەیان دەکردو هەرکەس بۆ شوێنی خۆی دەچوو.من هەستام گوتم: کێ لەگەڵ من دێ یا ئامادە بێ برۆین. کەس نەبوو دەست هەڵێنێ. کورێکی تازە پێگەیشتووی مەنگور بەناوی محەمەد کە لە شەری کۆسە کەرێزی پیاوانە خۆی دەرباز کردبوو، گوتی: من لەگەڵ خۆت بەرە، بەلام تفەنگم نیە. کورێکی ژیرو چالاکو روح سووک. تفەنگێکو چەند دەراخ فیشەکم بۆ لە مەلا محەمەدی جوانرۆ وەرگرتو دامێ. دیتم کاک ئومەر دیار نیە. بە کەریم بێژەنم گوت: کاک ئومەر چی لێهات؟ گوتی: «ها لەوی لەسەر بەردێک دانیشتووە».

- بچۆ پێی بڵێ بێ با برۆین.

چوو هاتەوە گوتی: «کاک ئومەر دەڵێ من نایەم. ئێستا کەس نایەتەوە بۆلای مەهاباد، تۆ بەتەنیا دەچیەوە چ دەکەی؟»

- بەتەنیا نیم، ئەوە نیە تۆم لەگەڵیو محەمەدیشو کاک ئومەریش گاڵتە دەکا هەر دێت. ئێمە نابێ شار بەجێ بێلین. ئابرو چوونە. چوومە کن کاک ئومەرو گوتم: «ئەوە بۆ دانیشتووی؟ شەو درەنگە دەبێ برۆین».

- بۆ کوێ؟ خۆت شێت کردوە ئەوە هەموو کەس بۆ عیراقو بۆلای سەردەشتێ خۆ دەکوتێ، تۆ دەچیەوە لای شار چ دەکەی؟

- هەستە با برۆین، ئەوانەی بۆ عیراقو سەردەشت خۆ دەکوتن با برۆنو نەیەنەوە. ئێمە دەچینەوە لای شار، پێوەندی دەگرین. ماتو بێدەنگی

دەشکێنین، خەبات هەر وایە هەورازو نشێوی هەیە.
- هیچت لەگەڵ ناکرێ، با بڕۆین بزانین چ دەکەین.
کاک ئومەر هەستاو سواری جیبە شڕەی بەرتەشی بووین و لە کیتکە تێپەڕین، ماشین ڕاوەستا تاریکە شەو هەرچی کردمان هەڵ نەبوو. کاک ئومەر گوتی: «هێندێ خزمی ئاغامان لێرە هەن، با بچین بزانین یارمەتیمان دەدەن؟ یان چونکە ئاغان یارمەتی ئەوانت ناوێ؟!». چووینە نێو گوندی ماڵە ئاغامان دیتەوە. لێمان وەدەر کەوتن فەرموون و بەخێرهاتنێکی پیاوانە. گوتمان نایەینە ژوور، ماشێنمان یەکی کەوتووە دەمانەوێ بە ماشینی خۆتان بانگەیننە (خەڵدەلیل و پیر میکایل). کورێکیان وەک پیاوان گورج ماشینی هەڵکردو سوار بووین. سیسەد فیشەکی تاپرم لە مەلا محەممەدی وەرگرتبوو بۆ حاجی عەولای قازی ئەویشمان لەبیر چوو. لە تێزیک پیرمیکایل، ئیتر ماشین دەرنەدەچوو هەموو بەردەلان و کوێرە ڕێ. ناچار ئێمە دابەزین و بە پێیان کەوتینە ڕێ و ماشینەکە گەڕایەوە. تازە بەیانی بەرەدا گەیشتینە نێو گوندێ. کاک ئومەر گوتی: «دەچاکە.. ئەوە چوویەوە مەهاباد، ئێستابەو بەیانە کەس لەخەو ڕانەبوە دەچیە کوێ؟!».
- ڕاست دەچمە ماڵی مەلا. کەسیش ڕانەبووبێ، ئەو لەبەر نوێژی هەر هەستاوە. چووینە ماڵی مامۆستا تازە لە خەو هەستابوو. بەخێرهاتنی کردین بەڵام دیار بوو ناچاری بوو. چووینە ژوور. ئەگەر چووین چوار برادەری چەکداری کۆمەڵە ڕایان کردبوو لە ماڵی مەلا لێی نووستبوون. لەو ماوەیەدا کە وەزعی شار ئالۆز بوو لە فەرمانداری کۆبوونەوە هەبوو، باسی بەرگری و بەربەرەکانی دەکرا، چاوم بە یەک ئەندامی چەکداری کۆمەڵە نەکەتبوو. ئێستا ئەوە لە ماڵی مامۆستا چوار برادەری کۆمەڵەم دەدیتن.
مامۆستا زۆری بەخێرهاتن کردین. نان و چایان سازکرد، لەسەر نان

خواردن بووین سەیدێکی ریش سپی قسەخۆش ماشەلا نێوچاوان نورانیو ژیرو قسەزان وەژوور کەوت. پاشان زانیمان ئەوە سەید حەمەدەمینەو لە نێو خەڵکو لەناوچەدا بە (سەید تەشقەلە) ناسراوە.

سەیدو مەلا کاک ئومەریان ناسی. لە رادەبەدەر بەخێرهاتنو ئیحتیرام تازەکرایەوە. زۆریان گوێ نەدا من. پاشان پرسیاری منیان کرد. گوتم: منیش وا لە خزمەت کاک ئومەری‌دام. تۆزێ مات بوون. گوتیان کورە دەنگی تۆمان لە رادیۆ بیستوە. سەید گوتی: کورە دەڵێی چی؟ دوێنێ شریتی دەنگی تۆیان بۆ هێناوم کە لە فەرمانداری قسەت کردوە. کورە تۆ کەرێی حیسابی نەبێ؟» کاک ئومەر گوتی: «ئەدی ئەو نەبێ کێ بەو بەیانەی وەسەر مالآن دەگەرێو خەو لە خەڵک حەرام دەکا!!!»

ئەو جار مامۆستا: «کورە بە ئاوات بووم رۆژێک چاوم پێت بکەوێ یاخوا بەخێرهاتی. برایانی کۆمەلە نانو چایان خواردو رۆیشتن.ئێمەش چووین لە ژوورێکی خاوێن لێی نووستین.

کە هەستاین لای نیوەرۆ بوو. ماڵی مامۆستا رەبی بەخانەی خودای بێ، نانو چێشتێکی گەلێک بەتامو چێژیان ساز کردبوو. نانو چامان خواردو قسەو باسی خۆشمان دامەزراند. لەپر کورە لاوێکی رەنگ پیاوانەو گورجو گۆل وەژوور کەوت. پاش بەخێرهاتنو دانیشتن گوتی: «من کوری سەید حەمەدەمینم، بابم ناردوومی دەیگوت دەبێ تەشریفیان بێنە ئێرە». هەستم کرد مامۆستا ئەو خەبەرەی گەلێک لە ئێمە پێخۆشتر بوو. هەستاین چووینە گوندی( عەینەمەلا) ماڵی سەید حەمەدەمینی.

عەینە مەلا ماڵی سەید حەمەدەمینو دوو ماڵی‌تری لێ بوون. گوندێکی لارێو چەپەک. لەبن چیایەکی رژدو بەردەلانو جێ حاشارگە. هەر لەنێو بەردەکانی پشت گوندی سەدان کەس دەتوانن خۆ بشارنەوەو کەس نەیاندۆزێتەوە. دەیانگوت: لە رژێمی شادا مەکۆی قاچاخچیان بووەو هەر لەوێ خۆیان شاردۆتەوە. ئەندامانی کومیتەی ناوەندی ئێمە دەکرا ساڵێک

لەو گوندە خۆ وەشیرن‌و تەگەنە بن‌رخلیف‌و ئاشی‌پشکاوی. کەچوون، چ مالْ؟ مالْیکی ئاوەدان، دیوەخانی فەرش‌کراو، سەماوەر هەر هازەی دەهات‌و پر لە دەستەنوێن. ئەوەندەی خوا حەز بکا سەید حەمەدەمین روو خۆش‌و قسە خۆش‌و دلْ ئاوالْەو میوانگر. مالْو منداڵی بە تیکرایی کانگای رێزو موحیبەت‌و رووخۆشی بوون. شەو لەوێ باش حەساینەوە. بەیانی زوو بە کەریم پێژەنم گوت: «پێویستە بچیە کۆتەدێ. لەوێ لەگەلْ گاروانی ماست‌و دۆفرۆشان بچیەوە نێو شار. ئادرەس‌و رەمزی پێوەندی کچەکانم دایەو نامەم بۆ یەکیان نووسی، دابوواپە تایپێک‌و کاغەزی رۆنیۆ پەیدا بکەن‌و بیگەیننە دەرێ. زۆرم بیر خەستەوە کە نابێ بە بوون‌و نەبوون پتر لە دوو رۆژی پێ بچێ. کەریم وەک تێکۆشەرێکی ئازا گیر نەبوو کەوتە رێ. ئێمە ماینەوە کوریکی سەید حەمەدەمینم نارد بۆ قزلجەی خواری مالْی کاک وسینی حەمە شیخەی. پێش دەرکەوتنم لەشار کیفێکی دەستیم پر کردبوو لە نووسراوەو سەنەدو بەلْگەی حیزبی دابووم بە کاک وسین بیانیا بۆ قزلجەو لە بەر دەستنەبن. چوو کیفەکەی هیناوە، بەلاَم کاک وسینیش بۆ دلْنیایی کورێکی خۆی لەگەلْ ناردبوو. مالە سەید حەمەدەمینی ئیتر بوو بە دەفتەری تەشکیلات. دوو رۆژی پێ‌نەچوو کەریم پێژەن گەرایەوە. تایپ‌و کاغەزی هێنابوو. دەستمان کرد بە نووسینی بەیاننامەو لەسەر کاغەزی رۆنیۆ تایپمان کرد. کەریم بردیەوە بۆشار کە رۆنیۆ بکرێ‌و بە جوانی بە یەک شەو لە هەموو گەرەک‌و کۆلان‌و شەقامی شاردا بلاَو بکرێتەوە. ئەگەر کومیتەی ناوەندی ١٩٧٩/٩/١ بە بۆنەی پەلامارو جینایەتەکانی کۆماری ئیسلامی بەیاننامەی لە چیا بلاَو کردبۆوە، تەشکیلاتی شار هەروەلْێن بەیاننامەی حیزبی ٩/١١ لە سەرانسەری شاردا بلاَو کردەوە. لەبەیاننامەکەدا داوا لە خەلْک کرابوو: دژی دوژمنی داگیرکەر پێویستە هەموو چەشنە خەباتێک بەکار بێنین. نابێ بێلْین داگیرکەر لە مەهاباد بحەسێتەوەو خەو لەچاوی بکەوێ.

قوتابیانی شار کورو کیژی لاو لە بڵاوکردنەوەی بەیاننامەکەدا دەوری گرنگیان یاری کرد. دوو کیژ کە بەداخەوە ناکرێ ئێستا ناویان بێنم نەکا ئەم بەرگە بڵاو بێتەوەو رژێمی دژی ئیسلامی لە ئێران هەر بمێنێ، لە پێوەندیو هاتوچۆو هێنانی خەبەرو بردنی نامە بۆشار دەوری قارەمانانەیان هەبوو. هیوادارم بارو دۆخێکی ئاوا بخولقێ کە بە خەڵکیان بناسێنمو لەخەڵک پاداش وەرگرن، نەک لە حیزبی دیموکرات. چونکە بۆ حیزبی دیموکرات فیداکاریو خزمەت بە گەڵو نیشتمان ئەوەندە جێگای بایەخ پێدان نەبوو، ماستاو کردنو ریاییو مەرایىو دوو زمانی برەوی پتر بووە.

من کەریم پێژەنم راسپارد لە کۆنە دێ ئادرەسو جێگای من بە حاجی بڵێیو ئەو کەسانەی بڕوایان پێ دەکا پێیان رابگەیێنێ.

دوو رۆژ پێ نەچوو هەر وەک بۆنیان کردبێ دەورەم پڕ بوو. مەلا رەسول بە ماشێنێک چەکدارەوە پەیدا بوو، بە دوای ئەودا مەلا محەمەدی جوانرۆ بە ماشێنێک پێشمەرگەوە پەیدا بوو، ئیتر ماڵە سەید حەمەدەمینی بوو بە بنکەی پێشمەرگەو دەفتەری حیزب. ئەو پێشمەرگانەی بڵاو ببوون، نازانم چۆن زانیبوویان کە من لەو کوێرە دێیەو لەو بن شاخەم روویان دەکردە ئەوێو میوان بوون. گورج بەرێم دەکردن بۆلای سەرگورد یا مەلا رەسول یان مەلا محەمەدی جوانرۆیی. پاش بڵاو بوونەوەی بەیاننامەی تەشکیلاتی مەهاباد، بزوتنەوەیەکی هەراوی دژی حکومەت لە نێو شار دەست پێکرا. وەک... جنێو بە پاسداران، شت پێ نەفرۆشتن، نووسینی دروشم لە دیوارانو...هتد. ناکرێ وەبیری نەخەمەوە دوو کەس لە کیژەکانی ناوشار نامەیان نووسیبوو داوایان کردبوو کە سندوقێک نارنجۆکی دەستیان بۆ بنێرم. لە هەڵو مەرجێکی ئاوادا پێویست بوو لەشار نیزیکتر بمەوە. ماوەیەکیش ماڵە سەید حەمەدەمینیش بەجێ بێڵم با لە دەست میوانان پشویەک بدەنو تێدا نەچن.

تراکتۆری سەید حەمەدەمینمان سازکردو لەگەڵ کاک ئومەرو محەمەدی پێشمەرگەو کەریم پێژەن چووینە وزیندەرێ. هێندێ پێشمەرگەمان گلداوەو لەسەر زینۆیی وزیندەرێ دامانئان کە کیشک بکێشن. کەریم بێژەنم بە یەکجاری ناردەوە نێو شار. رۆژانە لەگەڵ کاک ئومەر دەچووینە دەرەوەی گوندی لە نێو شیناوەردو بێستانی حاجیدا دەمانبردە سەر. رۆژێک مەلا محەمەدی جوانرۆیی هاتبوە لامو لە دەرەوەی گوندی دانیشتبووین، پێشمەرگەکان جیبێکی دەولەتیان بە چوارکەسەوە هێنا. مەعموری ئیدارەی ئیسلاحاتی عەرزی بوون لە ورمێ.

لێم پرسین ئێوە چۆن هاتوونە ئێرەو لە چی دەگەرێن؟

- بە ئێمەیان گوتوە ضدانقلاب نەماوە، ولات نارامە، بچن سەری ئەو دێهاتە بدەن. زۆر دەترسان. گوتم: «ماشینەکەتان لێ ناستێنم. بچنەوە بە ئوستاندار بڵێن کە کوردستان هەمووی چەکدارەو ئیتر روو دەو لایە نەکەنەوە. ئەوان گەرانەوە، پێشمەرگەکان گلەییان کرد کە نەدەبا ماشێنەکەت وێدابانەوە. گوتم: راپەرینی ئێمە بۆ ماشین ئەستاندنو تالان نیە. ئێمە لە بەرانبەر ئەرتەشو پاسداردا بەربەرەکانی دەکەین. دەبێ لەگەڵ خەڵک باش بینو بە خەڵک نیشان بدەین کە چەکمان بۆ خەباتی سیاسیو بۆ وەدەست هێنانی مافی نەتەوایەتی هەڵگرتووە. نەک بۆ ماشین ئەستانو رووت کردنی خەڵک. بەداخەوە بە هەڵە چووبووم. یەکەم ماشینی دەوڵەتی بوو. جەق واهوو نەیاندەمەوە. بەتایبەت ئەو دەم ئێمە ماشینمان نەبوو. دووەم ماشێن دزینو راوو رووت پاشان بوو بە کارو کاسبی هێندێ لاتو سەر سەری لە کوردستانو بە داخەوە پێشمەرگەو هێندێ لە مەسئولەکانیش تەکرا خۆی لێ دوور خەنەوە. لەسەر ماشێن دزین چەند نامەم بۆ دەفتەری سیاسی نووسیوە.

دوو رۆژ لە وزیندەری بووین، ئێوارەیەک غەفووری خوارزای سەید عەولای ئیسحاقی پەیدا بوو. غەفوور لە بنکەی ئەمیرئابادی سەر رێ

میاندواو، مەسئولی پێشمەرگ بوو. لێم پرسی لیرە چ دەکەی، پێشمەرگەکان لە کوێن، چەکەکان چییان لێهات؟ لە وەلامدا گوتی: «نەمانتوانی لە بەرانبەر تانگەکانی حکومەت خۆراگرین. ڕۆیشتین‌و بڵاو بووین‌و هەر کەس ڕووی دەماڵی خۆی کردۆتەوە. منیش لەگەڵ براکەم هاتووینە ئێرە. چوار تفەنگیشمان پێن. حەز دەکەم لێمان وەرگریەوە». ناردم تفەنگەکانمان وەرگرتەوە. پاشان چووینە کۆتە دێ بنکەی سەرەکی ماوەی شەری سێ‌مانگە.

دوای چوونەوەی کەریم بێژەن کاک کەماڵی دەباغی ڕەوانی شاد بێ کە ئەندامی کومیتەی شارستان بوو پەیدا بۆوە. ئیتر گیر نەبوو چۆوە نێوشارو بریارمان‌دا هەموو رۆژی دووجار خەبەری نێوشارم بۆ بنێری.

پاش دوو رۆژ لە شارەوە کاک کەماڵ خەبەری‌دا کە هەڤاڵدەری رۆژنامەیەکی ئینگلیسی هاتوە لە مەسئولێکی حیزبی دیموکرات دەگەرێ». گوتم بیهێنن بۆ ئێرە بەلام کەسێکی دەگەڵ بنێرن کە ئینگلیسی باش بزانێ. هەر ئەو رۆژە کابرایان هێناو کاک سمایلی قازی مامۆستای زمانی ئینگلیسی لەگەڵ هاتبوو. کابرا زۆر بە درێژی لەسەر وەزعی کوردستان‌و چۆنیەتی پێشمەرگەو چەک‌و نازوخەو بەربەرەکانی‌و ناکۆکی دەگەڵ دەولەت پرسیاریکرد. بە گوێرەی پێویست وەلامم دایەوە. رەسمێکی زۆری هەڵگرت‌و ناردمانەوە بۆ مەهاباد. خەبەری هاتنی رۆژنامە نووس‌و پرسیارو وەلامەکانم نارد بۆ دەفتەری سیاسی. بەداخەوە دەقی نووسراوەکان بە دەستەوە نین تا لێرە بلاو بکرێنەوە.

ئێوارەیەک شوانێکی خەڵکی سەید ئاوا پەیدا بوو. گوتی تیربارێکم لە سەر چیای پشتی کەلکی بەگزادان دۆزیوەتەو سیسەد فیشەکیشی لەگەلە. ١٥٠ تمەنم مزگێنی دابە چوو هێنایەوە. هەر ئەو تیربارە بوو کە درابوو بە سەید سەلیم‌و جەلالی حاجی حوسێن بۆ بەرگری لە جەبهەی میاندواو لێ‌یان بەجێ مابوو.

## سەفەر بۆ ئاشی پشکاوێ.

دوای بڵاو بوونەوەی بەیاننامەی تەشکیلاتی مەهاباد ڕەوەی خەڵک بەرز بیزوە. بەئاشکرا لە نێوشار لەگەڵ ئەرتەش‌و پاسدار دوژمنایەتی نیشان دەدرا. ڕۆژێک لای چێشتەتەنگاو مەلا محەمەدی جوانرۆیی پەیدا بوو. ئەو هێشتا لە بنکەی گویجکەدەرێ نەبزوتبوو. نامەیەکی دوکتور قاسملوی هێنابوو، دوکتور نووسیبوی: «ئەگەر بۆ دوو ڕۆژیش بێ، پێویستە سەرێکمان لێ بدەی». دوای نیوەرۆ لەگەڵ کاک ئومەرو مەلا محەمەد کەوتینە ڕێ. لە وزینەدەری خەبەرمان زانی کە پاسدار ویستوویانە بچن بۆ سەردەشت لە گوندی کێتکە بۆتە شەڕو پێشمەرگە لێیان داون. ئێمە ڕێگامان بە گوندی کێتکە دابوو، نەماندەزانی داخوا کێتکە گیراوە یا پێشمەرگەی تێدایە. لە نێزیک گوندی لە ئەدیو ڕاوەستاین. مەلا محەمەد گوتی: «ئێوە لێرە بن، من لەگەڵ چەند پێشمەرگە دەچم، ئەگەر فیشەکی نوورانیم هەڵدا ئێوەش وەرن، ئەگەر بوو بە تەقە ئێوە بگەڕێنەوە. من نەمدەویست مەلا محەمەد خۆی بچێ، بەڵام گوێی نەدامێ. لەوە سرنج ڕاکێشتر خوشکە زینەبە ڕەش بوو. مەلا محەمەد پێشمەرگەیەکی لەگەڵ بوو بە ناوی زینەب، زینەبە ڕەشیان پێدەگوت. نارنجۆک هاوێژێکی هەڵگرتبوو گورج‌و ئازا. هەر چەندی مەلا محەمەد گوتی: «تۆ مەیەو لای ئەوان بمێنەوە، قبولی نەکردو ڕەگەڵ پێشمەرگەکان کەوت. ئێمە ماشینەکانمان لە ئەدیو ڕاگرت. زۆری پێنەچوو فیشەکی نوورانی لە

ئاسمان تەقیەوە، ئیتر ئیمەش سوار بووین‌و چوینە کیتکە. کە چووین ئامبولانسیکی مۆدێرنی درێژ ڕاگیراوە پڕ لە عەجەمی ساخ‌و بریندار. نۆ خوێندکاری پزشکی لە تاران کلیلی بەهەشت لە ئیمام خومەینی وەردەگرن‌و دێن بۆ کوردستان یارمەتی پاسداران بدەن. لە مەهاباد پاسدار پێیان دەڵێن: «ڕێگا ئازادەو ضدانقلاب نەماوە ئێوە بچن بۆ سەردەشت. خوێندکاری ناشارەزا لەگەڵ درو پاسدار ڕێگا دادەگرن بەرەو سەردەشت کە دەگەنە کیتکەر دەبانەوی تێپەڕن، پێشمەرگە رایان دەگرن. داوایان لێ دەکەن بێنە خواری‌و تەسلیم بن. هەرچەندی بە خۆشی پێیان دەڵێن، جواب نادەنەوە، پاسدار دەبانەوی تەقە لە پێشمەرگە بکەن. ئیتر محەمەد زەنگەنەی ڕەحمەتی لەسەر تۆپی ١٠٦ دەبێ تەقە لە ئامبولانس دێنێ. مەکینەی هیچی لێ نەهاتبوو، بەلام بانەکەی هەڵگرتبوو. سێ‌کەسیان کوژرابوون، دوویان زۆر بریندار بوون ئەوانی دیکەش بە نیوەگیان ئەسیر کرابوون. بە محەمەدی ڕەحمەتیم گوت: «کارێکی باشت نەکردوە. تۆپی ١٠٦ دژی تانک بەکار دێ. بەلام ئەو بەکاری هێنابوو کوشتبوونی.

دوایە بە خوێندکارەکانم گوت: ئێوە دەزانن لە کوردستان شەرە. بۆچی هاتونە ئێرەو لە چی دەگەرێن؟ گوتیان: «ئیمام فتوای داوە ئیمە لە ڕێی ئیسلامدا شەهید دەبین. تۆزێکی دیکەم دواندن بەڵکو پەشیمان بنەوەو ئازادیان بکەم. دیتم بەراستی شەری کوردیان پێ خەزایەو وەها دیفاع لە خومەینی دەکەن، قسەیان دەگەڵ نایە. ئیتر هەر بە ئامبولانسی خۆیان بەڕێ‌کران بۆلای سەردەشت. ئیتر نەمزانی چوونە بەهەشت یا گەرانەوە بۆ زیارەتی ئیمام. لە گوێجکەدەرێ کەمێک گیر بووین مەلا محەمەد قافلەی ئامادە کردوو کەوتینە ڕێ. لە کاولان کاک سەید حەسەنی هاشمیمان ڕەگەڵ کەوت. سوراغی مەلا ڕەسولم گرت گوتیان: ژن‌و منداڵەکانی بردووە بۆلای عیراق. سەید ڕەسول و مەلارەسول ژن‌و منداڵان بەرەو عیراق دەبەن لە دزڵەتو هێلیکۆپتەر تەقەیان لێ دەکا سەید رەسوو

کوری مەلا رەسولٚ بریندار دەبن. ئیتر دەیانگەیننە قەلا دزە. مەلا رەسول دەگەرێتەوە بۆلای برادەرانی دەفتەری سیاسیو سەید رەسولیش جاریٚ بۆ موعالیجە دەمێنیتەوە.

ئێمە لە گوێجکەدەریٚ کەوتینە ریٚ. لەشکر پردی رەبەتی گرتبوو، دەبوایە خوارتر بە لارێدا لە چۆمی وەپەرین. چرای ماشینەکان دەبوو بکوژێنەوە. کورەکان شارەزای رێگا بوون لە چۆمی پەرینەوەو بە تەنگی گرژالێو بە میرئاوێدا تێپەرینو بۆ دیوی کونە مشکیو ئالوەتان تیٚ هەڵبووین. لەو رێگایە تریٚ رەشە عەرزی داپۆشیبوو کورەکان تریٚیان دەهێناو چیژەیەکی تایبەتی هەبوو.

گەیشتینە دەشتی مرداویٚ. لەسەر بەستوی بە دیوی دۆلەتویدا ئیتر ماشین دەرنەدەچوو. بە دەیان لۆریو ماشینی ئەرتەشیو لەندرۆرو ماشینی سواری لەم دەشتە پانو بەرینە بیٚخاوەن کەوتبوونەوە. هیلیکۆپتەر رشاندبوونی زۆریان سووتابوونو یان کون کون کرابوون. چەند لۆری سیمو کەلێو پەڵی عەسکەریو ئاردو برینجو ئازوخە لەم دەشتە هەلرژابوو. هەر کەس هاتبوو گەیشتبووە دەشتی مرداویٚ باری هەڵرشتبوو. ماشینی بەجیٚ هێشتبوو، بەرەو دۆلەتوو ئاشی پشکاویو قەلادزە شۆر ببۆوە. هەر ئەودەم لەوە ناهومید بووم کە ئێمە بتوانین جەبهەی شەرو پێشمەرگە رێکو پێک بکەین.

لەدەشتی مرداویٚ بریندارێک بەجیٚ مابوو. بە چواردەستەکی بە زەحمەت لەو لێژو نشێوی دیوی دۆلەتویٚ بردمانە خواریٚو لە بنکەی پێشمەرگەمان دانا. لە دۆلەتوو خەڵکی گوندی خەریک بوون برەوێنو بەرەو قەلادزە برۆن. بنکەیەکی پێشمەرگە لەوی داندرابوو، ژوورێک پر بوو لە پاسدارو هەوالدەرو عەجەمی جوربەجور زیندانی کرابوون. سەید رەسول هێندیٚ چەکی قورسی گەیاندبوە ئەو دۆلە. وەک پێشمەرگەکان گوتیان: «حاجی حاجی برایی ئەندامی سەرکردایەتی حیزبی سوسیالیستی

کوردستانی عیراق بە ئیجازەی کاک ئەمیری قازی هاتبوو هێندێ چەکی هەڵبژاردەبوو بردبووی. ئێمە لای ئێوارە شۆڕ بووینەوە بۆ ئاشی پشکاوێ. بنکەی دەفتەری سیاسی حیزبی سوسیالیستی کوردستانی عیراق لەم دۆڵە هێندێ کاولیان بەبەردان دروست کردبوو، چەند خێوەتیکیشیان هەڵدابوو. ئەودەم دوکتور مەحمود عوسمان لەوێ بوو. سەیر ئەوە بوو برادەرانی ئێمە پتر چووبوونە خواری بۆلای عیراق، برادەرانی سۆسیالیستیش پتر هەڵکشابوون بۆلای ئێران. چووینە خواریو لای دوکتور مەحمود لامانداد. دوکتور گوتی: «مەچنە خوارێ، ناردوومانە دوکتور قاسملوو جەماعەت ئێستا دێن شەو میوانی ئێمەن ماسیمان هەیە».

زۆری پێنەچوو جەماعەت پەیدا بوون. دوکتور قاسملو، کاک ئەمیری قازی، مامۆستا هێمن، مامە غەنی مەلا ڕەسوڵ، کاک حەمەدەمین، فەتاحی کاویان، دوکتور خوسرەوی ڕاکردوەکانی کومیتەی نەغەدەو دەوروبەریان گەیشتنێ. زۆر سەیر بوو کەسانی وا گەیشتبوونە ئەوێ کە نەهیچیان لەسەر بوو نە قەت لە هیچدابوون. تەنانەت ئەندامی حیزبیش نەبوون. بە نێو دارستانو بە قەراخ چۆمیدا هەڵکشاین بۆ بنچادری سەرکردایەتی حیزبی سۆسیالیست. نێوە نێوە هێندێ کاول دروست کرابوون یەک دوو داریان بەسەردا ڕایەڵ کرابوو. کاغەزێکی گەورە بە دیواری کاولەکانەوە هەڵاوەسرابوو، لێی نووسرابوو: «لقی دوو». لەوی دیکە نووسرابوو: «هەرێمی چوار»، لە یەکیان نووسرابوو: «هەرێمی یەک» زۆرم پێ سەیر بوو، سەرم لەوە سووڕما کە ئەم کوردە چۆن بە ڕواڵەتو زاهیرسازیو بیرۆکراسیەوە نووساوە. دەنا لەم دۆڵو چرو دارستانەدا کە بە حاستەم خودای لێ دیارە، ئەم هەریم بازیە قازانجی چیە؟

گەیشتینە خێوەتی سەرکردایەتیو دانیشتین. جێگایەکی خۆش، فێنکو خاوێن میوانداریەکی کوردانە. دەستمان کرد بە قسەی ئیعتیادی.

گوتم: «حەیفە با قسەی خۆش وون نەبێ. دوای تێکچوونی رژێمی پەهلەوی کوردستان لە ژاندارمەو ئەرتەش پاک‌کرابۆوە. بەلاّم هێشتا لە ئازربایجان هەر مابوو. ئیدارەی ژاندارمەریی لە میاندواو خانویەکی گەورەی چەند هۆدەیی گرتبوو. تابلۆیەکی زەلامیان لێ هەلاوەسیبوو، لێی نووسرابوو: «اداره ژاندارمری شمالغرب». لەسەر هۆدەکان نووسرابوو: «ژاندارمەری‌خانە»، «ژاندارمری مهاباد»، «ژاندارمری سردشت»، «ژاندارمری بانه و...». لە دیوی دەفتەر بانگی پێشخزمەتیان دەکرد نامەیەکیان دەدایەو دەیانگوت: «ببر به بانه.. ببر به سردشت و...هتد». کابرا لە دیوی دەفتەر دەهاتە دەرو دەچووە هۆدەکەی پەنای و نامەکەی دەدا بە یەکی‌ترو هیچی دیکە. ئەم نووسینەی ئێوە، ئەم لق و هەرێمە ئاوا هاتە بەرچاو. لەم چیاوردارستانەدا هەرێمی چی‌و لقی چی؟

دوکتور مەحمود دەنگی نەکرد. بەلاّم دوکتور قاسملو گوتی: «دوکتور بزانە کاک کەریم دەلێ چی؟»

گوتم: جا کەوابە پێشنیارێکی دیکەم هەیە. کردیان بە گەمە: «دەی ئەویش بیژە بزانین چیە؟»

- دەبینم برادەرانی ئێمە کە دەیانەوی لە ئێران شۆرش بکەن‌و ئێستا لە شەردابن، زۆر بەرەو عیراق تێکشاون‌و لە ئێوە تێ‌پەریون. ئێوەش وەک حیزبی سوسیالیست کە دەتانەوی لە عیراق شۆرش بکەن، سنورتان بەجێ هێشتووەو بەرەو ئێران هەلکشاون. جا کەوابە پێشنیارم ئەوەیە بیگۆرینەوە، با ئێمە لە عیراق شۆرش بکەین‌و ئێوەش لە ئێران. بوو بە پێکەنین.. بەلاّم دیاربوو بۆ هێندێکیان پێکەنینێکی شیرین نەبوو. شەو درەنگ گەراینەوە بۆ بنکەی کومیتەی ناوەندی لە ئاشی پشکاری.

لەگۆرە شێر بەسەر کارلاتدا تێپەرین کە فرۆکە بومبارانی کردبوو بەجارێک ویران کرابوو. برادەرانی ئێمە لە دۆلی پشتی ئاشەکە لە بن بەردان کە بۆمبا نەیدەگرتەوە، جێگایان چاکردبوو. تاقە مالێک لە

خوارەوە دەژیا. نانی بۆ دەکردن. نان چ نان. نانی تیری نەبرژاو هەر هەویرو هەر بەوان دەخورا. پێخۆریان تەنیا ترێ رەش بوو هیچی‌تر. نیوەرۆیان برینج‌و شلەیەکی بێ‌تام. بەراستی لەوبارەوە لە ویشکانیدا دەژیان. قسەی گاڵتەو هەڵلەق مەڵلەقی فەتاحی کاویانیان دەکردە ناریتەو پێخۆر. لام وایە بێجگە لە مەلا سمایل‌و کەریم حەداد ئەندامانی کومیتەی ناوەندی گشتیان لەوێ بوون.

دوکتور پێشنیاری کرد. ئێستا کە زۆربەی ئەندامانی کومیتەی ناوەندی لێرەن با کۆبوونەوە بکرێ‌و بزانین چ دەکەین. لە سەرەوەی خێوەتەکەو دوور لە خەڵکی دەورووبەر لەبن بەردێک کە جێگای دانیشتنی لێ‌چاکرابوو کۆبوونەوەی کومیتەی ناوەندی دەست پێکرا. لە پێشدا لەسەر بنەمای راپۆرتی من کە یاسر عەرەفات قەولی دابوو کە ئامادەیە بێتە ئێران‌و بەرپوانی بکاو سەری کوردستانیش بدا باسی ئەوەکرا کە برادەرێک بۆ ئەو مەبەستە بچێتە لوبنان. دوکتور قاسملو سێ پێشنیاری کردن.

یەکەم: کاک حەمەدەمینی سیراجی بچێتەوە بەغدا وەک نوێنەری حیزب لەوێ بێ‌و لەگەڵ باڵوێزخانەی یەکیتی سۆڤیەت پێوەندی بگرێ کە دوکتور قاسملوو مامە غەنی بتوانن سەفەرێک بۆ یەکیتی سۆڤیەتی بکەن.

دووەم: کاک ئەمیری قازی بچێتە لوبنان‌و چاوی بە یاسر عەرەفات بکەوێ.

سێهەم: لەبەر ئەوەی رەنگە سەفەری دوکتور قاسملوو مامە غەنی سەربگرێ کاک کەریمی حیسامی لێرە لە ئاشی پشکاوی بمێنێتەوە.

من گوتم: لام وایە بۆ سەفەری بێروت من باشتر بم. تازە لەوێ گەراومەوە، یاسر عەرەفاتم دیوە، رێبەری حیزبەکانی دیکە دەناسم، چاوم بە هەموان کەوتوە، وتووێژی چاپەمەنیم کردوە، شارەزای وەزعی بێروتم.

غەنی بلوریان پشتی پێشنیاری منی گرت. بەلاَم شیرو ریوی هێنانەوەی دوکتور برادەرانی رازی کرد کە کاک ئەمیر بچێتە بیروت. دیارە دوکتور قاسملو لەو پێشنیارانە مەبەستی بردنە پێشی کارو بەرژەوەندی بزوتنەوە نەبوو. لە ناردنی کاک حەمەدەمین بۆ بەغدا مەبەستی دوور خستنەوەی کاک حەمەدەمین بوو. چوونکە بێجگە لەوەی کە کاک حەمەدەمین خاوەن بیرورا بوو هەلۆیستی خۆی لەسەر مەسەلەکان بە ئاشکرا دەردەبری تووشی هەلەیەک ببوو کە نەدەبوا بیکا. هێشتا لە مەهاباد بووین کاک حەمەدەمین لام وایە بەکاری حیزبیەوە چووبووە لای کرماشان. رۆژێک دوکتور قاسملو بە منی گوت: «حەمەدەمین لە کرماشانەوە چۆتە تاران، لە دەفتەری حیزبی تودە دیتویانە». کاک حەمەدەمین لە گەرانەوەدا لە کۆبوونەوەی کومیتەی ناوەندی (کە ئەودەم من بەشداریم نەدەکرد) گوتبووی: «لە تاران بووم کەبانوری گوتوویە ئەگەر دوکتور قاسملو سکرتیری حیزب نەبێ ئێمە حیزبی دیموکرات بە رەسمی دەناسین و یارمەتی دەدەین». ئیتر ئەم مەسەلەیە دوکتور قاسملوی لە رادە بەدەر بێزار کردبوو. دەیویست بە بیانووی نوێنەرایەتی حیزب لە عیراق کاک حەمەدەمین دوورخاتەوە. کەس دژی ئەو پێشنیارەی دوکتور قسەی نەکرد. پێشنیاری دوکتور لە بارەی منەوە کە لە ئاشی پشکاوی بێنمەوە بەو مەبەستە بوو کە لە تێکۆشان و لە نێو خەلک دوور کەومەوە. بە تایبەت لەو چەند رۆژەدا ئیتر هەموو کاری حیزبی لە مەلبەندی مەهاباد کەوتبووە سەر ئەستۆی من. من گوتم: ئەگەر سەربەخۆیی کوردستانم بدەنێ بەو شەرتەی لەو کەژو کێوە بێنمەوە نامەوێ. کوردستانێکی پان و بەرین هەیە، لە دەوروبەری مەهاباد شوێنی قایم زۆرە، دەتوانین بێینەوە، یا هەموومان بگەرێینەوە بۆ ناوچەو شەری پارتیزانی رێک بخەین. مامە غەنی گوتی: «لام وایە کاک کەریم لە مەهاباد بێنێتەوە. ئێستا بەکردەوە تەنیا ئەو لەوێ ماوە. هەم خەلک و هەم هەلو مەرج دەناسێ.

بێتە ئێرە چ‌بکا؟» دوکتور دوو پێشنیاری پەسند کرابوون، ئیتر لەسەر مانەوەی من پێی‌دا نەگرت. کۆبوونەوە بڕیاری‌دا کە کۆمیسیونی پێشمەرگە پێک بێ. مەلا رەسولی پێشنماز بە مەسئولی بەشی نیزامی‌و کەریمی حیسامی بە مەسئولی سیاسی بەشی پێشمەرگەو بەرپرسی حیزب لە مەهاباد دیاریکران. سەرهەنگ سمکۆ عەلیار بە فەرماندەی هێزی ناوچەی سەردەشت‌و سەرگورد کەریمی عەلیار فەرماندەی ناوچەی مەهاباد‌و رەحمانی کەریمی بە فەرماندەی ناوچەی لاجان دیاریکران. بڕیاردرا مەلا محەمەدی جوانڕۆیی کە هەتا ئەودەم فەرماندەی بەشی پێشمەرگە بوو ئەو هەموو چەرمەسەری لەگەڵ پادگان‌و کەڵ‌و پەلی نیزامی دیبوو، بچێ بۆلای پاوەو سنەو مەریوان. مەلا محەمەد پێشمەرگەیەکی لەگەڵ بوو بە ناوی ئەحمەد کوڕێکی مەردو رەندو زیرو لیهاتوو، کاتێک دەڕۆیشتن لە دۆڵەتوو هات گوتی: «کاک کەریم ئێمە ئەوە لێک هەڵدەبڕێین، دەچین بۆ پاوەو مەریوان دەمانچەم نیە دەمانچەیەکم دەیە.پێشتر باسم کردوە کە کاک سامی بە کاک نەبی قادری‌دا دەمانچەیەکی نەرگانی لولە کورتی بۆ ناردبووم. دەمانچەم لە قەدی خۆم کردەوەو دام بە ئەحمەدی. بەداخی گرانەوە لە شەری سنە شەهید کراو نەگەڕایەوە. دەمانچەیەکیشم دا بە کاک جەلیل‌و ئێستاش نەدیتە(ە.

دوای تەواو بوونی کۆبوونەوەی کومیتەی ناوەندی دوکتور قاسملو گوتی: «هێندی چەک لەگەڵ خۆتان بەرنەوە». پێم سەیر بوو، چەکی چی؟ دوکتور گوتی: «هێندی چەکمان لە عیراق وەرگرتوە، کاک ئەمیر دێ تەحویلتان دەدا». کاک ئەمیر هات هەشتا تفەنگی پەرەشوتی زەمانی هیتلەری بە فیشەکەوە تەحویل داین. کابرای خاوەن تاقەماڵ ئێستری هەبوون‌و کرێ‌باری دەکرد. مەلا رەسول تفەنگی لە ئێستران قایم کردو هاتینە دۆڵەتوی. لەوێ چەند کەردار بەکرێ گیران کە

تفەنگەکان لە هەورازی دۆلەتوێی وەسەر خەن بۆ دەشتی مرداوی. ئێمە ماشینەکانمان لە دەشتی مرداوی بەجێ هێشتبوون. تفەنگەکانیان گەیاندە کن ماشینەکان، بەلام چەند تفەنگ دوورتر مابوونەوە. کاک ئومەر بە یەکێکی گوتبوو بچێ ئەو تفەنگانەش بێنێ. برادەر گوتبووی ناچم. کاک ئومەر زۆری پێ دەلێ کە بەجێ دەمێنن. پیاوی چاک بە بچۆ بیانهێنە. کابرا گوێ ناداتێ. کاک ئومەر زلەیەکی توندی لێ دەدا. من دوور بووم گوێم لە هەرای کاک سەید حەسەنی بوو کە بەسەر کاک ئومەر دادەهات. کەچووم ئەو برادەرە هاتە پێش و گوتی: «ژاندارمەش هەر ئاوا لە خەلکیان دەدا». دلخۆشیم دایەوەو زۆر توند بەسەر کاک ئومەر داهاتم و گوتم: «زۆر عەیبە بۆ تۆ ناتوانی لە خەلک بدەی». زۆر بە کاوە خۆ گوتی: «چۆن ناتوانم ئەوە نیە توانیومەو براوەتەوە». هیچم پێی نەکرا. کابراش وەک پیاوان چوو تفەنگەکانی هێنا.

کاک ئومەر گوتی: «جا هەر بلێ ناتوانی... ئاخر وا نەبا نەیدەهێنان». کەوتینە رێ لە دەشتی مرداوێ یەک دوو ماشێن دەهاتن. کە دەنگمان دان کورەکانی مەهاباد بوون پرسیان ئەری کاک کەریمتان لەگەل نیە؟ گوتمان: وا لێرەیە. دابەزین و هاتنە لام ئەوانیش دەچوون بۆلای برادەران. گوتم: کامەتان شۆفێری چاکە لەگەل من بگەرێتەوە. حەمەدەمینی بارام میرزا (چرچەی رەحمەتی) دابەزی و گوتی: «من دەگەرێمەوە». هات سوار بوو کەوتینە رێ. بە دیوی ئالوەتاندا دەبوایە چرای ماشینەکان بکوژێنینەوە. چونکە ئەرتەش هاتبوە گوندی هەنگەوێ، شەو بەری میراوێ و ئالوەتانی وەبەر تۆپان دەدا. مەلا رەسول لەپێشدا دەرۆی و تێپەر بوو. چرچە رێگای لێ گۆرا. من و کاک ئومەر لە پێشەوە سوار ببوین، دوو پێشمەرگەو هێندێ تفەنگ و دوو تەنەکە بنزین لە پشتەوە بوون. لەپر دیتم لەسەر کەندالێکین، تا گوتم: کورە ئێرە رێگا نیە هەلدێراین، ماشێن بەسەر تەنیشتێدا وەرگەراو لاجەولاج لە کەندالێ کەوت. من کەوتمە نێوان

شۆفیرو کاک ئومەر پەراسوم کەوتبووتە سەر فەرمانی ماشین. پێشمەرگەکان زوتر توانیبان بینە دەرو بە زەحمەت دەرگای پێشەوەیان کردەوە. کاک ئومەر چووە دەرێ، دوایە منو چرچەشیان بە زەحمەت راکێشا دەرێ. هەولێکی زۆرمان دا، ماشینەکەمان بۆ راست نەبۆوە. پێشمەرگەکانمان لەکن ماشین بەجێ هێشتو منو کاک ئومەر ملی رێگامان گرت. دیتمان ئەوە مەلا رەسول بە شوێن ئێمە کەوتوەو دەگەرێتەوە. پێنج پێشمەرگەی لەگەڵ بوون، هەمووماں گەراینەوە ماشینەکەیان راست کردەوەو بە راکێشان هێنامانەوە سەر راستەرێ، ماشین وەکار کەوتو حەلەمی لێ نەبوو. لە چۆرمی پەرینەوە، لەکاتی رەش کە بنکەی مەلا رەسولی بوو لاماندا. لەوێ مەلا رەسول ٦. تفەنگی گیرابەوەو ئێمەش ٢. تفەنگمان هەڵگرتو شەو چووینە گوندی قولغەتەپە. پەراسووم ژانیان دەکردو زۆر نارەحەت بووم. دەمویست بگەمەوە ماڵە سەید حەمەدەمینی یا ماڵی حاجی عەولا. بەیانی کەوتینە رێ لە گوندی بەیرەم لاماندا کن پێشمەرگەکان. تەماشام کرد سەید حەسەنی ورچان ماشینێکی ئەرتەشی پێیەو لەگەڵ چەند پێشمەرگە کە هێندێک بێ چەک بوون هاتۆتە ئەوێ. پێنج تفەنگو هێندێ پارەمدا بە سەید حەسەنو پێمگوت: لەگەڵ دە پێشمەرگەی بەکار بچیتە گوندی ئەمینئاباد، لەوێ بنکەیەک بکاتەوەو چاوەروان بێ تا خەبەری دەدەمێ.

لەگەڵ کاک ئومەر چووینەوە عەینە مەلا ماڵی سەیدحەمەدەمینی خزمان. ئەو ماڵە ئاوەدانە بۆمان ببووە پەناو مزڵو شوێنی حەسانەوە. گورج نیوەئەکیان ساز کردو هاویشتیانە سەر پەراسووەکانمو لێی کەوتم. پاش دوو رۆژ تۆزێک هاتمەوە سەرخۆ. ئێوارەیەک سوار بووین هاتینە وزیندەرێ، ماشینمان لەوێ بەجێ هێشتو چووینە کۆنە دێ. تفەنگەکانیشمان لە مەزرایە دا بە برادەرێکی جوتیاری ئەمین تا پاشان وەرمان گرتنەوە. پاش سێ رۆژ ناردم لە دوای سەید حەسەنی ورچان. پێم

گوت: «پێویستە بێدەنگی‌و ماتی نێوشار بشکێندرێ. وەک خەبەرم بۆهاتوە پاسدار جێگای شورای شار بەرانبەر فەرمانداریان کردۆتە بنکەی خۆیان. کۆڵان‌و گەڕەکی شار شارەزای. کاتی ئەوەیە خۆت بگەیێنیە نێوشارو هیچ نەبێ دوور بە دوور تەقەیان لێبکەی. سەید حەسەن وەک پیاوان بەڵێنی‌دا. شەوی دوایە دەگەڵ چەند پێشمەرگە دەچێتە نێوشارو لە نیزیک بنکەی پاسداران تەقەیان لێ دەکا. بە نارنجۆکی سەری ژێ‌سێ پەلجەرەو دیواری بنکەی پاسداران وەبەر دەس‌ڕێژ دەداو دەگەڕێتەوە. بەیانی زوو لە شارەوە خەبەریان بۆ هێنتماین کە ئەم شۆ هاتوونە سەر پاسداران‌و تەقەیان لێ‌کردوون. خەبەر بلاو ببۆوە کە دوو کەسیش کوژراون، چەندە راست بوو نەمزانی.

هاتنەوەی ئەرتەش بۆ مەهابادو چۆڵکردنی ناوچە بۆ ماوەیەکی کەم لە لایەن پێشمەرگەوە ناهومیدی خستبوە دڵی خەڵکەوە. لەشامات‌و شاروێرانەوە ئەندامانی حیزبی دەهاتن‌و داوای چەکیان دەکرد. لەگەڵ کاک ئومەر بریارمان‌دا بەناوچەی مەهابادو چۆمی مەجیدخان‌و شامات‌و شاروێران‌دا بگەڕێین. بەر لەوەی بکەوینە ڕێ دانیشتین بیرمان لێ‌کردەوە کە پێویستە ئاگاداری یا بەیاننامەیەک ئامادە بکەین‌و لە هەموو گوندێک بە دیواری مزگەوتانەوە بدرێ‌و خەڵک ئاگادار بکرێ. پاش لێکۆڵینەوەیەکی زۆر ئەم ئاگاداریەی خوارەوەمان نووسی‌و ئامادە کرد.

١- پێویستە لە هەموو گوندێک شورایەکی پێنج کەسی هەڵبژێردرێ. ئەرکی ئەم شورایە بریتی دەبێ لە:

- کۆ کردنەوەی پیتاک‌و یارمەتی بۆ حیزب.
- ئەگەر پێشمەرگە یا کادری حیزبی بەکاری سیاسی یا نیزامیەوە هاتە نێو گوندی دەبێ شورا بناسن‌و شورا کاروباری پێشمەرگە ڕاپەرێنێ.
- گیرو گرفتی نێو گوندی، ناکۆکی دەرو جیرانان، هەر مەسەلەیەکی دیکە لە گوندی بێتە پێش. پێویستە لە ڕێگای شوراو بە قسەی ئەندامانی

شورا چارەسەر بکری.
٢- ئەو کەسانەی لە گوندی چەکیان هەیە، دەبێ چەکەکەیان بپارێزن. ئەو کەسانەی دەستیان دەرواو چەکیان نیە دەبێ چەک بکرن. ئەگەر خۆشیان چەک هەڵنەگرن، بیدەن بە شورا. شورا دەیدا بەو کەسانە کە ئامادەن چەک هەڵبگرن.
٣- هیچ کەسێکی گوندی بۆ هیچ کاروبارێک نابێ بچێتە لای پاسداران‌و ئیدارەی دەولەتی. نابێ دەسەلاتی حکومەتی داگیرکەر بەرەسمی بناسرێ.
٤- هەرکەس جاسوسی بکا، خەبەر بۆ پاسداران بەری، راپۆرت لە پێشمەرگەو خەڵکی گوندی بدا، بە دوژمنی گەڵ دەناسرێ‌و دوای ئیسپات بوونی تاوانەکەی سزای ئیعدامە.
٥- بۆیارمەتی دانی پێشمەرگە لە جەبهەی شەر، هەرکەس لە قسەی شورا بچێتە دەر سزا دەدرێ.

پاش ئامادە کردنی ئەم ئاگادارییە، پێویست بوو بکەوینە رێ. مەلا محەمەدی جوانرۆیی لەندوێرێکی بۆ ناردبووم لە وزیندەرێم دانابوو، پێویستی بە هێندێ دەستکاری هەبوو. پێشمەرگەیەکمان هەبوو بە ناوی عەولافلان کە سەری لە ماشین‌و میکانیکی دەردەچوو. ماشینی برد کە لە گوندی خەلیفان دەستکاری بکاو چاکی‌کاتەوە. چەند رۆژ پێ‌چوو نەهاتەوە، خەبەریان هێنا کە ماشینەکە لە نێوان کێتکەو خەلیفان وەرگەراوەو داری لەسەر بەردی نەماوە. لەم بەینەدا بە هیوای ئەوە تا ماشین دێتەوە رۆژێک لەگەڵ کاک ئومەر بە پێیان وورده وورده وەسەر کەوتین‌و چووینە قزلجەی سەرێ سەردانی دۆستی خۆشەویست‌و هاڤاڵ زیندانیم (کاک رەزاقی قازی). پنکەیەکی کۆمەڵە لە قزلجە دامەزرابوو، لە جیاتی بەربەرەکانی لەگەڵ رژێمی‌داگیرکەر بە مەبەستی خەباتی چینایەتی خەڵکەکەیان فێرکردبوو کە بچن دارەکانی کاک رەزاق ببرن‌و تەواو نارەحەتیان کردبوو. نەمزانی کێ مەسئولیانە بەلام لەگەڵ

برادەرێکی کۆمەڵە کە دەمراستیان بوو باسم کردو گوتم: کاتی ئەوەیە کە هێزەکانمان بۆ بەرەبەرەکانی رژێم کۆبکەینەو وەکاریان بخەین. ماوە بۆ خەباتی چینایەتی لەبەر ناچێ. تا لای ئێوارێ لای کاک رەزاق بووین. دووربینێکی زۆر باشی نیزامی داینێ، منیش پاشان دام بە سەرگورد عەلیار.

پاش خەبەری نەمانی ماشین دەبوایە بۆ گەرانی مەڵبەند ماشین پەیدا بکەین. برادەرێکی حیزبی فیداکارو تێکۆشەرمان لە گوندی خوێرپارا هەبوو بە ناوی محەمەد، جیبێکی باشی هەبوو. (بەداخەوە پاشان بیستم کە محەمەد بە گوێرەی یاسای سزادانی حیزب لە زیندانی دزلەتوێ لە بۆمبارانەدا شەهید بووە) کەریم بێژەنم نارد چوو محەمەدی بە جیبەوە هێنا. تا کەریم هاتەوە خەبەرمدا بە کاک وسێنی حەمە شێخە لە قزلجەی خوارێ ولاخێکی سواریم بۆ بێنێ بچمە قزلجەی. کاک حوسێن رۆژی دوایە ئەسپی کاک مەنافی شافعی بۆ هێنا بووم. ئەسب چنگی لە ئاسمانی دەداو سواری دەربست خۆی لەسەر راپگرێ. ولاخێکی دیکەشمان لە برادەرێکی کۆنە دێ وەر گرتو شەو چووینە قزلجە. رۆژی دوایی کاک مامەندی کوری میناغای قزلجە کە پێکەوە شیری دایکی ئەومان خواردبوو، بە منداڵی پێکەوە گەورە ببووینو پێکەوە خوێندبووومان، گۆیا بروکە ملکێکی لە قزلجە مابوو.، پەیدا بوو. کەوتە سوێندو تەلاقان نابێ برۆی. ناچار مامەوە نیوەرۆ لە ماڵی کاک مامەندی لەسەر نانخواردن بووین هاتن گوتیان چوار پێشمەرگە لە نێو گوندین لە کەریمی حیسامی دەگەرێن. بانگم کردن هاتنە ژێ. زۆر ماندوو هیلاک بوون. لەگەڵ ئێمە نانیان خواردو حەسانەوە. نامەیەکیان هێنا دەرو رێیان‌دام. کەنامەم کردەوە خەتو ئیمزای غەنی بلوریان نووسیبووی: «کاک کەریم ئەو کورانە هاتنەوە بۆلای تۆ چۆنی پێت باشە جێگاو کاریان بۆ دیاری بکە».

مەسەلە چ بوو؟ لەگەڵ هاتنەوەی ئەرتەش بۆ مەهاباد، بەرنامەو

ئەنزیمێک لەگۆڕیدا نەبوو. هەرکەس وەدەر کەوتبوو، سەری خۆی هەڵگرتبوو بەرەو سەردەشت‌و سنووری عیراق. لاوەکانی ئەندامی یەکێتی لاوان کە پاشان دەرکەوت زۆربەیان تودەیی بوون‌و خۆیان خزاندبوە نێو حیزبی دیموکرات یا بیروباوەری تودەییان هەبوو روویان کردبوە ناوچەی سەردەشت‌و چووبوونە ناو زەنگ‌و ئاشی پشکاوی‌و دەوروبەری بنکەی حیزبی کومونیستی عیراق. برادەرانی حیزبی کومونیستی عیراق سەرکۆنەیان کردبوون‌و گوتبوویان نەدەبوایە ناوچەی مەهاباد بەجێ بێلن. ئێستاش بگەڕێنەوە بچنەوە کن کەریمی حیسامی لە خەبات‌و تێکۆشاندا بەشداری بکەن‌و خۆتان دوور مەخەنەوە. ئەوانیش دەچنە لای مامە غەنی ئەویش نامەی نووسیبوو ناردبوونیەوە لای من. هێندێکیش لە لاوەکان دەچنە لای کومیتەی ناوەندی. دەیانێرن بۆ قەلادزەی لەوێ فیری مەشقی نیزامی بن، سەید رەسوڵ بەرپرسیان دەبێ. کورەکان لەوێ تەماشا دەکەن کە ناتوانن دەگەڵ سیستەمی بەعسی رێک کەون، بە بێ ئیجازەی مەسئول دەلاقی خۆ رزدێنن‌و دێنەوە بۆ ناوزەنگ‌و پاشان دەچنە کن مامەغەنی لە ئاشی پشکاوی. ئەویش نامەیان دەداتێ‌و دەیانێرێتەوە بۆلای من. تەواوی ئەو کەسانەی کە بەنامەی غەنی بلوریان هاتنەوە لای من، بیجگە لە کاک ئەوبدی موعینی‌و کاک حوسێنی بەخشی کە لە لای خۆم گل‌دانەوە، دەنا ئەوانی دیکەم ناردەوە نێو شارو شێوەی تێکۆشانی نهێنی‌و ئەرکی پێویستم بۆ دیاری دەکردن. ئەوانیش پیاوانە خۆیان نەدەگرت‌و دەچوونەوە نێوشارو ئەرکی تێکۆشەرانەیان بەجێ دەگەیاند. تا من لە قزلجە گەڕامەوە کەریم بێژەن لەگەڵ محەمەدو ماشێن ئامادە بوون.

نامەیەکم بۆ کاک کەریمی عەلیارو بۆ کاک مەلا رەسوڵ نووسی‌و پێم راگەیاندن کە وا خەریکی گەرانێکم بە ناوچەدا. ئەگەر کاریان هەبێ دەتوانن لەم دیهاتە بمدۆزنەوە. لەگەڵ کاک ئومەرو کەریم بێژەن سوار بووین چووینە گوندی ئەمین‌ئاباد. سەید حەسەنی ورچان بە ئارپیجی‌یەک‌و

نۆ پێشمەرگەی چەکدارو بەکار، بە جیبێکی ئەرتەشی کەوتنە پێشمان‌و شەو چووینە گوندی قەمتەرێ. ئەوە هەوەڵین قۆناخی سەفەری یەکمانگەمان بوو. میوانی برادەرانی حیزب بووین. لە بلیندگۆی مزگەوت رایان گەیاند کە شەو لە مزگەوت کۆببنەوە تا لەسەر بارودۆخی ئێستای وڵات قسە بکەین. لام وایە کەس لەماڵە خۆی نەمابوو. مزگەوتی گەورەی قەمتەرێ بەحاڵ جێگای خەڵکی دەبوو. لەپێشدا لەسەر سیاسەتی حکومەت‌و فتوای خومەینی‌و پەلاماردانی کوردستان بە درێژی قسەم‌کرد. پاشان سیاسەتی حیزبی دێموکراتم روون کردەوەو گوتم: «ئێمە پێمان وایە لەم قوناخە ناسکەدا خەڵک دەبێ کاروباری خۆی بگرێتە دەست. هەر بۆیەش ئێمە کاروباری گوندەکان بەرێکخراوو کومیتەی حیزبی ناسپێرین. بەخەڵکیان دەسپێرین. بۆئەوەی خەڵک بۆخۆی کاروباری بەرگری‌و یارمەتی‌و ناکۆکی نێو گوندی خۆی چارەسەر بکا حیزبی دێموکرات بریاری داوە کە لە هەموو گوندێک شورای گوندی هەڵبژێردرێ‌و ئەم بریارانەش کە بە دیواری مزگەوتەوە دراون ئیجرا بکرێن. رێکخراوو ئەندامانی حیزب بەتەواوی پشتی شورا دەگرن‌و لە هەموو بارێکەوە یارمەتی شورا دەدەن.

هەر ئەو شەوە لە قەمتەرێ شورای شاریان هەڵبژاردو ناوی ئەندامانی شورام یادداشت کردو دەسیتان کرد بە کۆکردنەوەی یارمەتی. بە جیا رۆژی دوایی لەگەڵ کومیتەی حیزبی کۆبوومەوە. لەباری تەبلیغ، وریایی، چاوەدێری رێگاو بان، وەرگرتنی خەبەرو شتی‌تر روونم کردنەوە. رۆژی دوایی تا نیوەرۆ لە قەمتەرێ بووین، خەڵک دەهاتن لەسەر نۆرە ئاوو زەوی‌و وردە ناکۆکی شکایەتیان دەکرد. دەمناردنە کن شوراو بە برادەرانی حیزبیشم دەگوت کە تابێ دەست لە کاروباری گوندی وەربدەن‌و دەبێ شورا بە هێز بکەن.

لەماوەی ٢٧ رۆژ لەگوندەکانی قەمتەرە، کولیجە، عیساکەند، بورهان، وەتەمیش، یالاوە، قورغان، غەوساباد، سنجاخ، خات‌و خاس،

پیروەلی‌باغی، سرپلاوا، قارلجەی گەورەو بچووک، قەلای‌رەسولە سیت، حاجی لەک، سەرچنار، قەباکەندی، سەوزی، خەتایی، قولقولە، گردە رەش، زەنگیاوە، کزخان، دیٚمەلا، قەرە گزلٚ، ئاتاپلاغی، قەلاجرخە، تالار، دیٚمەسور، خوێرپاوا، حاجی‌حەسەن، دیٚوەیساغا، گەوجاوا، تازەکەند، گەزەلێن، مەرجانئاوا، دەلکداش، قزقەلا، بەردەرەشان، ئازاد، قەرەبلاخ‌ر دەرمان شورای گوندیان دامەزراند. قسمان بۆ خەلْک کرد، لەو ماوەیەدا ٤٩٠٠ هەزار تمەن یارمەتی نەغد بۆ حیزب کۆکرایەوە. لە هەموو گوندێک پیشوازی بیٚوێنەمان لیٚ دەکرا. وورەی خەلْک بەرز ببۆوە، لاوان ناوی خۆیان بۆ پێشمەرگایەتی دەنووسی. لە زۆر گوند شورا داوای چەکی دەکرد لە گەرانەوەدا بۆم دەناردن. ریزی ئەو کەسانەم ئێستاش لەلایە کە تفەنگیان وەرگرتوە، بەداخەوە ناکریٚ‌و پێویستیش نیە بینە سەر کاغەز.

# گەشتی مەڵبەندی مەهاباد

دوای نیوەڕۆ درەنگ لە قەمتەرە وەدەر کەوتین بەو نیازە شەو بچینە کولیجەو میوانی حاجی شیخ عەولا بین. من دوور بە دوور حاجی شیخ عەولام دەناسی. ساڵەکانی ٦٧و ٦٦ ئەویش لەگەڵ مامۆستا هێمن و ئازادیخوازانی‌تر رای‌کردبوو چووبووە کوردستانی عیراق. دیار بوو لەوی نەحاواپۆوە گەراپۆوە. مامۆستا هێمن زۆرجار باسی پیاوەتی ئەوی دەکرد. هیواشم ئەوە بوو لەبەر ئەوەی مرۆڤێکی خۆشناو بوو لەناوچەدا ئەرکی رێکخستن و هاندان و بەرپەوەکانی ئەو قۆلە بەو بسپێرم.

نوێژی شێوان گەیشتینە گوندی کولیجە. راست کە رێگا دەگاتە نێو گوندی لە دەستی راستە خانویەکی دووقات و رووکار خاوێن و حەسارێکی بچووک قوت بۆتەوە. ماشینی پێشمەرگەکان لە پێشەوە بوو. دیار بوو کە دەنگی ماشین دێت، ژنێکی قۆزو جوان و پاک و خاوێن و بەدیەن دێتە دەرێ کە چاوی بە پێشمەرگە دەکەوی هاوار دەکا:

«ئوخەی... خولایە... خۆ ئەوە پێشمەرگەن... ئەوە مەلاتیکەتن... ئوخەی... رەبی خودا بتانپارێزێ، چاومان رون بۆوە، بە قوربانتان بم». بەو قسانەوە هاتە پێش ماشینەکەی ئێمەو گوتی: «دەلادەن... دەمەرۆن... ماڵی خۆتانە هەموو شت زۆرە... بۆ ئێوە نەبێ ئەدی بۆ کێ بێ؟ رەبی خولایە سەرکەوتوو بن... دابەزن، نابێ برۆن». گوتم زۆر سوپاست دەکەین ماڵی خۆمانە ئاوەدان بێ. بەلام دەچینە کن حاجی شیخ عەولا.

- ئەبرۆ... بۆ ئێرە ماڵ نیە.. ئاوەدانی نیە، دەبێ لادەن. دەنا راوەستن با بچم نان‌و پێخۆر بۆ پێشمەرگەکان بێنم.
- زۆر سوپاس ئەو زەحمەتەی ناوێ شەو لێرە دەبین، بەڵام تکا دەکەم ناوی خۆتم پێ بڵێ با ئەو دڵسۆزیەی تۆ لە بیر نەچێتەوە.
- ئەبرۆ بەقوربانت بم ناوم زیبایە.

ئەگەر نووسەر بام، بۆیە دەبوو رۆمانێک لەسەر ئەم دیمەن‌و دڵسۆزی‌و ناخافتنی ئەو ژنە هەڵکەوتوە بنووسم. بەداخەوە توانای ئەو نووسینەوەم نیە، بەڵام هەڵویستی جوامێرانەو قەلافەتی زیبای (زیبا)م هەرگیز لەبیر ناچێتەوە. پێشمەرگەکان پێشتر چووبوون دابەزیبوون. حاجی شیخ عەولا لە دەرەوە چاوەروان بوو. بەخێرهاتنێکی فرە گەرم‌و برایانە. چووینە دیوەخانێ. دیوەخان دەتگوت ئەمباری چەک‌و قورخانەیە. لە ئارپیجی‌یەوە بگرە تا تیربارو تفەنگ‌و نارنجۆک‌و کۆڵەپشت‌و کیسە خەوو فیشەکدان لە قوژبنێکی هەڵدرابوونەوە. کاک سەلاحی رەحمەتی برای حاجی شیخ عەولا هێندێ عەجمی پەیکاری‌و یەکیتی کۆمونیستان‌و مائۆیستی هەلاتووی لەخۆ کۆکردبوونەوە دەیویست لە کوردستان دوور لە کولیجەو لە ماڵی خۆیان خەباتی چینایەتی بکاو ئاغاو سەرمایەدار لە کوردستان نەهێڵێ.

شەو میوانداریەکی کوردانە ساز کرا. دوای نان‌خواردن، یەکە دوویەک لەو برادەرە راکردوانەی تاران لە دیوەخانێ پەیدا بوون‌و باسی سیاسی‌و بارودۆخی کوردستان هاتە گۆرێ. تەماشام کرد بەراستی یا هەر تی‌ناگەن یا بە ئانقەست لە ئاژاوەو تیکدەری دەگەرێن. لەباسەکەماندا حاجی شیخ عەولا پشتیوانی لە بۆچوونی من دەکرد. هیوایەکی زۆرم لێ پەیدا بوو. بەداخەوە پاش دوو رۆژ شەو لە نێوان غەوساباد‌و سوڵجاخ تووشی ماشێنێک بووین پێشمەرگە دەنگیان دان‌و لێیان هاتنە خوار. کە سەید حەسەن چۆوە پێشێ دەبینێ حاجی شیخ عەولا لەگەڵ ئەو عەجەمانە شەو

دەچێتە گوندەکان و تەبلیغاتیان بۆ دەکا. ماشێنی ئێمە دوور وەستابوو. سەید حەسەن هات گوتی: «حاجی بەو عەجەمەکانی دوێنیشەوێ، چییان لێی بکەین؟» گوتم: لێگەڕێن با بڕوا. ئیتر حاجی شیخ عەولام نەدیتەوە تا چوومە سەرەخۆشی کاک سەلاحی برای لە مەهاباد.

بەیانی ماڵ ئاوایمان لە حاجی خواست و چووینە عیساکەندی. خەڵکی ئاوایی لە مزگەوتێ کۆبوونەوە و پاش باس و شیکردنەوەی باروودۆخی کوردستان شوورایان هەڵبژارد و دەستیان کرد بە ناو نووسین بۆ کۆکردنەوەی یارمەتی لە پاشان ناردبوویان بۆ تەشکیلات. لای ئێوارێ چووینە گوندی وەتەمیشی، مەکۆی برایانی کۆمەڵە. شەو خەڵکێکی زۆر لە مزگەوتا کۆ بۆوە. پاش وتاردان برادەرانی کۆمەلە دەستیان کرد بە پرسیاران کە پێوەندی بە هەڵکەوت و باروودۆخی گرنگی ڕۆژەوە نەبوو. ئەوان ئەودەم هێشتا یا بیریان لەبەرپەرەکانی نەکردبۆوە یا هێشتا نەهاتبوونەوە سەرخۆ و لە ڕێبەرایەتی دوور بوون. چونکە ڕێبەرایەتی کۆمەڵەش بە مامۆستا شیخ عیزەدینەوە شار و ناوچەی بەجێ هێشتبوو لە لای مام جەلال گیرسابوونەوە.

بەیانی کە سوار بووین بڕۆین لەوبەری گوندی مامۆستاکانی مەدرەسە هاتنە پێشمان گوتیان ترێی ڕەشی زۆر باشمان هەیە دابەزن ترێمان لەلا بخۆن. من گوتم: سوپاستان دەکەین و دەبێ بڕۆین دانابەزین. کاک ئومەر گوتی: «ئەوە چۆن بوو وشەی (نا)ت بەسەر دزماندا هات. خۆتۆ (نا)ی نازانی». ڕۆیشتین چووینە قورغان. عبدالرحمانی شەمسی بورهانی کە جاسوسێکی ناسراوی حکومەتی شا بوو لەسەرەتای شۆڕش، شوورای مەهاباد گرتبووی، بەڵام دوایە بەرەڵای کردبوو. نەدەچۆوە ماڵی خۆی لەم گوندانە دەسووڕاوە. خەبەری زانیبوو کە پێشمەرگە دێن بۆ قورغان، دەرپەڕیبوو چووبووە غەوساباد ماڵە شیخ نەجمەالدینی . لە قورغان چووینە ماڵە مەلا مستەفا ئاوێک کە پێشتر لەگەڵ کەریم بێژەن و چەند کەسی تر

یەکیتی لاوانی گوندیان پێک هێنا بوو. لە مزگەوت خەڵک کۆبوو‌ەو شورایان دامەزراند کورەکانی سەعدون ئاغاش هاتنە مزگەوت‌و گوتیان نابێ بڕۆن شەو میوانی ئێمە بن. ئێمە شەو چووینە ماڵی ئەوان. بەیانی چەند لاوێکی گوندی کە دیاربوو سەر بەچەپی خوار بوون، هاتن گلەییان کرد کە بۆچی چووین لە ماڵی ئاغا نانمان خواردوە؟ من بۆم روون کردنەوە کە ئێستا ئێمە کەوتووینە بەر پەلامارێکی درندانەو دوژمنی سەرەکی خەڵکی کورد ئەو رژێمەیە کە فتوای خەزای داوە. ئێمە پێمان وایە لەم قوناخەدا ئامانج پێکهێنانی یەکیتی ریزەکانە لە کوردستان نەک سازکردنی کێشەو دوو بەرەکی.

ڕۆژی دوایی مەلا مستەفاشمان لەگەڵ خۆ سوار کردو دوای نیوەرۆ چوینە غەوساباد ماڵە شێخ نەجمەالدینی. شێخ نەجمەالدین لەشەری نەغەدە منی گەیاندبۆوە مەهابادو لە رێگا قسەکانمان لێک خۆش هاتبوو. لە دوور بە پیرمانەوە هات. بەخێرهاتنێکی زۆر گەرمی کردین. چووین لە دەرێ کورسیان دانابوو. شێخ عبدالرحمانی جاسوسیش لەوێ بوو، لەترسان سپی هەڵگەرابوو وەک ژوشک رنگ هاتبوو. پێی‌وابوو ئێمە وەدوای ئەو کەوتووین. کە دانیشتین شێخ نەجمەالدین دوای دووپاتە کردنەوەی بەخێرهێنان گوتی: «هەموو کەس لە ژیانیدا تووشی هەڵەو ئێشتیبا دەبێ لێخۆشبوونیش هەر هەیە. بە تایبەت بۆ کورد کە هەمیشە صرفنظری هەبووە».

زانیم مەبەستی شێخ عبدالرحمانە. گوتم: «لام وایە ئەوانەی خەیانەت بە نەتەوەی خۆیان دەکەن ئاخرەکەی هەر ریسوایی‌و سەرشۆڕیان پێ دەمێنێ. شێخ عبدالرحمان با نەترسێ. ئێستا کاتی سزادان‌و تۆڵە ئەستاندنەوە نیە. یەکەم لەبەر ئەوەی ئەو ئێستا هاتۆتە ماڵی جەنابت. دووەم لام وایە ئەوەندە بۆ ئەو بەس بێ کاتێک خەبەری هاتنی پێشمەرگە بزانێ، خۆ نەگرێ‌و رابکا بۆ گوندێکی‌تر». شێخ نەجمەلادین

گوتی: «ئەوە مزگەوتەو خەڵکیش کۆ دەبێتەوەو چۆنی دەفەرمووی وادەکەین». من چوومە نێو خەڵک، شورای گوندیان دامەزراند، ئەرکی کۆکردنەوەی پارمەتیم خستە سەر شانی شیخ نەجمەالدین. مەلا مستەفاش پردی پێوەندی نیوانمان بێ. لامەوایە دوای دەدوازدە رۆژ مەلا مستەفا دوازدەهەزارتمەنی بۆ هێنام گوتی: «شیخ نەجمەالدین ٢١ هەزارتمەن پارمەتی کۆکردۆتەوە. ١٢ هەزارتمەنی بۆ حیزب ناردوەو ٩ هەزارتمەنیشی ناردوە بۆ مەلا شیخ عیزالدین».

رۆژی دوایە شیخ نەیهێشت برۆین. چووینە زیارەتی مەرقەدی شیخ باباو ئەمینالاسلامی رەحمەتی. شەو سوار بووین چووینە سوڵجاخ‌و خات‌و خاس‌و پاشان هاتینە ئاتە بلاخی. لە ئاتەبلاخی بووین کاک ئەوبدی موعینی‌و کاک حوسێنی بەخشی هاتن. نامەی مامە غەنیان هێنابوو. چەند گوند گەڕابوون تا دۆزیبوویانینەوە. ئیتر نەمهێشت ئەوان برۆن‌و لەگەڵ خۆمان بوونە ئەندامی دەستەی گەڕۆک. من لە مزگەوتەکان پتر لەسەر یەکیتی‌و بیزارکردنی خەڵک لە رژیم‌و هاندان بۆ بەربەرەکانی‌و یارمەتی بە حیزبی دیموکرات‌و بە پێشمەرگە قسەم دەکرد. بڕواشم بەوە هەبوو کە ئەرکی گرنگ لەم قوناخەدا بریتیە لە یەکیتی لەبەرامبەر دوژمنی پەلاماردەردا. کاک حوسێنی بەخشی کە دیار بوو ئەو دەم شتێکی لە مێشکیدا دەجولاو پاشان درنگتر تووشی هەڵدێرانی کرد، یەک دووجار رەختەی لێ دەگرتم کە بۆچی هەر باسی بەربەرەکانی‌و یەکیتی‌و دژی رژیمی خومەینی قسە دەکەم؟ بۆچی باسی خەباتی چینایەتی‌و کرێکارو چەوسانەوەو دژی دەرەبەگ‌و سەرمایەدار قسە ناکەم. پێم دەگوت: تۆ دەبێ ئەوەندە بزانی خەباتی ئێستای گەلی کورد لە چ قوناخێکدایەو ئەرکی گرنگمان چیە؟ خولا هەڵناگرێ کاک ئەنوید ئەودەم وا نەبوو، نازانم پاشان بۆوای لێ‌هات‌و بۆ تووشی ئەو هەڵەیە بوو؟

رۆژی دوایی چووینە گوندی پیر وەلی باخی. شەو لە مزگەوت

کۆبووینەوە کا تاهیری عەلیارو سەلیمی باپانزادە لەگەڵ ١٢ پێشمەرگە پەیدا بوون. ئەوان وەک پیاوان ناوچەی بۆکانیان بەجێ نەهێشتبوو. خەبەریان زانیبوو کە ئێمە لەو ناوەین هاتبوون لە پیرووڵی‌باخی ئێمەیان دۆزیبەوە. کاک تاهیر لەبەر بێ پوولی‌و بێ‌دەرەتانی هاواری بوو. دەیگوت: «پیشمەرگەکان پیلاویان نیە». شەو لە مزگەوت داوام لە خەڵک کرد لەبەر ئەوەی ئەم پێشمەرگانە گیرئاین‌و سبەی دەگەرێنەوە بۆ ناوچەی خۆیان پێویستمان بە یارمەتی هەیە. هەر بەو شەوە شەش هەزارو پینج‌سەدتمەنیان کۆکردەوە. پارەکەم نەغد دا بەکاک تاهیرو بەیاتی گەرانەوە بۆلای لەگز. جارێکی‌دیکەش ١١هەزارتمەنم بۆناردن. بەیانی هاتینە خوار چووین لە مەزرای سرپلاوا لە نێو باخ‌و بیستانی کاک حەسەنی سرپلاوە دابەزین. هەوایەکی خۆش، باخ‌و بیستانێکی لە رادەبەدەر جوان‌و پر لە ئاور میوە. ناردمان نان‌و چێشتێکی زۆریان بۆ هێنایین. لەپر تەماشامان کرد لەو مەزرایە سەید ئەنوەر، یا سەید عومەرو سەید تاهیری زەنبیلی پەیدا بوون. نەمزانی چۆن بۆتیان کردوە کەوا ئێمە لەو مەزرایەین. لێشم نەپرسین، چونکە ئەگەر پرسیبام دەیانگوت: «ئەدی بەچی شیخین!» سەیر ئەوە بوو دەیانویست لەم هەڵو مەرجە ئالۆزە کەڵک وەربگرن. هاتبوون نامەیەکیان بدەمێ بە نوێنەرایەتی حیزب بچنە ناوچەی سایئقەڵاو هەوشار کۆیا یارمەتی بۆ حیزب کۆبکەنەوە. جا ئیتر خۆیان دەیانزانی چ دەکەن!

لای ئێوارێ چووینە سرپلاوار میوانی کا حەسەنی جوامێرو دڵسۆزو نیشتمانپەروەر بووین. لەوی نە خەڵکم کۆکردەوە نە شورام دامەزراند. چونکە کاحەسەن لە هەموو بارێکەوە ئەرکی رۆژی دەزانی. شەو چووینە قارنجە. ئەو گوندەی پێش ٢٥ساڵ لەوی گرتبوویانم، بردبوویانم بۆ زیندان سێ ساڵی رەبەق بەندیان کردبووم باب‌و خێزان‌و کچم لەم گوندە کۆچی دواییان کردبوو. خەڵکی قارنجە چ ئەوانەی پیری ئەو سەردەم بوون‌و چ

ئەو لاوانەی تازە پێگەیشتبوون‌و ناوی منیان زانیبوو پێشوازیەکی تایبەتی ئەوتۆیان کرد کە هەرگیز ناتوانم لە بیری بەرمەوە، بەلاّم هەروەها قەت داخی ئەوەشم ناچێ کە گیر نەبووم‌و بچم گلکۆی باوکو خێزان‌و کیژێکی سێ‌سالەم بدۆزمەوەو سلاوێکیان لێ بکەم‌و فاتیحەیەکیان بۆ بخوێنم‌و بلێم ڕەوانتان شاد بێ. زیندانی‌و دەربەدەری من‌و سەرکردنەوەی ئێوە بە بێ‌کەسی، ئێستا بەرهەمی خۆی داوە. ئەوا من ئەوجار بە ئازادی لە کوردستانێکی ئازاددا دەگەڕێم. ئەوەم نەکرد تا ئێستاش هەر وەک مردنی ئەوان داخێک بووە لە سەر دلم، نەچوونە سەر گلکۆشیان هەروا داخەو زۆرجار وەبیرم دێتەوەو بە هیچ جۆر ناتوانم پاکانە بۆخۆم بکەم. لام وایە ئەو شەوە موحیبەتی خەلکی قارنجەو ئەرکی تێکۆشان‌و بەرپرسیەتی ئەوکاتە ئەم ئەرکە پیرۆزەی دیکەی لەبیر بردبوومەوە. بەلاّم بلێی ئەو ڕووداوانە بۆ حیزبی دیموکرات بایەخدار بن؟

لەوێوە چووینە قەلاّی ڕەسولەسیت. بوونگەی مەلا ئەمجەدی شاعیرو خەت خۆش‌و نیشتمانپەروەرو کورد پەروەر. ئەگەر مامۆستا هەژاری شاعیر لەبەرەو موکریاندا بەخەیالّ دەچێتە قەلاّی ڕەسولە سیت‌و سەر لە مەلا ئەمجەد دەدا. ئێستا وامن لەگەلّ دوو سێ هاوڕێ‌و هاڤالی خۆشەویست‌و پۆلێک پێشمەرگە نەک هەر لە گوندەکەی مەلا ئەمجەد بەلکو لە مالەکەی ئەو میوانم. لەو مالە لە ڕادە بەدەر ڕێزیان لێ‌گرتین. چووینە مزگەوت داوایان لە خەلک کرد کۆبنەوە. لەوێش لەگەلّ برادەرانی چەپی‌خوار باس‌و دم‌بە دمەیەکمان تووش بوو. شورایان هەلبژاردو پارەیەکی زۆریان کۆ کردەوە. لە حاجی لەک لە مزگەوت دانیشتبووین. سەبارەت بەوەی لە ڕێگای بۆکان- میاندواو نیزیک بوو، لاوان کێشکیان دەکێشا. خەلک بە حەماسەوە پێشوازیان کرد. مزگەوتی حاجی لەک فەرشی زۆر جوانی لێ‌ڕاخرابوون. بەلاّم فەرشێکی گەورە سرنجی ڕادەکێشا. منیش بە عادەتی کاک مەلا ڕەسولی پێشنماز دەستێکم

ڕێخشاندو گوتم: بەراستی ماقوورێکی جوانە. کوورێکی مێرمندالی ژێر گوتی: «بەخوا ئەم قەرشە بۆ حیزب باشترە. بۆ نەیبەین بیخەینە ناو ماشینەکەوە»؟ لای نیوەشەو لە حاجی لەکەوە چووینە زەنگیاوا. تۆزێ لارێ بوو بە ڕۆژ دەبوایە لەوێ بمێنینەوە هەرچەند لە میاندواویش زۆر دوور نەبووین. نیوەشەو گەیشتینە ماڵە مستەفائاغای شیخ الاسلامی دەرگاو دەروازەی داخراو بەزەحمەت دەرگای دیوەخانمان دیتەوە. تەقە تەقیکی زۆر کەس وەدەر ناکەوێ. منیش بەتوورەیی قیژاندم گوتم: «ئەری بۆ کەس نایەتە دەر، خۆ بە قور نەگیراوە. مستەفا ئاغا خۆی هەر دەرگای کردەوە گوتی: «ئەوە ناکا کەریمی حیسامی بێ؟»

- ڕاست خۆیەتی، بەڵام دەرگای لێ ناکەیەوە. چووینە ژوورێ. بەو شەوە سەماوەرو نان‌و میزەو خزمەتی لە رادە بەدەر. سەید حەسەن کێشک‌و قەرەولی دامەزراندو ئێمەش لێی‌نووستین. لای چێشتانێ درەنگ هەستاین. خەبەریان هێنا کە چەند ژاندارم لە میاندواوێ چوونە دێی مەلا. عەجەمێک شکایەتی کردووەو چوە ژاندارمی هێناون. ئەو ڕێگایەی بۆ دێی مەلا دەچوو لە زەنگیاوا دوور نەبوو. بڕیارێکی بە پەلەو هەڵەمان‌دا. بە سەید حەسەنمان گوت: پێنج پێشمەرگە لەگەڵ خۆت بەرەو لەسەر ڕێگایان دانیشە. لەگەڕانەوەیاندا یا چەکیان کەو بە دیلیان بگرە، یا ئەگەر دەستیان کردەوە بیانکوژە. ڕێگا هەمووی باخ‌و باخات‌و کەندال‌و جۆگەی ئاوە. سەید حەسەن وەڕێ کەوت‌و ئێمەش لەسەر گردی زەنگیاوا بە پێنج شەش تفەنگەوە خۆمان قایم کرد. ماوەیەکی زۆری پێچوو، سەید حەسەن تەتەقەی کردو نەدیار بوو بگەرێتەوە. کاک ئومەر دەیگوت: «خۆی شاردۆتەوە کەس نەیبینێ. بەشەو دێتەوە». سەید حەسەن درەنگ پەیدا بۆوە دەیگوت: «ژاندارمە بە ڕێگایەکی دیکەدا گەراونەوە». چاک بوو لەو نیزیک میاندواوە تووشی شەر نەبووین. بەڵام ئیتر سەید حەسەنیش تا ماوەیەک کەوتبووە بەر گەمەو لاتاوو پلاران کە گۆیا

نەبونراوە خۆیان لی‌وەراست بێنێ.
لە گوندی قولقولە خەڵکی گوندی بە گشتی لە قەراخ گوندی لە جیێ رێنجەیەک کۆبوونەوە. لەکاتی قسەکردن دا بووم دوو هێلی‌کۆپتەر پەیدا بوون. خەڵک رای‌کرد بۆ نێو جۆگەو بن‌دارو پەناو پەسیوان. هەرچەندی هاوارم کرد هیچ نیەو بلاوەی مەکەن فایدەی نەبوو. هەر وەک لەو رەسمانەوە دیارە بە تەنیا راوەستام تا هیلی‌کۆپتەرەکان تی‌پەرین‌و خەڵک داوەروکاوە. بە کورتی پاش سەردانی شاماتو گوندەکانی شارویران گەراینەوە بۆ دەورووبەری شارو هاتینە شیلاناوێ. بریارماندا کە بنکەیەکی دایمی لەوێ دابمەزرێنین. یەک دو خێوەتی گەورەمان پەیدا کردن لە بن دارقەیسیەکان هەڵمان‌دان. شیرکەتێکی کشت‌وکاڵ لە شامات هەبوو. شەوێک ناردمان ماشینی نوسین‌و کاغەزو رونیۆمان هێنا. لەشارەوە خەبەریان هێنا کە دەوڵەت قەرارە رۆژی جومعە لە مزگەوتی سوور شورای شار دابمەزرێنێ. هەر ئەو رۆژە بەیاننامەیەکمان نووسی‌و رامانگەیاند کە شورای شار تەنیا پاش وەدەرنانی پاسداران بە ئازادی لە لایەن خەڵکەوە هەڵدەبژێردرێ. هەرکەسێکی لە هەڵو مەرجی ئێستادا لەشورای دەوڵەتیدا بەشداری بکا بەهاوکاری داگیرکەرو بە خائینی گەلی دەناسین. گورج بەیاننامە ماشین‌کراو بە رۆنیۆ ژمارەیەکی زۆر چاپکراو ناردمانەوە بۆ شار. کاغەزم نووسی بۆ کاک کەمالی دەباغی کە شەوی هەینی بە شێوەیەکی هەراو لە سەرانسەری شاردا بلاو بکرێتەوە. کاک کەمالیش رۆژی هەینی لە کۆبوونەوەکەدا بەیاننامەکە بخوێنێتەوە. رۆژی دوایی لە نێو باخەکە خەریکی دامەزرانی خێوەتەکان بووین دیتم کاک حوسێنی مەدەنی لەگەڵ پیاوێکی دیکە پەیدا بوو. سلاوو چاک‌و خۆشی‌و بەخێر هێنان. من پێشتر کاک حوسێنی مەدەنیم نەدەناسی‌و ئاشنایەتیمان نەبوو. بەلام لە دوورەوە دەمناسی بە تایبەت لە کتیبەکەیدا کە من وەلامم دابۆوە. بێجگە لەوە ماوەیەک پێش وەدەرکەوتنمان لە شار لە گوندی

قەرەقشلاخی شارویران کۆبوونەوەیەکی یەکێتی جوتیاران سازکرابوو. کاک حەمەدەمینی سیراجی لە لایەن حیزبەوە بەشداری کردبوو. کە هاتەوە گوتی: «حوسێنی مەدەنی دژی حیزبی دێموکرات هیچی تێدا نەهێشتەوە».

لە کاک حوسێنم پرسی: «خێرە شوکور، چۆنە تەشریفت هێناوە؟»

- حکومەت دەیەوێ شورای شار هەڵبژێرێ. دیارە باشترە ئەو کەسانە بێن بە ئەندامی شورای شار کە دۆستی حیزب بن‌و بە قازانجی خەڵک کار بکەن. بۆیە هاتورم ئەگەر ئێوە دژ نەبن خۆم دەست نیشان دەکەم‌و دەبم بە ئەندامی شورای شار. دیارە من دۆستی حیزبم.

- لام وایە حیزب لەو بارەوە بەیاننامەیەکی نووسیوەو ئەم شەو لە مەهاباد بڵاو دەکرێتەوە. سیاسەتی حیزب لەبارەی شوراو ئەو کەسانەی لەم هەڵو مەرجەدا دەبن بە ئەندامی شورا روون کراوەتەوە. ئێمە هاوکاری لەگەڵ ئەم حکومەتە بە خەیانەت دەزانین.

کاک حوسێن سارد بۆوە گوتی: «جا ئەو سیاسەتە راستە؟ ئەم دەوڵەتە ئێستا حاکمیەتی هەیە، باشتر نیە لە نێو ئەم حکومەتەدا کار بکرێ؟»

گوتم: ئەو دەولەتە داگیرکەرە، دژی کورد فتوای خەزا دراوە، ئێمە ئەو حاکمیەتە بە رەسمی ناناسین. کەوابوو شورایەکی ئەم دەولەتە هەڵیبژێرێ بە شورای خەڵکی نازانین.

کاک حوسێن بە هەناسەساردی گەڕایەوە، بەڵام خولاٌ هەڵتاگرێ کاتێک نوێنەرانی دەوڵەت بۆ وتو وێژ هاتبوونە مەهاباد. نامەیەکم بە کاک حوسێنی مەدەنیدا نارد بۆ مامۆستا شێخ عیزالدین. گیر نەبوو بردبوویە گوندی (بێژوێ)و جوابیشی هێنابۆوە. شەوی هەینی بەیاننامەکە لەسەرانسەری شار بڵاو کرایەوە. بەیانی لەمزگەوتی سوور کاک کەماڵی دەباغی رەوانی شاد دژی پێک هێنانی شورا قسەی کردو رای‌گەیاند کە هەر شورایەکی لەم هەڵو مەرجەدا پێک بێ شورای خەڵک نیە.

دوای ئەوە کە گەیشتینەوە شیلاناوێ بۆ ئاگاداری پتر لە وەزعی شار کاک نەوبدی موعینی چووە نێو شار. پاش دوو رۆژان گەرایەوە، قەمسەلەیەکی زۆر جوانی ئەمریکایشی بۆ من هێنابوو.

## گەرانەوە بۆ کۆنە دێ

پێش ئەوەی بێمە سەر باسی گەرانەوەی کۆنە دێ بە ئەرکی خۆمی دەزانم زۆر بە کەمیش بێ هەر باسێکی ماڵەحاجی بکەم. لەساڵی ۱۹۷۹وە هەر بیر لەوە دەکەمەوە کە دەبێ بتوانم جارێک وەک هەیە ئاوا باسی پیاوەتی‌و جوامێری‌و دڵئاواڵەیی حاجی بێنمە سەر کاغەزو بە گەلی کوردی بناسێنم. من لە کوردستان ماڵی گەورەو خانەدان‌و میوانگرو سەرئاواڵەم زۆر دیون. لە کوردستان زۆر ماڵی ئاوا هەبوون کە دەرگای مالیان بۆ ناسراوو نەناسراو، بۆ دۆست‌و بێگانە ئاواڵەو لەسەر پشت بووە. وەک ماڵە کاکە شیخە دێگەیی لە قەلادزە، سەید حەمەدەمینی عەینە مەلا، وسێنی حەمە شیخەی، قادری حاجی رەسوی قەرەبلاخی، میرزا مەحمودی شاوەلێی، حاجی مەلا مستەفای مەحمەشەیی‌و زۆری دیکەش، بەلام ماڵەحاجی لەگەڵ هەمووی ئەوانە فەرقی هەبوو. لەگەڵ پۆلێک پێشمەرگە ماوەی دوو مانگ لە ماڵی ئەو پیاوە بووم. لە راسیتدا ماڵەکەی ببوە بنکەی چیزب. لەو ماوەیەدا شەوو رۆژ، وەخت و بێوەخت پێشمەرگە بە کۆمەڵو بە تاک خەڵکی شارو دیهاتی دەوروبەر دەهاتن نامەیان دێنا کاریان هەبوو. من هەمیشە هەوڵم دەدا گورج وەلامیان بدەمەوەو بەرێیان بکەم. بەلام حاجی قەت جارێکیش نەبوو کە بێڵێ بە بێ نان‌و چا خواردن لە ماڵێ وەدەر کەون. بە نیوەشەو ماشێنێک

پێشمەرگە پەیدا دەبوو. نامەیەکیان دێنا، دەبوایە هەر بەو شەوە بگەڕێنەوە. نەمدەویست دەورەم ببێتە قەڵەباڵغ‌و حەشیمەت زۆر بێ. بەڵام حاجی بەو نیوە شەوە تا نان‌وچای نەدابانێ نەیدەهێشت بڕۆن. سیفارو بزەی شیرین قەت لەسەر لێوی دوور نەدەکەوتەوە. ژن‌و منداڵی شەووڕۆژ خەریکی دروستکردنی نان‌و چێشت‌و خزمەتی پێشمەرگەو کادرو ئەندامی حیزبی بوون. خۆزیا حیزبی دیموکرات قەدری ئەو فیداکاریەی دەزانی‌و نرخی خۆی دەدایە.

## کۆبوونەوە لە چوارگا

بۆ ئەوەی نەزم‌و تەرتیب‌و ڕێک‌و پێکی لە بزوتنەوەی پێشمەرگەدا هەبێ‌و ئاییننامەیەکی نێوخۆیی هێزی پێشمەرگە هەبێ داوام لە هەموو بەرپرس‌و مەسئولەکانی پێشمەرگەی ناوچەی مەهابادکرد کە لە گوندی چوارگا کۆبوونەوەیەک پێک بێنین. ڕۆژی ١٩٧٩/١٠/١٥ لە کۆنەدێوە چووم بۆ چوارگا. ڕاست لەو ڕۆژەدا کابرایەک بەناوی(زیباکەلام) وەک نوێنەری دەوڵەت هاتبووە ناوچەی ورمێ‌و سندووس‌و هاتبوە مەهاباد گۆیا لە وەزع بکۆڵێتەوە. لە مەهاباد کە دەچێتە فەرمانداری پێشمەرگە دەچن لە سالۆنی فەرمانداری دەیهێننە دەر ڕاست دەیهێنن بۆ چوارگا. کابرا کە لەوێ چاوی بەو هەموو پێشمەرگەو کۆبوونەوەو هاتووچۆیە کەوت سەرسام مابوو. زۆر دەترسا. ڕاپۆرتێکی لەسەر کوردستانی عیراق‌و کوردستانی ئێران‌و حیزبی دیموکراتی کوردستان پێ بوو. دیار بوو کوردی عیراقی بۆیان نووسیبوو. هێندێ سەنەدو بەڵگەی‌تری پێ‌بوون کە بۆ ئێمە بەکەڵک بوون. ئەوانەم لێ‌وەرگرتن‌و بەڕێک دڵخۆشیم داوەو پێم‌گوت هیچ مەترسێ ئازادت دەکەین. من سەنەدو بەڵگەکانم هێناو وامان دانا کە دوای دوو ڕۆژ زیبا کەلام بێننە کن من‌و بنێرم ئازاد بکرێ. بەڵام مەلا ڕەسول

هەر لەوێوە ناردبوویەوە مەهاباد و ئازاد کرابوو.

لەگەڵ کاک سەرگورد عەلیاری رەحمەتی ئایین‌نامەیەکی دوازدە مادەییمان بۆ کاروبارو هەڵسوڕانی پێشمەرگە ئامادە کردو لە کۆبوونەوەدا بە گشتی پەسند کرا. ئەفسەرە کوردەکان وەک کاک سمکۆ علیار، سەرگورد عەباسی، کاک کەریمی عەلیار کاک هەژار(جاوید قدر) لەوە نارەحەت بوون کە مەلا رەسول کراوەتە بەرپرسی گشتی هێزی پێشمەرگەی حیزب. کاک سمکۆ عەلیار نامەیەکی دوو لاپەرەیی بۆ نووسیبووم‌و گلەیی‌و داخی دڵی لە بێسەرەو بەرەیی هەڵرشتبوو. من نامەی کاک سمکۆو گلەیی ئەفسەرەکانی دیکەم بۆ دەفتەری سیاسی نارد. دوکتور قاسملو لە وەلامدا بۆی نووسیبوومەوە کە پێیان بڵێم: «دەبێ پشوویان لەسەر خۆ بێ، لە شۆرش‌دا هەموو شتێک رێک‌و پێک نیە». دوای سەردانی ئەم گوندانەی کە باسم کردن بەڵێنیم بە شوراکان‌دا کە هەر یەکەی یەک دوو تفەنگیان بۆ بنێرم. نامەم بۆ دەفتەری سیاسی نووسی‌و داوای تفەنگانم کرد. یەک دووجار ئەوەی من داوام کردبوو دەیاننارد. مەلا رەسول هەموو جارێ لەسەر رێگایە دوو سێیەکی دەگێڕانەوەو ئەوانی دیکەشی بۆ من دەنارد. دیارە مەلا رەسوڵ بێجگە لە مەفرەزەیەکی خۆی بەنێوی شەپۆل چەکداری دیکەشی راگرتبوون. بۆ ئەوەی لە مەسئولیەتی سیاسی بەشی پێشمەرگە نەجاتم بێ. نامەیەکم بۆ دەفتەری سیاسی نووسی‌و تکام لێکردن کە لە بەرپرسیەتی سیاسی هێزی چەکدار ئازادم بکەن. بەڵام دوکتور قاسملو لە نامەیەکدا نووسیبووی: «لە رۆژی ئاوادا واز لە بەرپرسی هێنان کارێکی تەواو نیە».

دوای کۆبوونەوەی چوارگا گەرامەوە کۆنە دێ. شەوێک لەگەڵ کاک ئومەر تەکبیرمان کرد بچینەوە نێو شارو دەستێک بوەشێنین. ناردمان سەید حەسەنی ورچان هات. ئامادەیی خۆی نیشان‌دا کە بچێتەوە نێو شار. ویستم لەگەڵی بچم برادەران بە توندی دژ وەستان. کاک ئومەر

گوتی: «خۆم دەچم. سەید حەسەن‌و کاک ئومەرو چوار پێشمەرگە کەوتنە ڕێ‌و منیش تا قەبرستانی لاچین دەگەڵیان چوومە خوار. لەوێ منیان گێراوەو ڕۆیشتن. گەرامەوە بۆ گوندێ بەڵام خەوم لێ نەدەکەوت. لەگەڵ حاجی دانیشتین تا لای بەیانی پەیدا بوونەوە. چووبوونە نێو باغی، لای چۆمی ئارپیجی‌یەک‌و هێندێ تفەنگیان دوور بە دوور بە پۆستی سەر ڕێگای میاندواوەوە نابوو لای دانیشسەرای کچان‌و گەڕابوونەوە. کاک ئومەر دەیگوت: «لە مەجبوریا تانگێکمان بە پەنادا هات. هەرچەندی بە سەید حەسەنم گوت کەلێنەو ئارپیجی‌یەکی لێدە زاتی نەکرد. پاشان چووە دوور بە دوور تفەنگ بە شاخیەوە دەنێ. سەری هاویشتبوە سەر سەید حەسەن‌و چەند ڕۆژ هەر پەوەمان ڕادەبوارد. کۆنەدێ نەک هەر ببوە بنکەی حیزب، بەڵکو ببووە کانگای ماڵی بەرنجوونی ڕێبەرایەتی بەرپرسەکانیش. ڕۆژێک مەلا سمایل لە بەری دایەو سێڵەکەوە پەیدا بوو، هاواری بوو کە پێشمەرگە هیچیان نیە. ٢هەزارتمەنی لێ ئەستاندم. مەلا ڕەسول دەینارد پارەی بۆ بنێرم. سەرگورد عەلیار دەینارد بۆ پارە سەرەرای ئەوانەش دوکتور قاسملو نامەیەکی نووسیبوو کە بە نانی ڕیشکی قر بووین پەنیرمان بۆ بنێرە.

برادەرێکمان هەبوو بە ناوی مەلا ئومەری سەوزی. زەلامێکی بەکارو نازاو بە دەستەوە. ئیتر باسی ئەوە ناکەم دەیانگوت کاتی خۆی هاوکاری ژاندارمەش بووە. لەو بارەوە تەقە هەڵگیرابوو. بە مەلا ئومەرم گوت پەنیر بۆ دەفتەری سیاسی پەیدا بکە. دوو ڕۆژان خۆی وون‌کرد بە حەوت کوپە پەنیرەوە هاتەوە. پەنیرمان لە کەرێکی بار کرد هەتا وزیندەری. کاک یوسفی ڕیزوانی وەک پیاوان پەنیری گەیاندە دەفتەری سیاسی‌و شوکور لە قات‌و قری دەرباز بوون.

ڕۆژێک بەیانی زوو خەریک بووم ڕیشم دەتاشی کەریم بێژەن بە هانکە هانک وەژوور کەوت‌و هاواری کرد: «وەدەر کەون تانگ گەیشتە

سەرتان». سەرم هەڵێناو بێتەوەی ماندوو نەبوونی لێبکەم گوتم: تانگی چی بەو بەهانەی ئەو هاتو هاوارە چی یە؟
- کورە هەستە وەدەر کەوە. ئێستا تانگ دەگاتە سەرمان.
- راوەستە با ریشم بتاشم جا هەڵدەستم.
حاجی‌و کاک ئومەرو پێشمەرگەکان چوونە دەرێ. کەریم هەر هاواری بوو. حاجی گەراوە گوتی:
- تۆ گاڵتە بە کاران دەکەی کەریم لەخۆوا تەهاتوە ئەوەتا دەنگی تانگ دێ.
- هەموو لەشکری ئێرانم وەسەر گەرێ هەتا ریشم نەتاشم، ئۆدکلۆنی لێ نەدەم نابزوم.
پێشمەرگەکان ئالۆزیان تێکەوت‌و یەک دوویەک هاتنە ژووریێ‌و:
- کاک کەریم چ بکەین؟
- راوەستن، ئێستا ئەوە تەواو دەبم‌و جا لە تانگ وەخۆ دەکەوین.
وردە وردە گرو کف دامرکایەوە، نە تانگ هات‌و نە هیچ. دەی ئەو هەرایە چ بوو؟ کەریم بیژەن بەیانی دێتە دەر کە بۆلای من بێ. لە مەجبورئاوا توشی تانگێک دەبێ کە بەرەو لاچین دەروا. وادەزانێ دێتە سەر کۆنە دێ. دەگەرێتەوە سواری ماشێن دەبێ بەلای وزیندەرێدا دێتە وزیندەرێ. ماشێن لەوێ بەجێ دیلێ بە پێیان بەغار دێ کە گەیشتە لای ئێمە هیلاک‌و زمانی دەرکێشابوو. مەسەلەی تانگ‌و هاواری کەریم بیژەنیش چەند رۆژێکی بۆمان ببوە باس‌و گەمەی رۆژانە.

## هاتنی خەلْخالی بۆ کوردستان

حکومەتی کۆماری ئیسلامی پەلاماری ئەرتەش‌و پاسدارانی بۆ سەر کوردستان پێکەم بوو، ئەمجارە سادقی خەلخالی یەکێ لە ئاخوندە خوێنخۆرە بەناو بانگەکانی ناردە کوردستان. لەسەرەتارە هێشتا هەر لە سنە بوو بەبانئامەیەکی بلاْو کردەوە لەسەرانسەری کوردستان خۆپیشاندان‌و کۆبوونەوەی قەدەخە کرد. لە سنەو پاوە دەستی‌کرد لە ئیعدامی ئازادیخوازانی کورد رۆژی ٧٩/١./٦ چوار کەسی لە سەقز ئیعدام کرد کە یەکیان کوردێکی ١٢ساڵە بوو بە برینداری لە خەستەخانەی هێنابوە دەرێ‌و ئیعدامی کردبوو. رۆژی ٧٩/١./٩ گەیشتە مەهاباد. ئێمە هەر ئەو رۆژە بەیانئامەیەکمان نووسی‌و ناردمان لەسەرانسەری شار بلاْو کرایەوە. خەلخالی هەر بۆ ئەوە کە مەهابادیش لە ئیعدام وەپاش خۆ نەداو خەلْک چاو ترسێن بکا. چەندکەسی بێتاوانی بە تاوانی بەهایگەری ئیعدام کرد کە نەکاریان بە سیاسەت هەبوو، نە لەگەلْ حیزبی دیموکرات پێوەندیان هەبوو. هاتنی خەلخالی نەک هەر خەلْکی مەهابادی نەترساند بەلْکو جمو جۆلی قوتابیان‌و لاوان دژی داگیرکەر لە نێوشار بە هێزتر دەبوو. بە تایبەت هەلْویستی مامۆستا مەلا کەریمی‌شاریکەندی شەهید بەخەلخالی پیاوکوژی نیشاندا کە کورد لەسەر مافی خۆی سوورەو ئیعدام‌و کوشتن چاوترسێنی ناکات. نارەزایی‌و بێزاری خەلْک پەرەی دەگرت. دەبوایە لە نیزیکەوە رێنوێنی‌و سەرپەرشتی بکرێ. هەرچەندە من رێگای سەعاتێک لە شاری دوور بووم‌و هەموو رۆژی دوو

سێجار کورەکان دەهاتن‌و خەبەری شاریان دەهێنا، بەلاّم بریارمدا بچمەوە نێوشار. سێ رۆژ پێش ئەوەی بچمەوە نێوشار نامەیەکم بۆسەرگورد عەلیار نووسی کە بەگوێرەی ئیمکان پێشمەرگە بنێرێتەوە نێوشار. مەلا رەسولی پێشنماز پەلێکی پێشمەرگەی سازکردبوو بەناوی مەفرەزەی شەپۆل، جاروبار دەیناردنەوە نێوشارو هەر ئەوەش خۆی ورەی خەلکی بەرز راگرتبوو.

خەبەرمدا کاک عەلی... ئەندامی یەکێتی لاوان ماشینێکی فولکس راگۆزنی هێناو هاتە کۆنە دێ. کاک ئومەرو حاجی‌و کورەکانی لەگەلم بوون زۆریان هەولدا کەجارێ بۆچوونەوەی شار پەلەنەکەم. خۆم پێ‌رانەگیرا. لیباسێکی فرەشیک‌و خاوێنم لەبەر کرد، دەمانچەیەکی نێرگانم بەرووتی دەبەر پشتێنی‌ناو بە تەنیا لەگەل‌کاک عەلی سوار بووم بۆنێوشار. رۆژی ٧٩/١/٢٢ چوومەوە نێو شاری مەهاباد. گەیشتینە مەجبوورئاوا، پاسدارو سەرباز خێوەتیان هەلدابوو رێگای شاریان کۆنترۆل دەکرد. خەلکێکی زۆریش لە دەورو بەریان وەستابوو. ماشینەکەیان راگرت‌و گوتیان وەرنە خوارێ. کەهاتمە خوارو خەلک چاویان بەمن کەوت قوت بوون‌و بوو بە سرت‌و خورت. بەجۆرێک ئیشارەم کرد کە بلاوەی بکەن. سەیری نێو ماشینەکەیان کردو کەوتنە پرسیاران:

- لە کوێوە دێن؟
- ئاغای گوندی پیر بەلەم دەچمەوەنێوشار.
- فەرموون سوار بنەوە.

ماشین کەوتە رێ‌و یەکسەر چووینە مالە کاک عەلی. بێ پشوودان هەر جێ‌بەجێ ناردم ئەندامانی کومیتەی شار ئەوانەی گەرابوونەوە کۆوە بن. هێندێکیان هاتن. کاک حەسەنی شەرەفی مابوو گوتیان لە نێو شارە. ناردم بە دوایدا، گوتبووی ئێستا دێم. چاوەروان بووین نەهات. بسوولەیەکم بۆ نووسی کە پێویستە فەوری تەشریف بێنی. گوتبووی:

«تۆزێ تاریک دابێ دێم». شەویش بەسەردا هات، بوو بەشەر هەر نەهات‌و ئێستاش هەر نەهات. لەوەزعی پێشمەرگەم پرسی، گوتیان زۆر هاتونەوە نێوشارو بەشەو لە کۆلانان دەگەڕێن. سەعاتی چواری ئێوارە بوو لەلای پردی بەرغو لە شیرکەتی نەوت بوو بەتەقە. ماشینێکی پاسداران لە میاندواوە دێت، دەگاتە کن شیرکەت‌و پێشمەرگە لێی رادەپەڕن‌و دەسرێژی لێ دەکەن. پاسدار هەڵدێن بۆ نێوشار، پێشمەرگە وەدوایان دەکەون‌و شارەوانیش پەلامار دەدەن. لەو پەلامارەدا شارەوانی ئاگر تێبەردرا، سەرۆکی شارەوانی بەناوی سەروان موحسنی بارجانی کوژرا. پێشمەرگەیەک بەناوی عەلی پیرانی بریندار بوو کوڕێکی سمایلی ئاژانیش کوژرا. خەڵک ڕژابوونە نێو شارەوانی‌و تالانیان کردبوو. هەر ئەو شەوە رووداوەکانی شارو چۆنیەتی شەرم بۆ دەفتەری سیاسی نووسی‌و بەرێم کرد. کومیتەی تەشکیلاتی شار کە چەند برادەرێک بوون شەو بە درێژی لە رووداوەکانی کۆڵینەوەو ئەرکی برادەرانی نێو شار دیاری‌کرا. بریار درا کاک ئومەر بێتەوە نێو شارو بەرپرسیەتی پێشمەرگەی نێوشارو نەزمی‌شار بگرێتە ئەستۆ. رۆژی دوایی بەیانی کاک م.ش. هاتە لام دەهەزارتمەنی پارمەتی بۆ حیزب هێنابوو. دوای نیوەرۆ گەرامەوە بۆ کۆنەدێ‌و کاک ئومەرم ناردەوە نێو شارو بڕیاردرا پێشمەرگەکان کۆ بکاتەوە لە گەرەک‌و کۆلانەکانی شار بنکەو شوێنی پێویستیان بۆ دیاری بکا. دوای حەوتوویەک رۆژی ٧٩/١٠/٣ لەگەڵ حوسێنی بەخشی گەرامەوە نێو شار لەماڵی کاک ک.ش. جێگر بووم. بەرلەوەی بەدووای رووداوەکاندا برۆم، بە پێویستی دەزانم باسی پیاوەتی‌و جوامێری‌و میوانداری ئەو برادەرە بکەم. ماڵەکەی ئەویش وەک ماڵی حاجی بوو بە بارەگاو بنکەی حیزب. ماوەی پتر لە دوومانگ پێشمەرگ‌و هەڤاڵدەرو میوانی دەرەوەو خەڵکی شارودەوروبەر شەوو رۆژ روویان لەو ماڵەدەکرد. بەراستی ئەگەر مەسەلەی ئازادی نیشتمان‌و مافی نەتەوەیی بێتە گۆرێ،

خەڵک بەدڵنو گیان تێوە دەچیٚو بۆ فیداکاری ئامادەبە. بێجگە لە میوانداریو هاتووچۆی پێشمەرگەو میوان بەخۆو بەبرای شەوو رۆژ کاتی خۆیان بۆ تێکۆشانو راپەراندنی کاری حیزب تەرخان کردبوو.

بەدوای مندا سەروان جاویدفەریش هاتەوە نێوشار. رۆژێک هەموو پێشمەرگەکانمان لە ماڵێکی کۆکردەوەو چوومە نێویانو بەخێرهاتنەوەم کردنو پیرۆزبایم لێ کردن. سەروان جاویدفەرم بە مەسئولی پێشمەرگەکانی نێوشار پێناساندن. بۆ خەرجی پێویستی بنکەکانو پێداویستی پێشمەرگە هێندێ پارەمدایە. بێجێ نابێ پیاوەتی نیشتمانپەروەرێکیتر لە بیر نەکەم هەرچەندە جێگای نیە ناوی بنووسم نەکا ئەو رژیمە هەر بمێنێو بیرەوەریەکانم بلاو بنەوە. ئەو برادەرە شەوێک هاتە لام. دەزگایەکی بچوکی بۆ هێنابووم کە لە تەنیشتی رادیۆیەکی سلیندەر قایم دەکرا. وادیارە لەم رادیۆیانەدا جێگای تایبەتی بۆ ئەم دەزگایە سازکرابوو. کاتێک دەزگایەکە دەخرا سەر رادیۆ، ئیتر تەواری وتو وێژی بێسیمی پادگانو قسەی هیلیکۆپتەرو تەلیفونی سەحرایی وەردەگرتو رادیۆکەش زەبتی دەکرد. لەشکر لەبەری مەحمودکانیو لەسەر داشامەجید دامەزرابوو، من رۆژانە وتوو وێژی پادگانم لەگەڵ بنکەکانی لەشکر تۆمار دەکردو ئێستاش ئەو شریتەم هەر پاراستوەو جمو جۆڵی ئەرتەشم بە جاویدفەر رادەگەیاند.

رۆژی ۷۹/۱۱/۲ ستونێکی ئەرتەشی بە سێ تانگەوە لە مياندواوە دەهات بۆ مەهاباد. لە دەروازەی شار کەوتە بەر پەلاماری پێشمەرگە شەرەکە توند بوو، نێوشاری گرتەوە. دوکانو بازار داخران. من هەموو فەرمانو نەخشەی ئەتەشیم لە پادگانەوە کە دەدرا یادداشت دەکردو دەمنارد بۆ پێشمەرگەکان. نەیانهێشت تانگەکان بگەنە سەربازخانە. بە ئارپیجی دوویان ئاگردانو یەکیان تەسلیم بوو. پێشمەرگە سواری بوونو بردیان بۆلای بەیرەمو وزیندەرێ. مندالو پیاوی گەورە سواری بوونو

تانگیان داپۆشیبوو. لەپادگانەوە بە هیلی‌کۆپتەرەکانیان دەگوت: تەقەی لێ بکەن. کابرای هیلی‌کۆپتەر دەیگوت: هەموو منداڵن سواری بوون، لە چی بدەم، منداڵ دەکوژرێ، چەکدار لەسەری دیار نین. یان چەند ئەفسەر لە داشامەجیدەوە دەیانویست بە هیلی‌کۆپتەر رابکەن بچنەوە پادگان. هێندێک سوار ببوون، یەک دوویەکیش جێگا نەبوو دەیانویست خۆی پێوە هەلاوسن. کابرای هیلی‌کۆپتەر بە پادگانی دەگوت: «من ناتوانم ئەو هەموو عالەمەی لەگەڵ خۆم بێنم، زوو نەبەمەوە لەوانەیە لێم بدەن». ترسیان کەوتبوە بەر لە پادگانەوە فەرماندرا بە تانکەکانی مەحمودکانی کە بگەڕێنەوە بۆ پادگان. من گورج خەبەرم دا بە کەریم خالداری کە لە باخی سیسەوە بە دۆشکە تانگەکانی بەری مەحمودکانی دەکوتا. پێشمەرگە خەریک بوون بپەڕنەوە بۆ بەری مەحمودکانی‌و دەستیان بەسەردا بگرن. دوو رۆژبوو دوکان‌و بازار داخرابوو. هێندێک لە ریش سپی‌و کەیخودای شار هاتنە لام. گوتیان: «دوو رۆژە دوکان‌و بازار نیە، خەڵک نان‌و خواردەمەنی نەماوە. هاتووین تکا بکەین باشەر رابگیرێ تا خەڵک بتوانێ خواردەمەنی دابین بکا». ئەوان هەر لەوێ بوون کاک حەسەنی باباتاهیری تەلیفونی کردو گوتی: «وزعی شاری لەبەر نەبوونی نان‌و خواردەمەنی ئاڵۆزە، ئێستا خەڵکێکی زۆر هاتونە فەرمانداری‌و لێرە کۆبوونەوە. تکایە باشەر رابگیرێ. ئێستا کە ئەو تانگانە شکاون ئەو خۆی سەرکەوتنێکە سەرکەوتنێکە، خۆ ناکرێ پادگانیش پەلامار بدەن». بە فەرماندارم گوت: «تۆ لەگەڵ فەرماندەی پادگان قسە بکە. بەو شەرتەی شەر رادەگرین کە پاسدارو ئەرتەش لە پادگان نەیەنە دەرو هاتوچۆی تێوشار نەکەن». کاک حەسەنی باباتاهیری پاش چەند دەقیقەیەک تەلیفونی کردو گوتی: «فەرماندەی پادگان موافەقەتی کردوە». پسولەیەکم نووسی بۆ کاک ئومەرو بۆ کەریم خالدار، کە تەقە رابگرن‌و پێشمەرگەکان لە شوێنی پێویست ئامادە بن‌و بحەسێنەوە.

نامە گەیشتە پێشمەرگەو تەقە راگیرا. دیارە پێشمەرگەکانیش هیلاک بیوون. رۆژی سێیەم بوو باران دەباری‌و شەریش بەردەوام بوو. لە هەمووی داخدارتر ئەوە بوو لە جەنگەی شەردا پێشمەرگە دەهات‌و داوای فیشەکی دەکرد. منیش نە فیشەکم هەبوو، نە ئاگام لە چەک‌و چۆڵ بوو. لەکاتێکا پەسەدان سندووق فیشەک لە پادگان راگوێزرابوو، کەس نەیدەزانی لە کوێن. مەگەر ئەوانەی دزیبوویان‌و شاردبوویانەوە. لەو کاتە تەنگانەدا سەید حەسەنی ورچان پیاوەتیەکی باشی کرد. لەکاتی تالاتی پادگاندا دیاربوو دەستی خۆی وەشاندوە، فیشەکی هێناوەو چالی کردوون. کە زانی بۆ فیشەک زۆر تەنگاوین، هاتە لام گوتی: «ئێستا فیشەکت بۆ دێنم». چوو سێ سندووق فیشەکی ژ. سێ‌و سندوقێک نارنجۆکی سەری ژ.سێ‌ی بۆ هێنام. سندوقێکم لە پێشمەرگەکان دابەش کرد، لام وایە لە رۆژێکی تەنگانەدا، کاتی شەری سەقز کاک ئەمیری قازی تەنگاو ببوو فیشەکی وەگیر نەدەکەوت. ئەگەر پێم گوت: من سندووقێک فیشەکت دەدەمێ لە خۆشیان گەشایەوە. سندووقێکم دا بەو، لە شەری شنۆیەش برادەرانی شنۆ بۆ چەک‌و فیشەک هاتبوون، لام وایە پێنج تفەنگ‌و سندووقێک فیشەکیشم دا بە برادەرانی شنۆیە.

دوای وەستاندنی تەقە کاک ئومەر هاتە لام. هیلاک‌و ماندوو گوتی: «خومەینی هەتا هەتایە دەبێ مەمنونت بێ. سێ تانکت بۆ نەجاتدا، ئەو پسولەت نەناردبایە ئەو سێ تانکە گیرابوون». ماوەیەکی زۆر ئەوەی هەر بەچاوی دادەدامەوە، یادی بەخێر.

شەو تەلیفونم کرد بۆ جەڤاڵدەری رۆیتر لە تاران. باسی شەرو شکاندن‌و گرتنی تانکەکانم پێ راگەیاند. رۆژی دوای شەر راگرتن بە درێژی باسی شەرو پێوەندی لەگەڵ هەڤاڵدەری رۆیترم بۆ دەفتەری سیاسی نارد. دوکتور قاسملو بەیاننامەیەکی کورتی ناردبوو کە بە تەلیفون بە هەڤاڵدەرانی بیگانەی رابگەینم.

# پاسەوانی کرماشانی

کاتێک ئێمە لەشار وەدەر کەوتین، پاسەوانی نێوشار کە زۆربەیان خەڵکی مەهاباد بوون لە هاوکاری لەگەڵ رژیم خۆیان دەبوارد. حکومەت ناردبووی ۷۰ پاسەوانی کرماشانی بۆ شارەوانی مەهاباد هێنابوو. کە گەرامەوە نێوشار بەیاننامەیەکمان نووسیو بە پاسەوانەکانی کرماشانیمان راگەیاند کە لە ماوەی ٢٤ساعەتدا مەهاباد بەجێ بێڵنو بگەرێنەوە بۆ کرماشان. دەنا دەکوژرێنو خۆیان بەرپرسن. بەیاننامەکە لەسەرانسەری شار بڵاو کرایەوە. کورەکانی قوتابی جنێویان پێدەدان، بەردیان پێدادەدان. پاسەوانی کرماشانی بە کۆمەڵ دەچنە لای فەرماندارو دەڵێن: «ئێمە لە مەهاباد نابێو ئەشێ هەر ئەمرۆ بمانێرنەوە بۆ کرماشان». کاک حەسەنی باباتاهیری تەلیفونی کردو گوتی: «پاسەوانە کرماشانیەکان ئامادەن بگەرێنەوە. ئوتوبوسیان بۆ گیراوە، تکایە یان دوو پێشمەرگەیان دەگەڵ بنێرە تا لە سەقزیان تێدەپەرێنێ، یا نامەیەکیان بۆ بنووسە با برۆن. ئێستا لە پێش فەرمانداری کۆ بوونەوەو چاوەروانی رۆیشتنن». خەریک بووم بنێرم کە دوو پێشمەرگەیان بدەنێ، خەبەریان هێنا کە پێشمەرگەی کۆمەڵە پاسەوانی کرماشانیان گرتونو بردوویانن دەمزگەوتێکیدا رایان گرتون. سەرم سوورما. کۆمەڵەی چی؟ ئەو هەموو شەرو هەراو کێشە بووە چەکدارێکی کۆمەڵە دیار نەبووە، ئێستا هاتوون خەڵک دەگرن. ناردم بەدوای مەلا رەسوڵدا. هاتبوە نێوشارو مەفرەزەی

چەکداری خۆی لەگەڵ بوو. مەسەلەی کرماشانیەکانم لەگەڵ باسکردو گوتم: تکایە بچو لەمزگەوت بیانهێنە دەرو سواری ئوتوبوسیان بکەو پێشمەرگەیان دەگەڵ بنێرە تا لە بۆکان تێ‌دەپەرن. مەلا رەسول دەچێ لە مزگەوت دەیانهێنێتە دەرو سواری ئوتوبوسیان دەکاو بەرێیان دەکا. برادەرانی کۆمەڵەش بە گەورەیی خۆیان هیچ ناڵێن. پاش دوو سێ رۆژ چەند کەسی شار هاتن‌و داوایان کرد کە بۆ ئەمنیەتی شارو هێدی‌و هێمنەتی با پێشمەرگە بەخۆرایی بەچەک‌و ئارپیجی‌یەوە لەنێوشار نەسوورێنەوەو دەست لەکاروباری خەڵک وەر نەدەن. کەپرسیمان گلەییک بوو لەبرادەرانی کۆمەڵە. مەلا رەسوڵ‌و کاک ئومەرو سەروان جاویدفەر دەچن لەگەڵ برادەرانی بەرپرسی پێشمەرگەی کۆمەڵە دادەنیشن‌و داوایان لێ دەکەن کە کارێکی وا نەکرێ وەزعی‌شار ئالۆز بێ. دیار بوو گەیشتبوونە یەک‌و داواکەیان قبوڵ کرابوو.

## رادیوی دەنگی کوردستان

دوای گەرانەوەم بۆ نێوشار کەوتمە بیری سازکردنی رادیۆیەک کە بتوانین دەنگی حیزبی دیموکرات بە خەڵک رابگەیەنین. لەگەڵ برادەران کەوتینە پرس‌و راوێژو چارەدۆزینەوە. وتیان کابرایەک لە وەتەمیشێ هەیە، رادیۆیەکی سازکردووە دەنگی دەکیلۆمیتر دەروا. ناردم کابرایان هێنا. گوتی: «ئەگەر ئانتێنێکی بلیند هەبێ، دەتوانم دەزگایەک وەکار بخەم کە دەنگی تا دەکیلۆمیتر بروا. پێنج سەدتمەنم دابەر گوتم برۆ هەرچی پێویستە لەبازار بیکڕە. برادەر چووبوو ئانتێنێکی بەرزی کڕیبوو. لە گەرەکی شوانان لە ماڵەخزمێکی دەستی کردبوو بەکار. لە دوام هاتن کە بچم بیبینم. کە چووم لە حەساری ماڵە خزمێکی کە دارچنارێکی بەرزی بارێکی تێدا بوو. ئانتێنەکەی لە دارچنار قایم کردبوو. سیمەکەشی بردبوە ژوورێ. رادیۆیەکی ئاندریای گەورەی دانابوو، شریتی دەخستە سەر مەگنەتۆفۆن‌و دەیلکاند بەرادیۆکەوە دەیگوت دەنگی دەروا. دەبوایە تاقی کەینەوە. گەرامەوە شەوێ ناردم دوو کیژی خوێندەوار هاتن لەگەڵ برادەرێک کە لە تەلەفیزیۆنی مەهاباد کاری دەکرد. هێندێ دروشم‌و یەک دوو شیعرو سرودم نووسینەوەو دوای دوو سێ‌جار مەشق‌و دووپاتە کردنەوە تۆمار کرا. ناردم بۆ برادەری موهەندسی دارچنار. هەر بەو شەوە هێندێ برادەرو ئاسیارمان راسپاردن کە شەو سەعاتی نۆ گوێ لە دەنگی کوردستان رابگرن. رۆژی دووایی کەوتنە پرسیاران. لە

دەورووبەری مزگەوتی سوورو-لە مەجبوورئاوا چەند ماڵ دەنگیان بیستبوو، هیچی‌تر، دیتم فایدەی نیە. ناردم بە دوای موهەندیس خەیاتی‌دا کە موهەندیسی ئیدارەی ژاندارمەری مەهاباد بوو، بەڵام نەڕۆیشتبوو. موهەندسی بێ‌سیمو کارەباو موخابەرات بوو. موهەندیس خەیاتی گوتی: «دەزگایەک لە ئیدارەی تەلیفۆن‌و تیلگرافی مەهابادا هەیە کە دەتوانێ لەسەر شەپۆلی ٤١میتر دەنگ بڵاو کاتەوە. بەڵام یەکجار قورس‌و زەلامەو ڕاگواستنی زەحمەتە. دەزگایەکی دیکەش هەر لەو بابەتە لە تیلگرافخانەی سەردەشتی هەیە. ئەگەر ئەوانە وەدەست بێنی دەتوانین دەنگی کوردستان بۆ سەرانسەری ئێران بڵاو کەینەوە»، تەلیفونم کرد بۆ سەردەشت، برادەرێکمان لە تیلگرافخانە کاری دەکرد. گوتی: «ئەو دەزگایە لێرە نەماوەو بردوویانەتەوە بۆ ورمێ». دەبوایە ئەوەی مەهاباد بەرینە دەرێ. شەوێک چوار پێنج برادەری تێکۆشەرو نیشتمانپەروەر کە بەداخەوە ناکرێ ناویان بێنم، لۆریەک دەبەن کابرای دەرکەوان دەگرن‌و بە زەحمەتێکی زۆر بە دە دوازدەکەس دەزگای زەبلاح‌و گەورە دێننە دەرو دەیبەن بۆ گوندی لکبن‌و بەهانی گەرانەوە. ئەمجا دەبوایە دوو کەس پەیدا بکەم کە بچن فێر بن‌و کاری لەسەر بکەن ناردم دوو خوارزای خۆم هێنان. یەکیان عومەری ئەمینی کە خوێندکاری زانکۆی هەوانیرۆزی ئەرتەشی ئێران بوو، دوای شۆڕش هاتبۆوە کۆسەکەریزی‌و ئەگەر بەجێی نەهێشتبا ئێستا لە هەوانیرۆزی ئێراندا ئەفسەر بوو(بەو شەرتەی زیندو ماباوە) تەحویلی موهەندیس خەیاتیم دان‌و بەرێم کردن بۆ لکبن. نامەیەکم نووسی بۆ سەید ڕەسولی ڕەحمەتی کە هەموو توانای خۆی بۆ وەکارخستنی رادیۆ بەکار بێنێ. موهەندیس دەڵێ ئەم دەزگایە دەبێ لە جێگایەکی بەرز دابنرێ. بەتراکتۆر دەیبەن تا بەر گەڵی کێلێ‌بابەکرناوی. لەوێوە خەڵکی لکبن بەشانی بە زەحمەتێکی زۆر وەسەری دەخەن بۆ بەرقەدی شاخی. سەید ڕەسول خانوو جێگایان بۆساز دەکا. ڕۆژی ١٩٧٩/١١/٦(١٥ی

خەزەلوەری١٣٥٨) رادیۆی دەنگی کوردستانی ئێران بەرنامەی تاقی کردنەوەی (ئازمایشی) خۆی بڵاو کردەوە. پاشان درەنگ‌تر دەزگایەکەمان گوێزتەوە بۆ کەڵە گۆکەو ئاخرەکەشی چۆوە دۆڵی شێخانو بەرەسمی دەستی بەکار کرد. جا ئێستا کاربەدەستانی حیزبی دیموکرات کە هیچیان ئاگایان لە دامەزراندنو سازکردنی رادیۆ نەبووە، ١٥/٦/١٩٨٠ بە رۆژی بڵاو بوونەوەی دەنگی کوردستان دادەنێن. واتە ئەو کاتەی کە بۆ جاری دووەم کومیتەی ناوەندی لە مەهاباد وەدەر کەوتووە لە دۆڵی شێخان بارگەو بنەی پە عەرزی داداوەو پێیان وایە ئەوانیش رادیۆیان سازکردووەو بە هاسانی لە ئاسمان بۆیان هاتۆتە خوار. بێ ئەوەی زەحمەتو تێکۆشانی ئەو کەسانەی کە رادیۆیان سازکردوە یادیشی بکەن.

پێش ئەوەی بەرنامەی تاقیکردنەوەی رادیۆ بڵاو بکرێتەوە خەبەری بردنە دەری دەزگاو موهەندیس خەیاتیو هێنانی خوارزاکانمو تێکۆشانی برادەرانی بەشدارو ئیبتکاری سەید رەسو بۆ خانو و جێگاو رێگام بۆ دوکتور قاسملو نووسیو مزگێنیم دایە. ئەو دەم لە نامەیەکی کورتدا سوپاسی هەموو ئەو کەسانەی کردبوو کە لەو کارە مەزنەدا بەشداریان کردوە. لە ساڵەکانی دوایی‌دا کاتێک لە چیا بووین هەتا تووشی موهەندیس خەیاتی دەبووم دەیگوت: «خودا بتگرێ کەریم تۆ منت توشی ئەو دەربەدەریە کرد، دەنا منو چیاو شۆرش»؟ فەقیرە دوای ئەوە ئیتر نەبوێرا بچێتەوە ورمێو تووشی چیاو دەربەدەری بوو.

چەند رۆژ دوای شەری مەهاباد هاتمە دەرو چوومە فەرمانداری سەری کاک حەسەنی باباتاهیری بدەم. لە پێش فەرمانداری خەڵک لێم کۆبوۆوەو بەخێرهاتنەوەو پشتیوانیو دڵسۆزی ئەم خەڵکە بەراستی سەربەرزی کردبووم. پاش ئەوەی لە فەرمانداری هاتمە دەر چوومە کتێبفرۆشی ئاغای موفەقی کە سلاوێکی لێ بکەمو هێندێ دەفترو کاغەزێشی لێ بکرم. کە وەژوور کەوتم ئاغای موفەقی بە عادەتی رووخۆشی خۆی هەستاو بە

گەرمی بەخێرهاتنی کردم‌و پیرۆزبایی لیٚکردم. هێندێ کاغەزو دەفتەرم لیٚکری‌و پاشان گوتی:
- یاخوا بەخێر بێیەوە، عەرزێکیشم هەبوو.
- فەرموو.
- کاتێ دەفتەری حیزب لەشاری بوو مەلا عەولای حەیاکی بایی ١٤٦..تمەن کاغەزو شتی دیکەی بۆ دەفتەری حیزب لیٚکریبووم، پوڵەکەشی نەدراوە. ئەگەر کارێکی وا بکەی ئەو پولەم پیٚبگات زۆر مەمنون دەبم.
- بەچاوان زۆر هاسانە، ئێستا ..٥٤تمەنی دیکەم بدەیە، کارتێکی ....٢تمەنیت دەدەمێ کە یارمەتیت بە حیزب کردووە.
- جا چۆن؟ بەخوا چاکت بۆ وسوڵ کردم!!.
- لەم هەلۆ مەرجەدا باشترین ڕێگا هەر ئەوەیە.
ڕۆژێک دوای نیوەرۆ لە دوام هاتن بچمە کۆنە دێ. حاجی خەبەری دابوو کە پێویستە شەو بگەمە وێ. کە چووم دیتم غەنی بلوریان‌و سەید حەسەنی هاشمی هاتوونەوە. غەنی حەقدە تفەنگی کلاشنیکۆفیشی لەگەڵ خۆی هێنابوو. ڕۆژی دووایە ناردمان ژن‌و منداڵەکەشی هاتنە کۆنە دێ. پاش دوو ڕۆژ مامە غەنیم سواری ماشێن کردوو هێنامەوە نێو شار. شەو هەر لەکن من مایەوە ڕۆژی دووایی چووە ماڵی خۆیان.
ڕۆژی ١٩٧٩/١١/٢ هەڤاڵدەری ڕۆیترو گۆڤاری نۆیسێرو‌ێر تەلیفونیان کرد، وەزعی شاری مەهابادیان پرسی. پاشان گوتیان: «دەستەیەکی نوێنەری دەوڵەت ئەورۆ دێت بۆ مەهاباد، ئێوە لەگەڵیان دادەنیشن؟» گوتم: ئێمە هیچ داتیشتنێک ڕەت ناکەینەوە. وەزعی شار ئارامەو دەتوانن بێن.
ڕۆژی ١٩٧٩/١١/٣ لەگەڵ غەنی بلوریان بۆچاو پێکەوتنی دەستەی نوێنەرایەتی دەوڵەت کە لە سەباغیان‌و موهەندیس سەحابی‌و داریوشی

فروهەرو شەکیبا نوستانداری سنه پێک هاتبوو، داوایان کردبوو بچین بیانبینین چووینه سەدی مەهاباد. دیاره چاوپێکەوتنی ئێمه هەر دیتنی سەرەتایی‌و باسی گشتی بوو. بەتایبەت فروهەرو سەحابی لەگەڵ غەنی لەبەندیخانەدا بوون‌و ئاشنایەتیان هەبوو. ڕۆژی دوایی نامەیەکم بۆ دوکتور قاسملو نووسی‌و نامەیەکیشم بۆ مەلا شیخ عیزالدین نووسی‌و دام بە کاک حوسینی مەدەنی بردی بۆ بیڕۆی. هاتنی دەستەی نوێنەرایەتی دەولەتیم پێی ڕاگەیاندن. ڕۆژی دووایی جارێکی دیکەش لەگەڵ مامه غەنی چووینەوه دیداری دەستەی نوێنەرایەتی. ڕۆژی ١٩٧٩/١١/٥ برادەرێکی کوردی سەر بەروکنی دووی ستادی لەشکر لە مەهاباد هاته لام‌و خەبەری دامێ که ئەرتەش دەیەوێ بە بیانووی گەران له پادگان وەدەر کەوێ‌و بێته نێو شار. گورج خەبەرم‌دا بە کاک کەریمی عەلیارو جاوێدفەر که خافلگیر نەبن‌و له ئامادەیی دابن. تەلیفونم کرد بۆ سەباغیان‌و پێم‌گوت: «وەک بیستوومانه لەشکر خەیالی جم‌و جۆلی هەیه. تکایه بە فەرماندەی لەشکر رابگەیێنه که ئەرتەش له پادگان وەدەر نەکەوی. چونکه ئێمه ڕێگا نادەین لەشکرو پاسدار بێنه نێوشار. ئێستا که ئێوه لێرەن با تووشی شەر نەبین.

دوکتور قاسملو له وەلامی نامەی مندا مەلا عەولای ناردبوو، نووسیبووی: «له وتووێژدا پەلە مەکەن. ئێمه وا لێره خەریکین -لەگەڵ مەلا شیخ‌عیزالدین‌و کۆمەڵەو چریکی فیدایی دەستەی نوێنەرایەتی خەڵکی کورد بۆ وتووێژ پێک بێنین. لەو سەروبەندەدا لەنێوشار دەنگزیان بلاو کردەوه کەوا حیزبی دیموکرات دەیەوی بە تەنیا لەگەڵ دەولەت وتووێژ بکا و کۆمەڵەو چریک دژی وتووێژن‌و تووشی شەرو کێشەی نێوخۆ دەبن. چەند کەس تەلیفونیان بۆ من کردو مەترسی خۆیان لەم باسه دەربری. دیاربوو تەلیفونیان بۆ مامه غەنیش کردبوو. مامه غەنی گوتی: «وام پێ‌باشه داوا له خەڵک بکەی له فەرمانداری کۆبنەوه. بچی لەسەر

هاتنی نوینەرانی دەوڵەت و سیاسەتی حیزب قسەیان بۆ بکەی، روونیان بکەیەوە، با وانەزانن ئێمە بە بێ ئاگاداری خەڵک دەبزووینەوەو شتیان لێ دەشارینەوە».

رۆژی ٧٩/١١/١٣ لەسەر بانگەوازی تەشکیلاتی مەهاباد ح.د.ک. کۆبوونەوەیەکی گەورە لە فەرمانداری پێک هات. خەڵکێکی یەکجار زۆر بەشداری کردبوو. کە چوومە پشتی میکرۆفۆن بە شانازیەوە دەڵێم چەپڵە ریزان و شوعاردان سەرخۆشیان کردم. لە پێشدا وتارەکەم بە سوپاس لە خەڵکی مەهاباد و زەحمەتکێشانی کوردستان دەست پێکرد کە بە پشتیوانی و یارمەتی ئەوان و بە هێزی پێشمەرگە ئێمە هاتووینەوە مەهاباد و لەگەڵ خەڵک کۆ دەبینەوە. سوپاسی مامۆستایانی تایبیم کرد کە لە تێلگرافخانە مانیان گرت و پشتیوانیان لە سیاسەتی حیزب کرد.

پاشان لەسەر سیاسەتی حیزب و هاتنی نوینەرانی دەوڵەت قسەم کرد و رام گەیاند کە وتووێژی ئێمە لەگەڵ دەوڵەت بە بەشداری هەموو هێزەکانی کوردستان دەبێ و رێگا نادەین دەوڵەت ناکۆکی بخاتە نێو ئێمە. ئێمە بۆ راگرتنی شەڕ و رێککەوتن لەگەڵ حکومەت بەشەرتی قبولکردنی پێشنیارەکانی حیزب بە هەموو تواناوە هەوڵدەدەین. ئێمە نامانەوێ لەسەر حیسابی شەڕ و خەڵک بە کوشتدان و ویرانی شار و گوندەکانی کوردستان ببینە قارەمان. دەمانەوێ لەسەر حیسابی خێر و خۆشی میللەتەکەمان و وەدەست هێنانی مافی نەتەوایەتی گەلی کورد بە خزمەتکاری خەڵک بناسرێین». وتاری من بە گەرمی پێشوازی لێکرا. پاشان مامۆستا مەلا کەریمی شاریکەندی هەستا. من بەخێرایی کورتەی قسەکانی مامۆستام بەمجۆرە لەدەفتەری رۆژانەمدا نووسیوەتەوە. مامۆستا گوتی:

«سڵاو لە میللەتی کورد. سڵاو لەو زەحمەتکێشانەی کە خوێنی خۆیان لە پێناو ئازادیدا رشتوە. سڵاو لە حیزبی دیموکرات کە لەسەر سیاسەت حیسابی کردو ملی پێوەنەنا. پاش پەلامار بۆسەر مەهاباد ئێمە

پشتبوانیمان له حیزبی دیموکرات کرد. به کاربەدەستانی دەوڵەتمان ڕاگەیاند کە قەزاوەتی ئێوە لەسەر حیزبی دیموکرات هەڵەیە. له موخابرات متحصن بووین. به تەلیفون به شەریعتمەداریمان گوت: ئەوە ئیسلامەتی نیە. هەرچەندە خەلخالی بێئیحترامی بەمن کرد، بەلأم لەبەر خاتری میللەتەکەم چوومە لای. دام نەتواندو دارای مافی میللەتم کرد. ئێستا له حیزبی دیموکرات پیرۆزبایی دەکەم، سیاسەتی بەخەرج داوە. لەسایەی ئەو سیاسەتەیە کە ئێستا میللەتی کورد له مافی خۆی نیزیک بۆتەوە. ئێمە قەدری ئەوانە دەزانین کە سالەهای ساڵ نیشتمانیان بەجێ هێشتوە، ئێمە زەحمەتی ئەوانە لەبیر ناکەین. سیاسەتی حیزبی دیموکرات تەئیید دەکەین کە ڕێگای ئاشتی گرتۆتە بەر. تا ئەو جێگایەی کە مەسەلە به وتووێژ حەل بێ ڕێگای دیکە هەڵەیە. ئەوانەی به گێرەشێوێنی دەیانەوی ڕێگای ئاشتی تێک بدەن به هەڵە دەچن. هیوادارم نەزەری خۆیان بگۆڕن».

له کۆبوونەوەدا یەک دوو کەسی‌تر لەسەر- پشتیوانی له سیاسەتی حیزب قسەیان کرد. ئەو ڕۆژانەی کە دەستەی نوێنەرایەتی حکومەت له مەهاباد بوون ڕۆژانه دەهاتنه نێوشارو دەگەرانو خەڵکیان دەدواند. لەو گەرانو دیتنو ئاخافتناتەدا بۆیان دەرکەوتبوو کە هێزی سەرەکی لەکوردستان حیزبی دیموکراتەو خەڵک پشتگریەتی. هەر بۆیەش لەسەر ئەوە پێیان دادەگرت کە تەنیا لەگەڵ حیزبی دیموکرات وتووێژ دەکەن.

# پەیامی خومەینیو راوەستانی شەر

پاش گەرانەوەی دەستەی نوێنەرایەتی لە ژێر تەئسیری پشتیوانی خەڵکو خەباتی ئازایانەی پێشمەرگە وە بێ‌هێزی حکومەت لە زاڵ بوون بەسەر کوردستاندا خومەینی ٧٩/١١/١٧(٢٦ی خەزەڵوەری ١٣٥٨) لە وتارێکی خۆیدا کە گۆیا لەسەر کوردستان ئەویان بە فریو بردوە، گوتی کوردەکان چییان دەوێ بیاندەنێ. فەرمانی خومەینی لەنێو خەڵکدا بە گەرمی پێشوازی لێ‌کرا. کومیتەی مەرکەزی بەناوی پلینۆم لە دزلەتو کۆبوونەوەیەکی گەورەی پێک هێنا. هەرچەند چەند ئەندامی کومیتەی ناوەندی تێدا بەشدار نەبوون. دیارە دوکتور خەبەری ناردبوو کە ئێمە «مەلا رەسوڵو مەلا سمایلی حاجیو کەریمی حیسامی» بچن بۆ پلینۆم. بەلام کاتەکەی وادانابوو کە دەرەتانی ئەوەمان نەبوو وا بە گورجی بگەینە پلینۆم. لەم کۆبوونەوەیەدا بەیاننامەیەک بە ناوی کومیتەی ناوەندی حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئیران پەسند کرابوو. لە بەیاننامەکەدا گوترابوو: «وێرای پشتیوانی لە هەڵوێستی دژی ئیمپریالیستی خومەینیو تەئییدی پەیامی ٢٦ی گەلارێزانی خومەینی لەسەر وەزعی کوردستان، ئێمە لەم رۆژەوە تا بیست رۆژ شەر رادەگرینو داواش لەدەوڵەت دەکەین کە ئەویش شەر بوەستێنێ. دیارە درێژەی شەر وەستاندن پێوەندی بە چوونەدەری پاسدارانەوە هەیە لە کوردستان. هەروەها لە بەیاننامەکەدا گوترابوو کە ئەگەر هێزێکی بێگانە ئێران پەلامار بدا، ح.د.ک.ا

سنورەکانی ئێران دەپارێزێ».

پاش پلینۆم دوکتور قاسملو نامەیەکی نووسیبوو کە بچمە میراوێ. لەگەڵ مەلا ڕەسوڵو کاک ئومەرو کاک کەمالی دەباغیو چەند برادەری‌تر سوار بووین چووینە میراوێ. دوکتور قاسملوش لەگەڵ هێندێک کەسانی دەورو پشتی هاتبوونە میراوێ. لەوێ کۆبوونەوەیەک بە بەشداری کادرو سەر لقو فەرماندە هێزەکان پێکهات. من لە نیوەرۆکی بەیاننامەی پلینۆم کە بۆنی شەری لێدەهاتو شەرتی ڕەستاندنی شەری چوونە دەری پاسداران لە کوردستان دانابوو بە توندی ڕەخنەم گرت. لەگەڵ دوکتور قسەکەمان تۆزێ لێک هەڵبەزینەوە. لەبەرانبەردا دوکتورقاسملو ڕەخنەی لەوە هەبوو کە منو غەنی بلوریان نەدەبا چاومان بە نوێنەرانی دەوڵەت کەوتیایە. دوکتور بە عادەتی خۆی لای زۆر گران بوو لە نێو خەڵک ڕەخنەی لێ بگیرێ ئیتر زوو داینواندو مەسەلەکەمان هێنا سەر ئەو باسە کە داخوا دوکتور بێتەوە نێوشار یا هەر لە دەرەوە بێ. من گوتم: بوونی دوکتور قاسملو لە دەرەوەی شار قایدەی نیە، پێویستە هەر ئەورو لەگەڵ ئێمە بێتەوە بۆ شار. ئێستا کە نوێنەرانی دەوڵەت داوای وتووێژ دەکەن ئێمە پێویستە بە جیددی خۆ ئامادە بکەین. هێندێک لە ماستاوکەرانی دەوروبەری دوکتور دەیانگوت جارێ باش نیە دوکتور بێتەوە نێوشار نەوەکوو خوا نەخواستە تووشی ناخۆشیەک بێ. ئاخرەکەی هاتینە سەر ئەو باوەرە کە دوکتور بگەرێتەوە. لە میراوێ بە کۆمەڵ چووینە ماڵی براکانی مەلا عوسمانی میراوەیی شەهید (جەلال) سەرەخۆشیمان لێکردن. پاشان چەند ماشین سوار بووینو کەوتینە رێ. لە گوندی قەرەخدری لە ماڵی مام ڕەسولی عبدالصمدی لاماندا نانی نیوەرۆمان خواردو لای ئێوارێ گەیشتینە قازیاوا. دوکتور گوتی: «باش نیە وا بە ئاشکراو بە چەند ماشین پێشمەرگەوە بچینەوە نێو شار. تۆ بچۆ ماشینێکی سواری پەیدا بکەو وەرەوە سوار دەبین بە بێدەنگی دەچینەوە نێو شار. با

پێشمەرگەکان پاشان خۆیان بکەرێننەوە». سوار بووم بە تەنیا چوومەوە مەهاباد. لە پێش فەرمانداری تووشی حەسەن ئاغای میهمانداری بووم. دابەزیم پاش سڵاووچاک‌وخۆشی لێم پرسی چ دەکەی؟ کارت هەیە یان نە؟

- کاریشم هەبێ بۆ هەموو خزمەتێک ئامادەم.

- کارم بە ماشێنەکەتە، ئەگەر خۆشت لەگەڵم بێی هەتا گوندی قازیاوا باشتریشە.

- ماشینی خۆم لەپێش فەرمانداری داناو لەگەڵ حەسەن‌ئاغای میهمانداری چووینە قازیاوا. دوکتورمان سوار کردو سێ‌نەفەری گەڕاینەوە. حەسەن‌ئاغا بە دڵ دەیویست بچین لە ماڵی ئەوان دابەزین. دوکتور ماڵی سەلیمی بابانزادەی پێ باشتر بوو. چووینە ماڵە کاک سەلیم‌و لە جێی جاران دابەزین.

ڕۆژی ٢٩ی خەزەڵوەری ١٣٥٨- ١٩٧٩/١١/٢٠ بە بۆنەی دەرچوونی پەیامی خومەینی‌و هاتنەوەی کومیتەی ناوەندی بۆ نێوشار لە مەیدانی چوارچرای مەهاباد کۆبوونەوەیەکی گەورە سازکرا. پێشتر لە ڕێگای رادیۆمەهابادەوە بە تەواوی خەڵکی شارو گوندەکانی کوردستان راگەیندرابوو. لە هەموو شارەکانی کوردستانەوە بۆ بەشداری لەو کۆبوونەوە هەراوەدا خەڵک ڕوویان کردبووە مەهاباد. دوکتور قاسملو لە وتارێکی بەنرخ‌و دوورو درێژدا سیاسەتی حیزبی دیموکراتی روون کردەوەو وێڕای پشتیوانی لە پەیامی خومەینی رایگەیاند کە «ئێمە بە پەیامی ئیمام لبیک دەڵێین». پاش تەواو بوونی وتاری دوکتور قاسملو هاتمە پشتی میکرۆفۆن‌و ئەم وتارەی ژێرەوەم خوێندەوە. پێویستە وەبیری خەمەوە لەو کاتەدا کە خومەینی بە درۆو بە ناچاری پەیامی ٢٦ی خەزەڵوەری ناردبوو، گەلی کوردیش بە هێزە سیاسیەکانەوە بۆ ئاشتی‌و چارەسەرکردنی مەسەلەی کورد پێشوازیان لە پەیامی خومەینی دەکردو

ئامادەیی خۆیان بۆ وتوویژ رادەگەیاند رۆژنامەکانی تاران چەند وتارێکی بێشەرمانەو ئاژاوەچیانەی پڕ لە درۆ و دەلەسەی چەمران‌و زەهیرنیژادیان بلاو کردبۆوە. من ناچار بووم لە وتاری خۆمدا باسیان بکەم. ئەمەش دەقی وتارەکەی خۆمە. (لەوانەشە زۆر کەس بلێن هەر باسی خۆی دەکا!)

«خوشک‌و برایانی بەرێزا هاونیشتمانانی نیشتمانپەروەرو تێکۆشەرا رۆژێکی پیرۆزە رۆژێکە لە سایەی خەباتی ح.د.ک لە سایەی پشتیوانی بێوێنەی گەلی کوردی قارەمان‌و هەلمەتی ئازایانەی پێشمەرگەی ح.د.ک-وە پێک هاتوە.

هاڤال دوکتور عبدالرحمن قاسملو سکرتیری کومیتەی گشتی کومیتەی ناوەندی ئەوەی پێویست بوو رایگەیاندو سیاسەتی حیزبی روون کردەوە. من دەمەوی باسی چەند مەسەلەیەک بکەم هیوادارم بە گوێی شورای ئینقلابی ئیسلامی ئێران بگاتەوە. ئیمام خومەینی لە پەیامێکی تاریخی‌دا کە بۆتە هۆی پێکهاتنی ئەمرۆژە ئێمە لێرە کۆبینەوە بە ئاشکرا رایگەیاند کە هێندێ کەسی ئاژاوەچی‌و دژی ئینقلاب بیروباوەری ئەویان تێک داوەو بۆتە هۆی ئەم وەزعە کە لە کوردستان پێک هاتوە.

ئێمە حەقمانە بپرسین بەراستی بۆ سزادانی ئەو کەسانەی کە ئەمرۆش هێشتا لەم حالەشدا دەیانەوی تۆوی ناکۆکی بچێنن، شورای ئینقلاب چی کردوە؟ خۆتان دەزانن گەلی کورد لە سەرانسەری کوردستان ئەوە سێ‌رۆژە پاش دەرچوونی پەیامی ئیمام دەستی کردوە بە شایی‌و هەلپەرین. دیارە بەلای منەوە رەنگە لاوەکان لە مێژ بێ داوەتیان نەکردبێ‌و زۆرتر ئەم شایی‌و هەلپەرینە لەبەر ئەوە بێ. دەنا باشترە ئێمە لەناوەرۆکی ئەو پەیامە حالی بین‌و بزانین ئەو چی گوتوەو ئێمە دەگەینە کوی؟ بۆ ئێمە زۆر جێی داخە راست لەو کاتەدا کە ئیمام ئەو پەیامەی ناردوەو .گەلی کورد پشتیوانی لێ دەکاو دەیەوی تۆوی ئاشتی لەگەلْ براکانی‌تر بچێنێ،

ئاغای چەمران کە ئەندامی شورای ئینقلابی ئیسلامیە، ریزە وتارێک بلاو دەکاتەوە کە فری بە ئاشتیو دۆستایەتی نێو میللەتانەوە نیە. هێندێ بوختان بە کورد دەکا کە ئەسلەن هەر پیاوێ بێشەرمی وەک چەمران دەتوانێ ئەو درۆیانە بهۆنێتەوە. چاکە نمونە بێنینەوە. چەمران دەلێ: «پێشمەرگەی ح.د.ک بە زۆر لە مالێکی وەژور دەکەونو داوای نان دەکەن. کابرا چونکە لایەنگری کۆماری ئیسلامی بووە نانیان ناداتێ. پێشمەرگە کابراو ژنەکەی دەکوژن». چەمران باسی ئەوە ناکا کە پێشمەرگەی ح.د.ک. چۆن لە ئامێزی میللەتەکەیاندا حاواونەوەو خەباتیان کردووە. پێشمەرگەی ح.د.ک. بۆیە چەکی هەلنەگرتووە خەلک بکوژێ، بەلکو بۆخزمەتی خەلکو بۆ دیفاع لە شەرەفو ناموسی کوردایەتی چەکی دەست داوەتێ. ئاغای چەمران هەر بەو بوختانەوە ناوەستێو دەنوسێ: «هێندێ لە رۆژهەلاتناسو نوسەری بێگانە دێن کتێب بۆ کورد دەنوسن، زمان بۆکورد دادەنێن، تەحریکیان دەکەن، تا میللیەتو زمانی خۆیان وەبیر بێنەوە، پاشان کوردستانێکی ئازاد تەشکیل بدەن».

هەر ئەم بوختانو درۆیە بوون کە زەینی ئیمامیان پەشێو کردو وەزعێکی ئاوا ناخۆشیان لە کوردستاندا پێک هێنا. ئاغای سادقی قوتبزادە کە ئەندامی شورای ئینقلابە بە جوانی گوتوویە: «زۆر کەس هەن کە ئێستاش پیلان دەگێرنو ناهێلن ئاشتی لە کوردستان بەردەوام بێ. داوای کردوە کە ئەوانە تێکدەرن با خەلک دژی ئەوانە راپەرێ». ئێمە بە تەواوی لەگەل قسەکانی قوتبزادە موافقینو داوای ئیجرای دەکەین. ئەوانەی وەک چەمرانو زەهیرنیژادو خەلخالیو حەسەنین دەبێ لە ریزی میللەت دەربکرێنو سزا بدرێن.

هاونیشتمانانی بەرێز! لە سایەی سیاسەتی ئاشتیخوازانەی رێبەرایەتی ح.د.ک. و تێکۆشانی رێکخراوە پێشکەوتوخوازەکانی سەرانسەری ئێران،

هەروەها لە سایەی تێگەیشتوویی هێندێ لە شەخسیەتەکانی ئەندامی شورای ئینقیلاب، پەیامی ئیمام بۆ ئاشتی بڵاو کرایەوە. هەر وەک: سکرتێری گشتی حیزب رایگەیاند، ئێمە بە گەرمی پێشوازی لەو پەیامە دەکەین. چاوەروانی ئەوەین شورای ئینقلابی ئیسلامی ئیران هەر وەک ئیمام گوتوویە بە گورجی داخوازەکانی گەلی کورد کە داخوازی رەوانو داخوازی میللەتێکن بە درێژایی مێژوو خەباتی بۆکردووە تا بە ئازادی بژی، قبولی بکەن. ئێمە دڵنیاین هەیئەتی حوسنی نیەت کە بۆ کوردستان دەگەرێتەوە هەموو پێشنیارەکانی حیزبی ئێمە کە پێشنیاری میللەتی کوردن قبول بکا. وەزعێکی ئەوتۆ پێک بێ کە ئەو ئاشتیەی ئەمرۆ لە کوردستان هەیە بەردەوام بێ.

خوشکو برایانی بەرێزو خۆشەویستا بەم بۆنەوە دەمەوێ باسی مەسەلەیەکی گرنگی دیکە بکەم. ئەم وەزعەی ئیمرۆ لە کوردستان پێکهاتووە بەو مانایە نیە کە منداڵەکان نەخوێننو لەشارو دیهات منداڵ نەچنە مەدرەسەو مەدرەسەکان دابخرێن. بەتایبەت جێگای داخە کە لە هێندێک گوند مەدرەسەکانیان هەڵوەشاندووە. دەمەوێ لێرەدا رابگەیێنم بەراستی شەرمە بۆ ئەو گوندانەی کە مەدرەسەیان تێدا وێران کراوە. من داوا لە هەموو هاونیشتمانان دەکەم، داوا لە هەموو قوتابیە ئازیزەکان دەکەم، هەروەها داوا لە هەموو مامۆستا بەشەرەفەکان دەکەم کە مەسەلەی دەرسو خوێندن زۆر بە جیددی بگرن. وای لێ نەیەت کە ئێمە مەجبور بین بە پێشمەرگە بسپێرین لەشارو دیهات ئەو کەسەی منداڵی نەنێرێتە قوتابخانە سزا بدرێت. ئێمە کە داوای خودموختاری دەکەین، خودموختاریمان بۆ ئەوەی ناوێ کە منداڵەکانمان نەخوێنن. خودموختاریمان بۆیە دەوێ، منداڵ بخوێنن میللەتەکەمان بەختەوەرو تێرو تەسەڵ بێو بە ئاسایشی بژیو بگاتە ریزی ئەو میللەتانەی کە ئەمرۆ ژیانی ئازاد دەبەنە سەر. لە لایەن تەشکیلاتی مەهابادی ح.د.ک.وە سوپاسی ئەو برا

گوندیانە دەکەم کە بە شەوو رۆژ کادرو پێشمەرگەی حیزبیان پەنا داوەو خزمەتیان کردوە. سوپاسی ئەو مەلاو مامۆستا ئاینیانە دەکەم کە لەم خەباتەدا بە تەبلیغات‌و بە کردەوە لەگەڵ میللەت بوون‌و پشتیوانیان لە سیاسەتی ح.د.ک. کردوە. سوپاسی خەڵکی بەشەرەفی مەهاباد دەکەم کە بە دڵەوە لە هەموو هەڵو مەرجێک‌دا پشتیوانی خەباتی حیزبی دیموکرات بوون. سوپاسی حیزبی دیموکرات دەکەم کە توانیویەتی وەزعێکی ئەوتۆ لە نێو میللەت‌دا پێک بێنێ کە یەک دڵو یەک گیان بۆ دیموکراسی بۆ ئێران‌و خودموختاری بۆ کوردستان تێ‌بکۆشێ. سەرکەوتوو بن».

لەم کۆبوونەوە مەزنەیەدا پاش من مەلا رەسولی پێشنمازیش وەک بەرپرسی هێزی پێشمەرگە وتارێکی خوێندەوە.

## دەستەی نوێنەرایەتی خەڵکی کورد

دوای ئەوەی کە دەستەی نوێنەرایەتی دەوڵەت هاتە مەهابادو منو غەنی بلوریان لەگەڵیان دانیشتین، پێشنیاری وتووێژیان کرد. دوکتور قاسملو هێشتا لە چیا بوو لەگەڵ مەلاشیخ عیزالدینو کۆمەڵەو چریکی فیدایی (دەستەی نوێنەرایەتی خەڵکی کورد)یان بۆ وتووێژ لەگەڵ حکومەت دامەزراند. بەم چەشنە کە مەلا شیخ‌عیزالدین سەرۆکو دوکتور قاسملوش وێژەری دەستەی نوێنەرایەتی بێ. لەلایەن حیزبی دیموکراتەوە ئەم پێنج کەسە بە ئەندامی دەستەی نوێنەرایەتی دیاری کرابوون:
١- دوکتور قاسملو. ٢-غەنی بلوریان. ٣-کەریمی حیسامی. ٤-مەلا عەولای حەباکی. ٥-غەزیزی ماملێ.

ئاغای صارم‌الدینی صادق‌وزیریش وەک راوێژکەری دەستەی نوێنەرایەتی خەڵکی کورد لە تارانەوە بانگ کرابوو کە لە کۆبوونەوەکاندا بەشداری بکا. صادق‌وزیری وەک حقوقیەکی زاناو شارەزاو لێهاتوو گەلالەی خودموختاری کوردستانی ئێرانی لە ٢٦مادەدا ئامادە کرد کە لە لایەن دەستەی نوێنەرایەتی خەڵکی کوردەوە پەسندکرا. بۆمانەوە لە مێژوودا رادەقی ئەم گەلالەیە لە پاشکۆی ئەم بەرگەدا بلاو دەکەمەوە.

دوای گەرانەوەی کومیتەی ناوەندی بۆشارو تێکۆشان بۆچارەسەر کردنی مەسەلەی خودموختاری لە رێگای ئاشتیو وتووێژەوە، نوێنەرانی دەوڵەت گەرابوونەوە بۆ کوردستانو گەلالەی (خودگەردانیان) هێنابوو، بەلام بلاویان نەکردبۆوەو خەڵک نەیدەزانی چی‌تێدایە. هەر لە سەرەتاوە

لەگەڵ هاتنی ناوی (خودگەردانی)، تەبلیغاتێکی بەربلاو دژی ئەم زاراوەیە دەست پێکرا. لە لایەکی‌تر راست لەو سەروبەندەدا رایەڵکەی هاتووچۆی نوێنەرانی ڕێکخراوە چەپو بەناو دیموکراتە ئێرانیەکانی هیچ لەدەست نەهاتوو بۆ مەهاباد دامەزرا. هەر رۆژە دەستەو کەس‌و ناکەسێک دەهاتە مەهابادو لای حیزبی دیموکرات تەنیا پێشنیاری سەیرو ویشک‌و بێ‌ناوەرۆکیان لەگەڵ خۆیان دەهێنا. دەستەی نوێنەرایەتی خەڵکی کورد بریاری‌دابوو لەگەڵ نوێنەرانی دەوڵەت وتووێژ بکا. ئەوانەی لە تارانەوە دەهاتن، جاری مەسەڵەی (شورای خەڵکەکانی ئێران)یان لەتاران دەهێنا گۆری‌و یا پێشنیاری هاوکاری (هەموو هێزەکانی دیموکرات)و یا پێکهێنانی (جەبهەی بەناوو بێ‌کار)یان باس دەکرد. رۆژێک ئاغای مهدی تارانچی‌و یەک دوو کەسی‌تری سەربە موجاهیدو قولەڕێکخراوی بەناو چەپ هاتبوونە مەهابادو لام وایە لەماڵی کاک مونتەقیمی قازی میوانداری‌و جێگایان بۆسازکرابوو. هەر لەویش باس‌و کۆبوونەوە لەگەڵیان دەست پێکرا. مهدی تارانچی دەستی کرد بە باسی (پارمەتی بە بزوتنەوەی کوردو هاوکاری لەگەڵ دیموکراتەکانی ئێران)و لەو قسانەی کە بەکردەوە قەت ئەنجامێک نادەنە دەست. من وەدەنگ هاتم‌و گوتم: دوکتور قاسملو ئەوە تەشریفی لێرەیە. بەلام من لەباس‌و ئاخافتن‌دا نەختێ ڕک‌و راست‌و رەنگە قسەکانیشم تۆزێ توند بن. ئێوە کە ئێستا وا بەگەرمی باسی هاوکاری‌و یارمەتی دەکەن، دەبوایە لەکاتی تەنگانەدا بیر لە یارمەتی کوردستان بکەنەوە. کاتێک کوردستان کەوتبووە بەر پەلاماری درندانەی رژیم، دەبوایە یارمەتی‌و پشتیوانیتان نیشان دابایە. خومەینی دژی میللەتی کورد فتوای خەزای دا، ئەو هێزو ڕێکخراوانەی ئێستا تۆ باسیان دەکەی تەنانەت دژی ئەم فتوا نارەوایە خۆپێشاندانێکیان ساز نەکرد، بەیاننامەیەکیان بلاو نەکردەوە. مەسەڵەی کوردی دەڵێ: «دۆست لە رۆژی تەنگانەدا دەناسرێ». من دژی هاوکاری

نیم، بەلأم ناشتوانم بە قسەو پێشنیاری بێ‌پشتیوانە دلْخۆش کەم.

لەو سەرو بەندەدا لە تاران دەست درێژی بۆسەر مالْی شەریعەتمەداری کرابوو. حیزبی جمهوری خلقی مسلمان لە تەوریز راپەری بوو. لەشارەکانی ئازەربایجان بە پشتیوانی لە ئایەتولا شەریعتمەداری خۆپێشاندان دەست پێکرابوو. رادیۆ تەلەفیزیونی تەوریز کەوتبووە دەست لایەنگراتی شەریعتمەداری. لە تەوریزو لە شارەکانی‌تر ئازەربایجان خەلْک دەستی دابوە چەک‌و شارەکان کەوتبوونە ژێر کۆنترۆلی خەلْک. بەراستی ئاسۆیەک بۆ پەرەگرتنی راپەرینی ئازەربایجان‌و کزکردنی حکومەتی تاران بەدی دەکرا. کومیتەی ناوەندی حیزبی دێموکرات بۆ لێکۆلینەوەی وەزعی ئازربایجان کۆبوونەوەی پێک هێناو گەیشتە ئەم بریارە کە لە راپەزینی خەلْکی ئازەربایجان پشتیوانی بکا. بریاردرا بەیاننامەیەک بۆ مەحکوم کردنی سوکایەتی بە شەریعتمەداری بلأو بکرێتەوە. بەیاننامەیەکیش بۆ پشتیواتی لە راپەرینی خەلْکی ئازەربایجان‌و حیزبی جمهوری خلقی مسلمان بنووسرێ‌و دەستەیەکی نوێنەرایەتی حیزبی دێموکرات بچێتە تەوریزو لە شارەکانی سەر رێگاش بەیاننامەی حیزب بلأو کاتەوە. برادەران بریاراندا کە من‌و کاک ئەحمەدی قازی بچین. کاک تاهیری عەلیار کە بەلْگەو دۆکومێنتی خوێندنی لە دانیشگای تەوریز مابوونەوە، دەرفەت بوو لەگەلْمان بێ. هەم یەک بێ لە دەستەی نوێنەرایەتی حیزب‌و هەم کارەکەی خۆشی راپەرێنێ.

کاک جەمیلی شافعی کە هەمیشە بۆ کارو زەحمەتی حیزب ئامادە بوو، ماشینێکی ساز کردو تەلیسێک بەیاننامە خرانە نێو ماشین‌و رۆژی ١٩٧٩/١٢/٣ بەرەو تەوریز کەوتینە رێ. هەر لە پردی تەتەهو پەرینەوە، ئازربایجان لە حالی راپەریندا دەهاتە بەرچاو. چەکدار بە بازنەی سور لە قۆلْدا لەسەر رێگا راوەستابوون‌و هاتوچۆیان خستبوە ژێر پشکنین‌و چاوەدێری. ئیمە درۆشمێکی گەورەمان بە ناوی دەستەی

نوێنەرایەتی حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران لە پێش ماشێنەکە هەڵاوەسیبوو. لە میاندواوەوە تا گەیشتینە تەوریز لە چواڕێگاو لە نێو شارەکانی سەرڕێگا بەیاننامەمان بڵاو دەکردەوەو خەڵک پێشوازیان دەکرد.

لای ئێوارە بوو گەیشتینە تەوریزو چووینە ماڵی سمایلی ئازەرمیر. کاک سمایلی ئازەرمیری خوالێخۆشبوو، برادەرێکی چەپی پێشکەوتوخوازی ئازەربایجانی بوو. ساڵەکانی ٥٤-١٩٥٥ گیرابوو پێکەوە لە بەندیخانەی ورمیٚ دابووین. کوڕێکی مەردو ڕەندو تێگەیشتوو. دوای ئازادی ئیتر وەدوای ژیان‌و کاسبی کەوتبوو. زۆر زوو خودای تەعالا سەروەت‌و سامانێکی باشی بەسەردا ڕژاندبوو. لە شامات کارخانەی خشت‌بری سازکردبوو، لە تەوریزو میاندواو دەزگایەکی شازی بۆخۆی پێک هێنابوو. لەکاتی شەڕی سیٚمانگەو لە پاشانیش یارمەتیەکی باشی بەحیزب دەکرد. ماڵی ئازەرمیرمان دیتەوەو لێی وەژوورکەوتین. لە ڕادەبەدەر بەهاتنمان شاد بوو. جیٚبەجیٚ لەگەڵ حیزبی جمهوری خلقی مسلمان پێوەندی گرت‌و خەبەری دانیٚ کە دەستەی نوێنەرایەتی حیزبی دیموکرات هاتوە. بەڵام ڕوونی کردینەوە کە ئەوانە شۆڕشگێر نین‌و تەسلیم دەبن.

داوایان کرد بچینە بارەگای حیزب. سمایلی ئازەرمیر وەپێشمان کەوت تەوریز لە جم‌و جۆڵدابوو. دەورو بەری بارەگای حیزب پڕ بوو لە چەکدارو هەر زمەی دەهات. ڕادیۆ لە دەست ڕاپەریوەکان‌دابوو، بەڵام بێجگە لە قورئان‌و قسەی قۆر چی‌دیکەی بڵاو نەدەکردەوە. لە بارەگای حیزب ئاغای عەداڵەتی‌و ئاغای فەرشی وەک نوێنەری حیزبی جمهوری خلقی مسلمان پێشوازیان لیٚکردین. مەلایەک‌و چەند کەسی‌تریش هاتن‌و کۆبوونەوە دەست پێکرا. ئێمە بەیاننامەی حیزبی دیموکراتمان دانیٚ‌و پێشنیارمان کرد لە ڕادیۆی تەوریز بیخوێننەوە. لە بەیاننامەکەدا نوسرابوو:

«ئێمە لە مافی خودموختاری بۆ خەڵکی ئازەربایجان پشتیوانی دەکەین». مەلا دژی بەکارهێنانی وشەی خودموختاری بوو. هەرچەندی باسمان کردو روونمان کردەوە کە ئەمە حیزبی دیموکرات دەیڵێ‌و ئەسەی ئێوە نیە، فایدەی نەبوو، مەلا پەتی نەدا. ئاخرەکەی ئەم دێڕەیان لێ‌لابردو ناردیان لە رادیۆ بخوێندرێتەوە.

من گوتم: تەورێز رابردوویەکی شۆڕشگێری هەیە. سرودو شیعری نیشتمانی و شۆڕشگێری بە زمانی ئازەری زۆرن، بۆچی لە رادیۆ نایانخوێننەوە؟. دیار بوو رێبەرایەتی بزوتنەوە کەوتبووە دەست کەسانی هەڵپەرستو مەسەلەی مافی نەتەوایەتی یا خودموختاری لای ئەوان جیدی نەبوو. ئێمە لە کۆبوونەوەدا بووین خەبەریان هێنا کە لە تارانەوە ئەرتەش دەنێرن‌و لە فڕۆکەخانە دادەبەزێ. ئەوان دەیانگوت فڕۆکەخانە بەدەست ئێمەیەو پڕە لە چەکدارو ناتوانن دابەزن. شەو قوڵەی اللهو اکبر لە سەربانان مێشکی خەڵکی بردوو. دەرکەوت کە هەرای حیزبی جمهوری خلقی مسلمان هەر فیشاڵ بوو، شەریعتمەداری سەری دانواندو تەورێز بێ‌ دەستکردنەوە تەسلیم بوو.

ئێمە شەو لە ماڵی ئازەرمیری خۆشمان رابواردو سبەی گەڕاینەوە بۆ مەهاباد. سەفەرەکەمان دوو قازانجی هەبوو، یەکەم کاک تاهیری عەلیار بەڵگەو دۆکومێنتەکانی زانستگای وەگیر کەوتەوە، دووەم ئازەرمیر زەپتێکی لە رادە بەدەر جوان‌و نایابو بە کەڵکی بە دیاری دا بەمن.

لە راپۆرتێکدا کە لەسەر سەفەری تەورێزو هەڵوێستی رێبەرانی حیزبی جمهوری خلقی مسلمان بۆ کومیتەی ناوەندیم نووسیبوو، روونم کردەوە کە هەرای تەورێز جێگای هومید نیەو هیچی لێ شین نابێ.

رۆژی ١٩٧٩/١٢/١٠ دەستەی نوێنەرایەتی خەڵکی کورد لە ماڵی مەلا شێخ‌عیزەدین لەبارەی چۆنیەتی وتووێژ لەگەڵ حکومەت کۆبوونەوەی پێک هێنا. نوێنەرانی حیزبی دیموکرات ئەم چەند خاڵەی خوارەوەیان وەک

بنچینەی وتووێژ لەگەڵ حکومەت پێشنیار کرد:
- ئەو پەری نەرمش نیشان بدەین.
- ئەو پەری ئامادەبیمان هەبێ.
- لەسەر چونە دەری پاسداران لە شارەکان پێدابگرین.
- گەلالەی پێشنیاری خودگەردانیان لێ‌وەربگرین‌و بلاوی بکەینەوە با خەڵک لێیان تێبگا.

نوێنەرانی کۆمەڵەو چریک بە مامۆستاوە هەلویستیان تۆزی توندتر بوو. لەکاتێکا حیزبی دیموکرات دەیویست هەتا بکرێ لە رێگای هێمنانەوە مەسەلەی خودموختاری چار بکری‌و تووشی شەر نەبینەوە. بەلام کۆمەلەو چریک‌و مەلا شیخ‌عزلدین لەو کاتەدا کە وتووێژیان رەد نەدەکردەوە بەلام لایەنگری توندو تیژی‌و تەنانەت ئاژاوەش بوون. ئاغای صادق‌وەزیری کە وەک راوێژکەر لە کۆبوونەوەکاندا بەشدار دەبوو دەیگوت: «لە ئوسوڵدا نەشێ ئیستقامەت بکەین. لە سەر هەقی میللەتی کورد نابێ خۆشل‌کەین».

لە ماوەی شەروەستان‌و وتووێژدا پادگانی مەهاباد بە حیزبی دیموکراتی راگەیاندبوو کە کاروانێکی ئەرتەشی لە میاندواوەوە هێندێ پەتوو تەلیس‌و شرەو بەرە دێنێ بۆ مەهاباد. داوای کردبوو کە پێشمەرگە رێگای پێ‌نەگرێ. دیاربوو بە پۆستی پێشمەرگەی سەر رێگا گوترابوو رێگایان پێ‌نەگرن. کاروان هاتبوو گەیشتبووە کەلکی بەگزادان، چەند پێشمەرگەی کۆمەڵە رایان گرتبوون. دوکتور قاسملو تەلیفونی کردو گوتی: «گۆیا ماشینی ئەرتەشیان لە رێگا راگرتووە، ئەوانە پرسیان بە ئێمە کردووەو بە ئیجازەی ئێمە هاتوون. بچوو بزانە بابگەنە پادگان». سوار بووم چوومە کەلکی بەگزادان. بە پێشمەرگەی کۆمەڵەم گوت: ئەم کاروانە نیزامیە چەکی پێ‌نیە، پاشان پرسیشیان بە حیزبی دیموکرات کردوە، تکایە رێگایان بدەن با برۆن. دەبێ سوپاسیان بکەم رێگایان بەرداو کاروان

کەوتە ڕێ. بەڵام ئەمجارە لە دەروازەی شار پێشمەرگەی حیزبی دیموکرات پێشیان پێ گرت. دابەزیم هەرچەندی قسەم لەگەڵ کردن ڕێگایان بەر نەدا. تەلیفونم کرد بۆ کومیتەی نیزامی حیزب. کاک حامیدی گەوهەری هات پێشمەرگەکانی کۆکردەوەو کاروان گەیشتە پادگان. بەڵام چەند ڕۆژ دواتر من لە مەهاباد نەبووم گۆیا کاروانێکی ئەرتەشی لە لای ورمێوە دێ بۆ مەهاباد. برادەرانی کۆمەلە خەڵک و قوتابی مەدرەسە دەبەنە پێش کاروان‌و لە دەروازەی شار دەبێتە کێشەو هەموو چەک‌و شت‌و مەکی کاروان بەتالان دەچێ‌و کاروان ناگاتە پادگان. دەقیق لە بیرم نیە ئەم ڕووداوە چۆن بووەو چۆنیان بۆ گێراومەوە.

ڕۆژی ١٩٧٩/١٢/١٤ پێشمەرگەی حیزبی دیموکرات لە کامیاران ١١سەربازی هەوانیروزی کرماشانیان بەدیل گرتبوو هێنایانە مەهاباد. ڕاست لەو کاتەدا کە سەربازەکان لە تەشکیلاتی مەهاباد حەبس بوون، برادەرانی کۆمەلە بەیاننامەیەکیان بڵاو کردەوەو ڕایان گەیاند کە ١١سەربازی هێلیکۆپتەریان بەدیل گرتووە. تەشکیلاتی مەهاباد ناچار بوو لە کورتە ئاگادارییەکدا خەڵک لەم ڕووداوە ڕوون کاتەوە. دەفتەری سیاسی بڕیاریدا سەربازەکان بدرێنەوە بە پادگانی مەهاباد. بە تایبەت کە برینداری‌کی شپرزەیان لەگەڵ بوو. ڕۆژی ٧٩/١٢/١٦ تەلیفونم کرد بۆ فەرماندەی ئینتیزاماتی پادگانی مەهاباد بە ناوی (ستوان نوسرەتی کەربەلایی)، هاتە دەفتەری تەشکیلاتی حیزب‌و ڕەسیدیان لێوەرگرت‌و سەربازەکانی بردەوە.

# سەفەر بۆ بەغدا

دوای ئەوەی حکومەت داوای وتوویژی کرد لەگەڵ حیزبی دیموکراتو شەر لە کوردستان راگیراو دەستەی نوێنەرایەتی خەڵکی کورد پێک‌هات، حکومەتی بەعسی عیراق فشاری بۆ نوێنەری حیزب هێنا کە دەستەیەکی نوێنەرایەتی حیزبی دیموکرات بچێتە بەغداو گفتگۆیان لەگەڵ بکات. کاک حەمەدەمینی سیراجی کە نوێنەری حیزب بوو لە بەغدا گەرایەوەو رایگەیاند کە زەختێکی زۆریان خستۆتە سەرو هەتا تەنێرن قسەیان لەگەڵ نەکەن ناچمەوە بەغدا. کومیتەی ناوەندی بریاریدا دەستەیەکی نوێنەرایەتی بە سەرۆکایەتی نووسەری ئەم دێرانە بۆ وتوویژ لەگەڵ حکومەتی عیراق بنێرێتە بەغدا. دەستەی نوێنەرایەتی بریتی بوو لە: کەریمی حیسامی، حەمەدەمینی سیراجی، فەتاحی کاویان، کاک فەتاحیکی دیکە. (نەک ئەو فەتاحەی کە ئێستا لە پاریس نوێنەری حیزبی دیموکراتەو بەلام بە ناوی حەوت ملیۆن کوردی ئێرانی دەپەیڤی!)

سوار بووین بەرەو عیراق کەوتینە رێ. لە گوندی سەروکانی گوتم با لابدەین سەرێکی کاپیتان قادری بدەین. پرسیمان گوتیان نەساخەو لە جێی‌دایە. کەوەژوور کەوتم، یەک پێی‌راست بۆوەو گوتی: «تەلاقم کەوێ نەهاتبای دەمردم». دانیشتین نانو چایەکی باشیان سازکرد، چەند رەسمێکمان هەلگرت، بەداخەوە ئەوە دوادیدارم بوو لەگەڵ ئەو پیاوە گەورە نیشتمانپەروەرەو ئەو دۆستەو برادەرە خۆشەویستە. دوای حەسانەوە کەوتینە رێو چووینە حاجی عومەران. ئەفسەرانی عیراقی خەبەریان بە

بەغدا دا کە دەستەی نوێنەرایەتی حیزبی دیموکرات هاتووە. گورج ترومبیلیان ئامادە کردو شەو چووینە هەولێر. بەیانی بردیانین بۆلای بەرپرسی بەعسی هەرێمی کوردستان و لای فەرماندەی لەشکری هەولێر. دوای نیوەڕۆ بردیانین بۆ بەغداو وەک میوانی حکومەتی بەعس لە هوتێلێک دایانبەزاندین.

پاش دوو ڕۆژ حەسانەوە وتووێژ دەست پێ‌کرا. لە لایەن حکومەتی عیراقەوە پێنج کەس بە سەرۆکایەتی (ئەبو ئەحمەد) مودیری گشتی موخابەرات بەشداریان کردبوو. کوردێکی ئاقۆلای دانەتاشراویان هێنابوو گۆیا ئەگەر پێویست بێ تەرجومە بکاو یا گوێ لە قسەکانی ئێمە رابگرێ. بەلام زۆر خراپ لە کوردی حالی دەبوو، ئەگەر جارو بار تەرجومەی دەکرد، ناچار کاک حەمەدەمین بۆی ڕاست دەکردەوە. بەر لەوەی بەرەسمی وتووێژ دەست پێ‌بکرێ ئەبو ئەحمەد پرسی: «ئێوە بۆ چی نەتانوێستوە پادگانی پیرانشار تەحویل وەرگرن و دەزگای دەوڵەتی لەم ناوچەیە پاک کەنەوە؟».

بەراستی لەو پرسیارە سەرم سووڕما. مەسەلەیەکی نهێنی کە دەبوایە تەنیا سکرتێری حیزب و برادەری پێوەندی‌دار بەو مەسەلەوە بیزانی، چۆن وا سەری لە بەغدا وەدەرناوە و موخابەراتی عیراق لەم نەخشەو کەین و بەینە ئاگادارە؟ من تۆزێک ئاگادار بووم کە لەگەڵ ئەفسەرانی پادگانی خانێ کە بەداخەوە پاشان ئیعدام کران، پێوەندی و ڕاوێژو وتووێژێک هەیە. بەلام مەسەلەکە ئەوەندە گرنگ بوو پێم‌وانەبوو کە لە کاناڵ و لە خەتێکی فرە تەنگ‌بەر دەردەچێ و لە عیراق پرسیاری ئەوەم لێ دەکەن. هیچ چارم نەما بێجگە لەوە کە بلێم: «من لە مەسەلەیەکی‌وا ئاگادار نیم بەلام ئەگەر شتێکی وا هەبێ، لەوکاتەدا کە ئێمە لە وتووێژداین، نابێ کارێکی وا بکرێ، کە ڕەوەندی وتووێژ تێک بچێ».

ئەبو ئەحمەد گوتی: «ئێمە لامان وایە کە ئەم وتووێژە بێ‌فایدەیەو

لایەنگری وتووێژ نین. ئێمە نامانەوێ ئێوە لە ڕژێمی خومەینی خودموختاری وەرگرن.

- بۆچی؟ ئەگەر وتووێژ بە نەتیجە بگاو دەوڵەتی ئێران پێشنیارەکانی حیزبی دیموکرات بسەلمێنێ‌و خودموختاری کوردستانی ئێران بەرەسمی بناسێ، بۆ دەبێ قبوڵی نەکەین‌و ڕێک نەکەوین؟

- بەچەند دەلیل: یەکەم، ئەم حکومەتە نامێنێ‌و دەڕوا. ئەگەر ئێوە لەم حکومەتە خودموختاری وەربگرن ڕژێمێکی دیکە کە دێتە سەرکار ئەو خودموختاریە قبوڵ ناکاو سەر لە نوێ توشی شەر دەبنەوە. دووەم، ئەگەر ئێوە لەم ڕژێمە خودموختاری وەربگرن ئەودەم لە ڕێگای خودموختاریەوە نفوزی یەکێتی سۆڤیەتی دەگاتە سەر سنوری ڕۆژهەلاتی ولاتی ئێمە، ئێمە ناتوانین ئەوە تحمل(دەدەربەرین) بکەین.

کاک فەتاحی کاریان وەدەنگ هات، مەسەلەیەکی ئینگلیزی گێرایەوەو گوتی: «مانای ئەوەیە کە ئێستا ئەو حکومەتە لاوازەو ملی بۆ وتووێژ راکێشاوە ئەگەر خودموختاریش بسەلمێنێ قبولی نەکەین، ڕاوەستین تا حکومەتێکی دیکەی قەوی‌ترو مڵهورتر دێتەو باشتر دەتوانێ لێمان بداو هیچیشمان نەداتێ».

پاشان کابرا گوتی: «ئێمە ئامادەین بە چەند شەرت لە هەموو بارێکەوە یارمەتیتان بدەین‌و هەرچی بتانەوێ بۆتان ئامادە بکەین‌و لەسەر هیچ شتێک پەکتان نەخەین».

گوتم: سوپاستان دەکەین. بەلاّم پێویستە ئێمەش ئەو چەند مەرجانە بزانین. دەکرێ بیانفەرمووی؟

ئەبو ئەحمەد گوتی:

١- لەگەڵ حکومەتی خومەینی وتووێژ کۆتایی پێ بێنن.

٢- نوێنەرێکی دایمی ئێمە لای ئێوە بێ‌و لە کۆبوونەوەکانی کومیتەی ناوەندی‌دا بەشداری بکات.

٣- نوێنەرێکی ئێمە لە کومیسیۆنی پێشمەرگەی حیزبی دیموکرات دابێ.
٤- نوێنەرێکی ئێوە بەدایمی لە بەغدا بێ‌و لەگەڵ ئێمە پێوەندی بگرێ.
٥- نوێنەرێکی ئێوە لە ئورووپا لەگەڵ بالوێزخانەی ئێمە لە پێوەندیدا بێ‌و ئاگاداری و دەنگ‌و باس بگوێزنەوە.»

من دەقی فەرمایشتەکانی کابرام بە عەرەبی یادداشت کرد. بەداخەوە لە ولات بەجێ ماون کە هەر بە عەرەبی بیانووسمەوە. پاش ئەوەی کە فەرمایشتەکانی تەواو کرد. گوتم:

- بەر لەهەموو شت سوپاسی ئێوە دەکەم کە وا رک‌و راست بۆیارمەتی کردن بە حیزبی دیموکرات مەرجەکان نیشان دەدەن. لەساڵەکانی پێشوودا حیزبی بەعس زۆریا کەم یارمەتی بە حیزبی دیموکرات کردوە، بەڵام قەت هیچ شەرت‌و مەرجی دانەناوە. ئێمە وەک حیزبێکی سەربەخۆ بەمافی خۆمانی دەزانین لەگەڵ هەر دەوڵەت‌و لایەنێکی کە بەقازانجی بزانین پێوەندی بگرین‌و وتووێژ بکەین. بەڵام سەبارەت بە مەرجەکانی ئێوە بۆیارمەتی بە حیزبی دیموکرات، من بە ناوی دەستەی نوێنەرایەتی حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران لە هەوەڵەوە تا ئاخر پێشنیارەکانی ئێوە رەد دەکەمەوە. ئێمە هیچ یارمەتیەک بە شەرت‌و شروت لە هیچ حیزب‌و حکومەتێک وەرناگرین.

کاکە حەمەدەمینیش بۆ پشتگری قسەکانی من تۆزێک دواو کۆبوونەوە کۆتایی پێ‌هات. کاک فەتاحەکان گەرانەوەو من لە بەغدا مامەوە چاوەروان بووم دایکی کەمال لە بولغارستانەوە بێ‌و لەگەڵ خۆم بیهێنمەوە مەهاباد. دوای چەند رۆژ خێزانم هات. مەلا رەحمانی کاژەیی کە شۆفێری حیزب بوو سواری کردین‌و شەو هاتینە قەلادزە ماڵی کاکە شێخە. بەیانی سوار بووین بۆ حاجی ئومەران. بەفرێکی زۆر باری‌بوو ماشین دەرنەدەچوو. ناچار لە حاجی ئومەران گەراینەوە بۆ گوندی ئازادی‌و چوینە ماڵی کاک عبدالقادری شێخی. بەیانی ماڵە کاک عبدالقادری خوریان

دەپەنجەی دایکی کەمال وەرگرتو سوار بووین بە زەحمەت گەیشتینە حاجی ئومەران. داوام لە عیراقیەکان کرد ماشینی ئەرتەشی تا پۆستی تەمەرچیان وەپێشمان کەوێ. ماشێن تا بەرگەرو شینکێ هاتو حاسبە بوو. ناچار گەراینەوە. هێندێ پێشمەرگە هاتبوونە حاجی ئومەرانو دەگەرانەوە بۆ ئەوێو. چەمەدانو شتو مەکیان هەلگرتو وەک لەو رەسمانە دیارە بە پێیان بە زەحمەت گەیشتینە تەمرچیان. ئەو رۆژە هێندێ برادەری کوردی عیراقی لە ئێرانەوە دەگەرانەوەو ماشێنیان هێنابوون تا تەمەرچیان. سواری ماشینی ئەوان بووین چووینە پیرانشار.

دوکتور قاسملو چووبووە ئەلۆس لە کۆنفرانسی حیزبی لە ناوچەی شنۆ بەشداری کردبوو هاتبوە پیرانشار ئەو رۆژە لە مزگەوتی پیرانشار قسەی دەکرد. کە چووینە مزگەوت پۆتینێکی فرە جوانو باشم هەبوو کاک سەلیمی بابانزادە بۆی کریبووم. من پۆتینەکانم دا بە مجێورو گوتم: تکایە لە جێیەکی باشیان دابنێ. کۆبوونەوە بلاوەی کرد لەگەل دوکتور هەستاین کە برۆین. زیاد لە هەموو کەس پۆتینی من نەمابوو. لە مزگەوت حاسیە بووم تا سەید رەسو چوو جوتە کەشێکی بۆکریمو لە مزگەوت نەجاتیم بوو.

لە پیرانشار تەلیفونم کرد بۆ نەغەدە براکانی دایکی کەمال هاتن سواریان کردو بردیانەوە نەغەدە. من لەگەل دوکتور مامەوە، رۆژی دوایی سوار بووین بە مەیدان بەلەکدا بینەوە مەهاباد. لەسەر مەیدانێ ماشێن دەرنەچوونو ناچار بە پێیان چووینە گوندی خەلیفان. ناردمان لە مەهابادەوە ماشێنیان هێنان. جەعفەری کەرویی کە پاشان پێشمەرگەی حیزبی دیموکرات بەنا حەقو نارەوا شەهیدیان کرد، لەگەل چەند ماشێنو پێشمەرگە هاتنە خەلیفە، سواربووینو چووینەوە مەهاباد.

## پاشکۆ

**گەلاڵەی دەستەی نوێنەرایەتی خەڵکی کورد لە بارەی خودموختاری کوردستانی ئێران**

مادەی ١- کوردستانی ئێران لە چوارچێوەی جوغرافیایی ئێراندا سەرزەمینێکە لەباری مێژووییەوە نیشتگەی قەومی کورد بووەو ئێستاش زۆربەی دانیشتوانی لە میللەتی کورد پێکهاتووە. ئەم سەرزەمینە تەواوی ناوچە کوردنیشینەکانی ئوستانگەلی ئیلام، کرماشان، کوردستان‌و ئازەربایجانی رۆژئاوا دەگرێتەوە.

مادەی ٢- کوردستانی ئێران بەشێکە لە وڵاتی کۆماری ئیسلامی ئێران کە پێوەندی قوڵی مێژوویی، ئابووری، سیاسی‌و فەرهەنگی، هاوپێوەندی نەتەوەی کوردی دانیشتووی کوردستانی ئێراتیان لەگەڵ نەتەوەکانی‌تری دانیشتووی ئێران پتەو کردووە.

مادەی ٣- فەرمانرەوایی میللەتی کورد لەسەر سەوزی کوردستانی ئێران بەشکڵی خودموختاری لە چوارچێوەی یەکێتی سیاسی، ئابووری‌و تەواوەتی عەرزی وڵاتی ئێراندا بەرێوە دەچێ.

مادەی ٤- دەوڵەتی ناوەندی کۆماری ئیسلامی ئێران، بۆ داهێنکردنی یەکێتی سیاسی‌و تەواوەتی عەرزی وڵات لەسەر زەوی خودموختاری کوردستانی ئێراندا بەسەر ئەو مەسەلانەی خوارەوەدا دەسەلاتی دەبێ:

ئەلف- کاروباری بەرگری لە سنوورەکان‌و لەسەر بەخۆیی‌و تەواوەتی

عەرزی ئێران لەبەرانبەر پەلاماری بێگاناندا بە هێزی هێزەکانی زەمینیو هەواییو دەریاییەوە لەلایەن ئۆرگانەکانی حکومەتی ناوەندیەوە بەڕێوە دەچێ.

ب- کاروباری سیاسیو پێوەندیەکانی دەرەوەو پێوەندی لەگەڵ کونسولگەری دەوڵەتانی بێگانەی جێگر لەسەر زەوی کوردستانی ئێران لە دەسەڵاتی دەوڵەتی ناوەندیدایە.

ج- بازرگانی دەرەوەو گومرگاتو سیاسەتی گشتی پێوەندیدار بەم کاروبارەوە لەلایەن ئۆرگانەکانی دەوڵەتی ناوەندی بەڕێوە دەچێ.

د- بەرنامە ڕێژی ماوەدرێژی ئابووری کە پێویستی بە سەرمایەگوزاری گەورەوە هەیە، تەنزیمو ئیدارەی سیستمی پولی وڵات لە دەسەڵاتی ئۆرگانەکانی دەوڵەتی ناوەندی دایە.

ڕوونکردنەوەی ١- لەبواری کاروباری بەرگریدا ئەم ئەسڵە لەبەرچاو بگیرێ کە سەربازخانەو بنیاتەنیزامیەکان پێویستە دوور لە شارەکانو لە سەر سنوورەکان بنو لە ژێر هیچ ناوو بیانویەکی نیزامیو هیتردا، ئەرتەش نابێ دەست لە کاروباری نێوخۆی کوردستان وەربدا.

ڕوونکردنەوەی ٢- سەربازوەزیفەی دانیشتوی سەرزەوی خودموختاری کوردستانی ئێران پێویستە لە پێگەو سەربازخانەکانی کوردستاندا خزمەت بکەن.

ڕوونکردنەوەی ٣- لە ئیدارەکانی بازرگانی دەرەوەو گومرگاتو بەرنامەرێژی ماوەدرێژی ئابووریو ئیدارەی سیستمی پولی وڵات لە کوردستاندا، دەبێ لە فەرمانبەری کورد کەڵک وەربگیرێ.

مادەی ٥- جگە لەوانەی کە لە مادە (چوار)دا ڕوونکراونەوە، تەواوی کاروباری سەرزەمینی خودموختاری کوردستانی ئێران بە بێ هەڵاواردن لە دەسەڵاتی ئۆرگانەکانی خودموختاردا دەبێ.

مادە ٦- مەجلیسی میللی کوردستانی ئێران لەسەر زەمینی

خودموختاری کوردستانی ئێراندا، بەرزترین ئۆرگانی فەرمانڕەوایی میللەتی کورد دەبێ. ئەم مەجلیسە هەر دوو ساڵ جارێک لە ڕێگای هەڵبژاردنی ئازادو ڕاستەخۆو نهێنیو گشتی تەواوی دانیشتوانی کوردستانی ئێران هەڵدەبژێردرێو پێک دێ.

ڕوونکردنەوەی ١- هەر پەنجا هەزارکەس لە دانیشتوانی کوردستانی ئێران نوێنەرێک بۆ مەجلیسی میللی کوردستان هەڵدەبژێرن.

مادە ٧- مەجلیسی میللی کوردستان تەواوی بڕیارنامەکانی نیزامنامەی نێوخۆو هەڵبژاردنی شوراکانی شارو گوند ئامادەو پەسند دەکا.

مادە ٨- مەجلیسی میللی کوردستان بە لەبەرچاو گرتنی یاسا گشتیەکانی وڵات، تەواوی یاساو بڕیارنامەکانی ڕێکخراوەکانی خودموختاریو بودجەی تایبەتی سەرزەمینی خودموختاری کوردستان پەسند دەکات.

مادەی ٩- مەجلیسی میللی کوردستان بۆ بەڕێوە بردنی گشت کاروباری سیاسی، ئابووری، ئیداری، کولتوریو ئینتیزامی سەرزەمینی خودموختاری کوردستان، حکومەتی خودموختاری کوردستان هەڵدەبژێرێ.

مادەی ١٠- حکومەتی خودموختاری کوردستان بە تێکڕایی لەبەرانبەری مەجلیسی میللی کوردستاندا بەرپرس دەبێ. هەر یەک لە ئەندامانی حکومەتی خودموختاریش بەتەنیایی لەبەرانبەر مەجلیسی میللی کوردستاندا بەرپرس دەبن.

ڕوونکردنەوەی ١- ئەندامانی حکومەتی خودموختاری کوردستان لەباری پلەو ڕەسمی ئیداری لەپلەی جێگری وەزارەتخانەکانی حکومەتی ناوەندیدا دەبن.

مادەی ١١- مەجلیسی میللی کووردستان مافو ئەرکی هەیە کە هەڵو مەرجی تێکۆشانی ئازادو دیموکراتیکی ژیانی کۆمەڵایەتی لە بزاری

ئازادی حیزبو کۆبوونەوەو چاپەمەنیو دەربڕینو قەلەمو بیروباوەڕو ئایینو ئەنجومەنگەلی دیموکراتیکو مافی مانگرتن لەسەرانسەری سەرزەمینی کوردستان ئامادەبکاو بەسەر ڕاپەراندنو بەڕێوەبردنیدا چاوەدێری بکات.

مادەی ١٢- بودجەی کوردستانی خودموختار لە لایەن حکومەتی خودموختاری کوردستانەوە ئامادە دەکریو دەدرێ بە مەجلیسی میللی کوردستانو دوای پەسند کردن بەڕێوە دەچێ.

مادەی ١٣- کانگای داهینکردنی ئیعتیباری بودجەی کوردستانی خودموختار بریتییە لە:

ئەلف- مالیاتو باجو داهاتیتری ناوچەیی.

ب- بەشێک لە بودجەی گشتی وڵات کە لە لایەن حکومەتی ناوەندییەوە دەدرێ بە حکومەتی خودموختاری کوردستان.

مادەی ١٤- جگە لەوەی کە لە خالی د- مادە چواردا باسکراوە ئەرکی حکومەتی خودموختاری کوردستانە کە بۆ گەشە کردنو پێکەیشتنی ئابووری سەرزەمینی کوردستانو بۆ قەرەبۆکردنی دواکەوتوویی ستەمی میللی، بۆ پێکهێنانی پیشەسازی میللیو پەرەپێدانی کشتو کاڵو ئاژەڵداریو پێشکەوتنی کاروباری ئاوەدانیو ئاسایشو خزمەتە گشتیەکان، بەرنامەیەکدا بڕێژێ کە گۆڕانی بنەرەتی لە ژیانی کۆمەڵانی زەحمەتکێشی خەڵکی کورددا پێک بێنێ.

ڕووونکردنەوەی ١- پاش کەمکردنی بودجەی کاروباری دەوڵەتی ناوەندی لە داهاتی گشتی، بودجەی پەرەپێدانی ئابووریو کۆمەلایەتیو کولتوری بە گوێرەی ڕادەی حەشیمەت بەسەر ناوچەکانی وڵاتدا دابەش دەکرێ. ڕادەی دابەشکردنی ئەم بودجەیە جۆرێک دەبێ کە بۆ قەرەبۆ کردنی دواکەوتوویی ئابووری کە بەرهەمی ستەمی نەتەوایەتیە، بەشی دانیشتوانی ئەم ناوچانە، لەوانە کوردستانی خودموختاریش دەبێ بە

هاتنەوە لەگەڵ پلەی دواکەوتوویی ئەوان لە داهاتی نیوەنجی سەرانەی وڵات زیاتر بێ.

مادەی ١٥- زمانی کوردی لە گشت ئیدارەکانی سەرزەمینی خودموختاری کوردستان زمانی رەسمی‌یە. لەگەڵ ئەوەش کە زمانی فارسی هەر وەک هەبوو زمانی رەسمی سەراتسەری ئێرانە بە کوردستانیشەوە.

مادەی ١٦- لەسەرزەمینی خودموختاری کوردستانی ئێراندا فێر بوون لەگشت پلەکانی سەرەتایی‌و ناوەنجی‌و بەرز بە زمانی کوردی دەبێ. بەڵام خوێندنی زمانی فارسیش لە ئاخری ساڵی چواری سەرەتایی لە هەموو مەدرەسەکانی کوردستانی ئێراندا ئیجباری دەبێ.

روونکردنەوەی ١- کەمە نەتەوەکان لە سەرزەمینی خودموختاری کوردستانی ئێران مافی ئەوەیان هەیە کولتوورو نەریتی میللی خۆیان بپارێزن‌و پەرە پێ‌بدەن‌و لە مەدرەسەکانی خۆیاندا زمانی زگماک بخوێنن.

مادەی ١٧- پێکهێنانی بنیات‌و ناوچەی فێر بوون‌و فەرهەنگی‌و بەرنامەدانان بۆ تێکۆشانی ئەم ناوەندو بنیاتانە، لەسەر زەمینی خودموختاری کوردستانی ئێران لەگشت پلەی سەرەتایی‌و نیوەنجی‌و بەرزدا لە دەسەڵاتی حکومەتی خودموختاری کوردستاندایە.

مادەی ١٨- هێزی پێشمەرگە کە دەبنە فەرمانبەری رەسمی حکومەتی خودموختاری کوردستان ئاسایشی نێوخۆو کاروباری ئینتیزامی کوردستانی خودموختار دەپارێزن.

مادەی ١٩- بەرپرسەکانی ئینتیزامی شارو گوند لە حکومەتی خودموختاری کوردستانی ئێراندا، راستەوخۆ لە لایەن حکومەتی خودموختاری کوردستانەوە دیاری دەکرێن‌و لەبەرانبەر ئەودا بەرپرس دەبن.

مادەی ٢٠- هەموو ساڵێ ژمارەیەک خوێندکار لە کوردستانی

خودموختار بۆ دابینکردنی پێویستیەکانی هێزی بەرگری سەرزەمینی خودموختاری کوردستان لە مەدرەسەی نیزامیدا دەخوێنن. رێکخراوەکانی حکومەتی ناوەندی ئێران دەبێ گشت هۆو ئەرەتانی پەروەردەو فێرکردنی ئەم خوێندکارانە ئامادە بکەن‌و پێداویستی چەک‌و جبەخانەی هێزی ئینتیزامی کوردستان بەشێوەی پێویست دابین بکەن.

مادەی ٢١- هێزی قەزایی لە کوردستانی خودموختاردا جیا لە هێزەکانی‌تر بە هۆی دادگا سەربەخۆییەکانەوە بەرێوە دەچێ.

مادەی ٢٢- دادگاکانی سەرزەمینی خودموختاری کوردستانی ئێران لە مەسەلە عورفیەکاندا بە گوێرەی قانونی عورفی سەرانسەری ولات‌و بە گوێرەی قانونی پەسند کراوی مەجلیسی میللی کوردستانی خودموختار کە لە سنووری سەلاحیەتی خۆیان دایان‌ناوە بەرێوە دەچێ. لەو مەسەلانەدا کە پێوەندیان بە ئەحوالی شەخسیەوە هەیە، بە گوێرەی دابو رەسمی ئایینی داواکاران بەرێوە دەچن. ئەم قانونانە پێویستە لە سەر ئەسڵی حقوقی‌و لەگەڵ بەیاننامەی جیهانی مافی مرۆڤ پەیمانی جیهانی حقوقی مەدەنی یەک بگرنەوە.

مادەی ٢٣- لقێکی دیوانی بەرزی ولات لە سەرزەمینی خودموختاری کوردستانی ئێران دادەمەزرێ‌و چاورێخشاندنەوەی بریاری دادگاکانی کوردستانی خودموختار لەم لقەدا دەسکاری دەکرێنەوە.

روونکردنەوەی ١- پێراگەیشتن لە دادگاکانی کوردستانی خودموختاردا بە زمانەکانی کوردی فارسی بەیوە دەچێ.

مادەی ٢٤- بۆ بەهێز کردنی یەکیتی گەلانی ئێران، جگە لەوەی دانیشتوانی کوردستان وەک ناوچەکانی‌تر ئێران نوێنەری خۆیان بۆ مەجلیسی شۆرای میللی دەنێرن ژمارەیەکی دیاریکراویش بە پێی حەشیمەتی کوردستان لە ئۆرگانەکانی حکومەتی ناوەندی‌دا (دەستەی وەزیران‌و وەزارەتخانەکان) بەشدار دەبن.

مادەی ٢٥- بە مەبەستی ڕێکو پێکی بناخەی خودموختاریو پاراستنی مافی تەواوی گەلانی ئێران«شورای بەرزی گەلانی ئێران» لە ناوەندی وڵات پێک دێو گەلانی ئێران هەر یەکەی نوێنەر بۆ «شورای بەرزی گەلانی ئێران» دەنێرن.

ڕوونکردنەوە- سێ کەس لە نوێنەرانی سەرزەمینی خودموختاری کوردستانی ئێران لە لایەن مەجلیسی میللی کوردستانەوە هەڵدەبژێردرێن.

مادەی ٢٦- تەواوی یاسا پەسندکراوەکانی مەجلیسی شورای میللی ئێران کە پێوەندیان بە مافی گەلانی ئێرانەوە هەبێ، پێویستە لە شورای بەرزی گەلانی ئێراندا بێتە گۆڕێو باس بکرێن.

«دەستەی نوێنەرایەتی خەڵکی کورد»

